**کتێب:** هەولێر .ئەستنبۆڵ

**بابەت:** ڕۆمان

**نووسینی:** شێرزاد هەینی

**هەڵەبڕ:** نەهرۆ هەینی

**دیزاینی بەرگ و ناوەوە:** شۆڕش غەفووری

**بەرگ:** دوانزەیەم

**تایپ:** نووسەر/ ستۆکهۆڵم ٢٠١٩

**ژمارەی سپاردن:** ژمارە (٧٤٨)ی ساڵی ٢٠١٩ی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکانی پێ دراوە.

**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

**نرخ:** ٦٠٠٠ دینار

**چاپخانە:** ڕۆژهەڵات ـ هەولێر

## هەولێر و ئەستنبۆل پێکەوە:

ئـەم ڕۆمانـە پاش دیمانەی د. نـەوزاد یەحیا باجگر و مامۆسـتا ئاشـتی ڕەحمان، خوێندنـەوەی دوو بەرگـی کتێبـی «هەولێـر لـە بەڵگەنامەکانـی عوسـمانی دا»ی بڵاوکـراوەی زانکـۆی جیهان، سـەفەرێکی یـەک هەفتەییم بۆ ئەسـتنبۆل و مانەوەم لـە هوتێلی «Daphne» لە سـوڵتان ئەحمەد، هەروەهـا خوێندنەوەی بابەتی زۆر لەسـەر شارەکە و ڕۆژەڤی عوسمانییەکان نووسراوە.

دەقـی دۆکومێنتـەکان، بـەڵام ئاوێزان بە خەیاڵ. کەسـایەتییەکان، بەڵام هاوشـان بـە سـەرابی ئـاکاری زۆر نزیک لە واقیع. ناوی دروسـتی شـوێنەکانی ڕۆژگارەکە و سەرچاوەی زۆرتری ئیمڕۆ، لەوەدا ئاوێتە بوون و کڵافەی ئەوانە بوون بە ڕۆمانەکە.

دیـارە ڕۆمانیش؛ ڕووداو و ڕۆژگار و ڕوو و ڕەفتار و ڕووانگەیە.

ئەوانە ئاسان و نەرم، هەروەها بە کۆشش و تێکۆشانی زۆرەوە، بوون بەو نووسینە. ئەو بەرگە، لە بەرگەکانی تری ڕۆمانی هەولێر زۆرتر ماندووی کردم، بەڵام بە خەباتی زۆرتر لە سـەد ڕۆژی نووسین؛ نەکوژامەوە، نەگەڕامەوە، پەشیمانیش نەبوومەوە.

**شێرزاد هەینی**

ستۆکهۆلم - ٢٠١٩/٨/٦

## دۆکومێنتی ژمارە ١
## لاپەڕە ٢١ی بەرگی یەکەمی (هەولێر لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا)

**نووسراوی سەدری ئەعزەم**

چەتەکانی شەمەرولجەبهای عەرەبان لە دەوروبەری کەرکوک گوندی تۆبزاوە و قەزای هەولێر گوندەکانی دوغان و تۆبزاوە و ماستاوە کاری ناڕەوایان کردوە، خەڵکی ئەو گوندانە ئەزیەت دەدەن و زیانیان پێگەیاندون، بۆ پارێزگارکردن سەربازیان ناردۆتە ئەو شوێنانە، ئەو پارە و کەلوپەلانەی کە بردویانە دراونەتەوە خاوەکانیان، بۆ ئەو مەبەستە نووسراوی والی شارەزوور هاتووە، لە سەروو ئاگادار کراونەتەوە و ڕەزامەندی دراوە، بۆیە پێشکەشکراوە.

## بۆ باوکم مێژوو دەخوێنم

مــن نوێنــەری هەولێــر و وڵات و خــاک و خەڵکی هەموو کوردســتانم. من «ئاشــتی ڕەحمــان»م. مــن ئــەو کیژەم کە زوو باوکــم، بۆ خوێندن؛ خۆم و دەســت و هزر و هــەردوو کەزییەکانی ئازاد و سەربەســتی کردم. ئەو بــۆ خوێندن و کارکردن، زۆرتر لە خوشــکەکانم متمانەی تەواوی بە من بەخشــیبوو! منداڵ بووم، زۆر گچکە بووم، ورد و نەرم لەبەردەم باوکم شاناز دەوەستام، ماچی دەکردم، دەستی بە سەر کەزی و بســک و ڕوومەتــە ســەرمابردووەکەی دادەهێنام. هەمــوو بەیانییەکی زوو، کە نان و ماســت و پەنیر و هێلکە، یان کەرە و نۆک، یان لۆبیامان دەخوارد. کە ســەدریە ڕەشــەکەم لەبەر دەکرد، لە بیری نەدەکرد و زوو زوو پێی دەگوتم:

بــۆ قوتابخانــە، هیچ لەبیــر نەکەیت. دەمــەوێ وریا و چالاک بچیــت و بگەڕێیتەوە، زۆریش فێر بیت، چاوت لە خوشــکەکانت بێت، براکەم لەگەڵمان نەبوو، چونکە ئەو دەمانە لەو شــارە، هیچ قوتابخانەیەکی تێکەڵاو نەبوو.

نازانــم چــۆن قەناعەتــی بــەوە کردبوو، لە چــاوی کچێک، قوتابییەکی دوو و ســێی ســەرەتایی ئــەوە بخوێنێتەوە. لەودەمانە زۆر لە مەرجەکانــی خوێندن و فێربوون و مامۆســتا و بەڕێوەبردن و پرۆگرامەکانی؛ سست و سەرەتایی بوون. ئەو چۆن بڕوای بە من هەبوو! بتوانم سەری ئەو بەرز بکەمەوە. بەڵام ئەو دڵنیابوو، شتێکی لە دڵدا بوو، لە داهاتوو، کە گەورە بووم، ئیشێک بکەم ناوازە! هەر لەبەر خۆیەوە دەیگوت: کیژم بتبینم و نەتناســمەوە، لەناو هاوڕێیەکانت یەکەم و پێشــکەوتوو بیت!

ئەو منی هاندەدا. دەیپرسی، چاوەڕوانی وەڵامەکانی منی دەکردەوە، سەیری دەفتەر

و کتێبەکانی دەکردم. نەیدەزانی چ نووسراوە، ڕستەکانی باش بۆ نەدەخوێندرایەوە، بەڵام من ئاسان و باش ئیقناعم دەکرد، فێر دەبووم و حەزم بە فێربوونیش دەکرد. باوکم داوایەکم لێ دەکات، دەبوایە ئەوەش بکەمە ئامانج. ئیتر ئەو بانگەشە و هیوایە هەموو ئاستەنگەکانم بۆ دەسڕێتەوە. کۆسپەکان نامینێن و بوارم ساز، هەنگاو بە هەنگاو دەڕۆم و ناگەڕێمەوە. ئەو بەرنامەم بۆ دادەڕێژێت، سادە و دروست داوا دەکات بابەت و کتێبەکانی مێژوو بخوێنمەوە. ئیتر نازانم بۆ حەزی دەکرد، زۆرتر بایەخ بە مێژوو بدەم، نازانم!

❊❊❊

تازە یەک ساڵ و نیو بوو، بەشی مێژووی زانکۆی سەلاحەدینم تەواو کردبوو. پلەی دەرچوونەکەم زۆریش باش بوو، لە قوتابییە یەکەمەکانی بەشەکەی خۆم بووم. مامۆستاکان هانم دەدەن، زۆرتر بخوێنم و بەردەوامیش بم. ئەوان پاش باوکم پشتیوانی گەورە و باشی من بوون. خۆشم زیرەک بووم، لە ژیان و ڕۆژانەی خۆم زۆرتر شەیدای کتێب و خوێندنەوە بووم. دوابیش دەرکەوت زۆرتر پەرۆشی ئەو بوارەم و بۆ ئەوەش خوڵقاوم! زووش لە کۆلێژەکەمان وەک مامۆستا دادەمەزرێم، لە مێژوو و خوێندن و کتێب دوور ناکەومەوە.

ئیتر دەمەوێ لەناو باڵەخانەیەکی کۆن و قەرەباڵغی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین بچمە زانکۆیەکی دەرەوەی وڵات. بچمە ناو ساڵۆن و سیستەمێکی خوێندن و فێربوونی نوێ، کام مەڵبەند گونجاوە لەوێ خۆم بدۆزمەوە. من دەتوانم، وەک کیژە هەژارێک، زۆر نییە باوکی کۆچیدوایی کردوە. دەستمایە و ڕۆژانەمان بەحاڵ بەشمان دەکات، بەڵام من موچەخۆرم. مانگانە موچەم هەیە، ئەوە دوو ساڵە پارەم کۆکردۆتەوە. پارەم هەبوو، چونکە کەم جلوبەرگی گرانبەهام کڕیوە. بیرم لە کڕینی ئۆتۆمبێلێکی ڕەنگ سپی نوێ؛ وەک هەموو مامۆستا و زۆربەی قوتابییان، هەموو فەرمانبەران و پۆلیس و دەرگاوانەکەی کۆلێژەکەمان، هەموو دائیرەکانی تری ئەو وڵاتە، نەکردۆتەوە. مێشکم بە دەرهێنانی مۆڵەتی شوفێری سەرقاڵ نەکردووە. ڕۆژانە ژەمێکی خواردنم لە ڕێستورانتەکانی ناو شاری هەولێر نەبووە. بۆیە پارەم هەیە، دەمەوێ بەو پارەیە، لەگەڵ موچەکەم بچمە دەرەوە، لەوێ بخوێنم! بەڵام خوێندنەکەم مێژوو بێت.

❊❊❊

لــە دایکمەوە، بەڵێ دایکە شــیرینەکەم کەمێک زمانی تورکــی فێر ببووم. ئەو، واتە دایکم؛ دایک و باوکی قەڵاتی بوون. ئەوان، جاران لەو قەڵاتە لەگەڵ زمانە کوردییەکە تورکمانیان باش زانیووە. بەڵام کە شــوو بــە باوکم دەکات، ئیتر بە تورکمانی چیتر لەنــاو ماڵ و بەردەرگاش قسە نــاکات. بەڵام لە دەرەوەی ماڵ، لــە میوانداریییەکان و لەســەر قەبــران. جاروباریــش لەگــەڵ کۆنە هاوســێ و برادەرەکانی، لە پرســە و سەردانەکانی قسەی دەکرد. بەڵام لە ماڵەوە، لەگەڵ ئێمە زۆر کەم قسەی بەو زمانە کردبوو. ئەوەندەی گوێم لەو ببوو؛ چەند رســتە و ناو و وشــەی لێ فێر ببووم.

مــن ئەو زمانە، زاراوەکانی دەمی دایکم، وشــە تورکییەکانــی ناو ناندینەکەی دایکم. لــە خۆزگــە و دوعا و پاڕانەوەکانی، لــە داو و دەرزی و مەنجەڵ و کەلوپەلەکانی ناو ماڵەکەمان، شتێ لەو زمانە فێر ببووم. ئەو زمانە تورکییە زۆر بەکەڵک خوێندنەکەم نەدەهات، بەڵام بۆ رۆژانە و بازاڕ و وردە رازیش هەر باش بوو. بەوەیان لەوانەی تر باشــتر بووم، ئەوانەی هیچ وشــەیەکی زمانی تورکییان نەدەزانی. ئەوانەی دەیانەوێ لە تورکیا بخوێنن، یان بۆ سەیران سەردانی ئەو وڵاتە بکەن. ئەوانەی دەچن شوقەی نوێی نیشــتەجێبوون لە شــار و هەوارە گەشــتیارییەکان دەکڕن. ئەوانەی دەرمان و چارەســەری لە کلینکی نەخۆشــخانەکانیان وەردەگرن! ئەوانــەی بازرگانی بە پارەی زۆریش دەکەن، لە بانکەکان پارە و کۆنتۆیان هەیە! زمانە تورکییەکەم لەوانە باشتر بوو.

کەس بۆ خوێندن و ماســتەر و توێژینەوە منی نەناردە تورکیا. ســەرەتا و یەکەمجار کــەس منــی رەوانەی ناو ئەرشــیفە دەوڵەمەندەکەی عوســمانی نەکــرد. کەس منی نەناردبوو. حکومەتی هەرێم لە رێگای وەزارەتی خوێندنی باڵا و زانکۆی سەلاحەدین داوایان لە من نەکردبوو، بچمە تورکیا و ماستەریش لە مێژووی سەردەمی عوسمانی وەربگــرم. ســەرۆکایەتی زانکــۆش بیــری لەوە نەدەکــردەوە، من و کەســانی تریش بچینــە تورکیــا مێــژووی کــۆن و نــوێ تورکیا بخوێنین و شــارەزاتر بیــن. من خۆم دەچــم و دەخوێنــم، بەڵام ئەوان ئاســانکاری باشــم بــۆ دەکــەن. زوو کاروبارەکانی ســەفەرم بۆ رادەپەڕێنن، لەوەش کۆســپ و لەمپەرم نایەتە پێش. بەرنامەکەم وەک جۆگەیەکــی شــیرین؛ نەرم و جوان دەڕوات و خەونەکــەم ئاودێر دەکات. ئەگەرچی، لــەوێ دامەزرابووم، مامۆســتاش بــووم، بەڵام ئــەوان منیان رانەســپارد بوو، بچمە

دەرەوە و زۆرتر بخوێنم.

***

من! بۆ پارە و دیتنی دونیا و چوونە سەر دەریا و بەهاراتی ئەوێ، گۆشت برژانی ریستورانتە خاوێنەکانی، نەچوومەتە تورکیا. من تەنیا ئەو کارەم بە تورکیا هەبوو، ویستوومە لەوێ بخوێنم و بەس. سوپاسگوزارم زانکۆیەک، کلاسێک من وەربگرێت. مامۆستایەک، وەک قوتابییەکی زانست قبولّم بکات، تێدا شاناز ناوم بنووسم، بە بروانامەکەم وەرمبگرن! کیژە کوردێکی پەرۆشی مێژووی ولات و نەتەوەکەی، بە رەسمی و رێپێدراو لە بەشێکی زانکۆکەیان وەرمبگرن!
من هێشتا تەواو ناو شاری هەولێرم نەدیبوو. شارەکەی خۆم باش و ورد شارەزا نەبووم. هەموو مۆڵە نوێیەکانی شارەکەم نەدیبوو. کە ویستم بچمە تورکیا. لەو تەمەنە هێشتا نازانم، رەشەباکەی سلێمانی کەی هەڵدەکات، شەوانە لەسەر شاخی ئەزمڕ چۆن چراکانی ناو شارەکە دەدرەوشێتەوە. بە شەو شارەکەم نەدیوە، کە دەڵێن:
شەوانە وەک چاو و کانی و جریوەی ئاو دەبریسکێتەوە. ئەوەندە دەزانم لە بادینان میوەی جوان هەیە، بەلام لە باخ و رەزەکانیان سەیرانم نەکردوە، بۆ بە سەیران و گەشتیاری بچمە ولاتی تورکیا!؟ هێشتا سەیرانی باخ و رەزەکانی خۆمانم نەکردوە. شەوێک لەناو خیوەتێکی بچووک لە بناری شاخێک، بۆ سەیران بە دیار ئاگر و ئاگردانێکی گەرمی ئاوێزان بە پۆلوی ئاگر، دوو پارچە گۆشتم نەبرژاندوە و شەوانە لەگەڵ جریوەی ئەستێرەکان لە دەرەوە نەماومەتەوە! ئەگەر بۆ خوێندنی مێژوو نەبێت، چیم داوە لە سەیران و پیاسەی ناو شارەکانی تورکیا.
لەسەر راسپاردەی باوکم، بە وردی و دڵسۆزییەوە دەچمە ناو لاپەڕەکانی مێژوو. شەیدای مێژوو دەبم. دەمەوێ بەشێکی ژیانم، خوێندن و کارکردن و نووسینم، دوایی وەرگێڕان و بلاوکراوەکانم هەمووی تایبەت بێت بە مێژوو. بۆیەش لەوێ، دەچمە ناو ئەرشیفی عوسمانییەکان. ئەرشیفە دەوڵەمەندە، زۆر گەورەکە. ئەرشیفی دەسەلاتێک تەمەنی حوکم و زەبر و سنوورەکەی نزیکەی پێنج سەدە بووە، حوکمی رووبەرێکی گەورەی دونیای کردوە. زۆریش گەورە، بە شیر و سوپا و خێر و شەڕەکانی، بە شیرینی و تاڵیش، چەندان نەتەوە و زمان و کەلتووری حوکم کردوە. بە کۆششی خۆم. بە پارەی خۆم. مانگانەکەم لەجیاتی بە زێڕ و خشڵ و جلوبەرگ

بدەم، ماندووبوون و شـــەونخوونی زۆر، زمانی عوســـمانی بە نووسین و قسەکردنەوە بـــۆ خوێندنـــی مێژوو، بە کۆرســـی فێربوونی زمان ئەهلی و بـــە مانگانەیەکی زۆریش فێر دەبم.

***

باشم لەبیرە، دەزانم لەسەر سەری بووم، گەورەش بووم، هەموو شتم لەبیرە، باوکم گوتی:

کیژم نەخۆشم دەمرم، وا دەمرم هەست دەکەم، سییەکانم تەسک و بچووک دەبنەوە. کە دەست لەسەر سینگم دادەنێم، هەست دەکەم و دیاریشە سییەکانم سیس بوون. بچووک بونەتەوە، وەک دوو ســێوی بەر بارانی ســـەر لقی بەرزی دار سێوێک، سیس بوون! دیارە گەش و تەڕ نەماون، زوو زوو هەناسەم دەگیرێت، چاوم تاریک دادێت. من سییەکانم نەخۆشن، شەنگم لەبەر بڕاوە. هەناسەم تەنگە، قاچەکانم چیتر ناتوانن جەســـتە لاوازەکەشـــم هەڵبگرن. نان و خواردن و نووستنم کەمە، بەڵام ئارەزووم بۆ دیدار و ئامۆژگاری ئێوە زۆرترە، بۆ هەمووتان هیوام زۆرە و داواکارم زۆرتر پایەدار بن. من وا تەواو دەبم، تەواو بووم، چیتر ناتوانم ببمە باوکی تۆ، باوکی خوشـــک و براکانت، دەزانیت من زۆرتر لە خوشـــکەکانت ئازادم کردویت، پێم گوتی:

- «نەشمیلەکەم تۆ سەربەستی!».

چەندان جار پێم گوتی:

- «تۆ شـــانازی! منیش چیتر ناتوانم سەردارتان بم!».

چەنـــدان ســـاڵ لەناو دوکانە شـــڕەکەم لە بازاڕی شـــێخەڵا بەقاڵیم بۆتـــان کردوە. بە گەنجی و تا ماندووش دەبم، بەدیار فەردە و تەنەکە و سەندوق و باڵ و بەرمیلی پێنج گاڵۆنی و کارتۆنی زەخیرە، بەرامبەر تەرازووەکەی دوو قاپە فافۆن و دوایی مسەکە، ئەوەی لە بنکە و بەشـــە ئاســـنەکانی ژێرەوەی بە پیتی گەورە لەســـەری نووســـرابوو دروســـتکراوی هیندســـتانە، بەپێوە وەستاوم و زۆریش ماومەتەوە و چاوەڕوانی رزقی حەڵاڵ بووم. هەرگیز رۆژێکیش بیرم لەوە نەکردۆتەوە، تەرازووەکەم سەنگ و سووک و لاریش بکەم، ژیام و ئێوەشـــم پێگەیاند و گەورەم کردن، ئیتر دەڕۆم و ماڵئاوا.

***

هێشـــتا بەشـــێکی دوکانەکانی شـــێخەڵا تێکنەدرابـــوون. ریزە دیوارەکەی پشـــتی بە دیـــوارە نەوییەکـــەی گۆڕســـتانە کۆنەکـــە دابوو، بناخـــەی بازاڕی نیشـــتمان لەلایەن

سەرمایەدارێک، نازانم کێیە و پارەکەی لەکوێ هێناوە، دانەبڕابوو. ئەوانەی شارەوانی بەکرێی دابوون، تێدا چەندان؛ بەقاڵ و عەتاڵ و گۆشتفرۆش و ماستفرۆش و بەزاز و بۆنی بەهارات و سـەوزە و میوەفرۆش بە ریز بەیانییان بۆ کاسـبی و ژیان؛ قەپەنگە بەرین و شـڕەکانیان بە خڕەخڕ و بەزەحمەتی و بە بیسـمیلا دەکردەوە. هەموو وەک کارمەندانی شـارەوانی، کڕیاران، شـوفێرانی تاکسـی و حەمباڵان یەکتریان دەناسی. لـەو دوکانانـەی موڵکی شـارەوانی بوون، وشـک و تەڕ و کۆن و نـوێ و خۆماڵی و هاوردە و گەورە و وردی تێدا دەفرۆشـرا.
لەودەمانە، ئۆتۆمبێلە تایبەتییەکانی ژمارەی سـەر تابلۆیە سـپییەکانی پێشـەوە و پشتەوەیان، نەدەگەیشتە چوار هەزار. لادا تاکسییەکان، سپی و سوورەکان، پیکەبە شڕە سپییەکان، لۆرییەکان، تراکتۆرەکانی زبڵی شارەوانی و عارەبانەکانی دەستی و زیلەکانی عەسـکەری و ئیڤاکەی ئینزیباتە سەرسـوورەکانی بۆ ترساندن و هەڕەشەی گەنجـان، ئەوانە، هەموویان بێ جیاوازی بەئاسـانی لەبـەردەم دوکانەکان گوزەریان دەکرد. بەئاسـانی دەیانتوانـی رابگرن و نەفەرێک دابەزێـت و ئارەزوومەندانەش دە دەقە و زۆرتریش لەگەڵ گۆشتفرۆشەکە، لەسەر نرخ و جۆری گۆشت و کەم و زۆری بەز و سەروپێیەکانیش هەڵوەستەیەک بکەن، دڵخوازی خۆیان بکڕن و بگەڕێنەوە ناو ئۆتۆمبێلەکانیـان. هەندێکیان، لە ترسـی خراپی پاترییـە عێراقییە «بابل»ەکەیان، مەکینەکەیان نەدەکوژاندەوە و ئیشـی دەکرد و دەنگی دەهات و دووکەڵی شـینی بە بـا دەکـرد، بەیانییش لەبـەر دەرگای ماڵەوەیان، بە پاڵدانـی زۆری؛ ژن و منداڵ و پشـتیوانی جیران و رێبوارانی ناو کۆڵانەکە ئیشی کردوە!
ئەودەمانە، کڕیار و دوکانداران، نەفەر و شوفێرانی تاکسی، دوکاندار و حەمباڵەکان، زۆرباش و گەرم یەکتریان دەناسی. بە نەهاتنی یەکێک، ونبوونی یەکێکی تر پرسیار دەکرا، ئینجا وەڵام وەردەگیرایەوە، یان پرسیارەکەش سەرسام و پەرۆش ون دەبوو.

***

وەسـیەت دەکەم، تۆ کیژەکەم، ناوم لە تۆ ناوە ئاشـتی، ناوێکی کوردییە، ناوم لە تۆ ناوە ئاشـتی بەو هیوایەی وڵاتەکە ئاسـوودە بێت. شەڕ و ئاشووبەکان تەواو بێت و وڵات و میللەتەکەی ئارام بژین. بەسـە ماندوو بووین؛ شـەڕ و هەواڵ و بروسـکە و بۆردومان و جاش و پێشـمەرگە و سـەرباز و فیرار و گرتن بەسە. با ئاشتی بەرقرار بێـت. با ئـەو کیژەش ببێتـە خوێندکارێکی زیـرەک و رۆژە جوان و سـەرفرازەکان

بنووسـێتەوە. دەفتەر و رەشـنووس و سەرچاوەی نووسـینەکانی لەناو ماڵەکەی من بێت، لەبەر پەنجەرە و سـەر تاقی ناو ژوورەکانی ماڵی من بێت.
کیژم تۆم بۆ مێژوو و خوێندن داناوە. تۆم بۆ ئەوە دروسـتکردوە، بۆ بسـک و کل و کلدان و منداڵبوون و گەسـک و کەف و سـابوون دروسـت نەکردوە. نیەتم بووە، تۆ مێژوو بخوێنیت، بخوێنە. نامەوێ ببیتە ئەندازیارێکی رێگاوبان. حەز ناکەم کارەبا و کۆمپیوتەر بخوێنیت. نامەوێ لەناو لاندکرۆزەری بڵندی دائیرەکانا بەسـەر پرۆژەکانا بخولێیتەوە. نامەوێ ببیتە مامۆسـتای ناوەندی و ئامادەیی، لە دیار تەختەی رەشـی کلاسـەکان، ژیان بەسـەر بەریـت! پێم خۆش نییە، تـۆ بەدیار منـداڵ و قوتابییان بوەسـتیت، سـاڵانە هەمان وانە و بابـەت دووبارە بکەیتەوە. نازانـم بۆ دەمەوێ تۆ مێـژوو بخوێنیت. ببیتە مامۆسـتای مێژوو! زۆرتر بچیتـە ناو قوڵایی مێژوو. بابەتێک بکەیتە کەرەسـتە و ئارەزووەکانت، کەسـی تر لەو شـارە ئەوەی نەکردبێت. کیژی حاکمـەکان، کوڕی دوکاندارەکانی قەیسـەریش ئەوەیان نەکردبێـت. تەنیا کیژەکەی من لە بابەتێک بکۆڵێتەوە، کەس بڕوا نەکات کیژێک ئەوەی کردوە، ئیشـێک بکەیت زووتر کەس ئەوەی نەکردبێت.
کیژەکـە بـێ ئـەوەی بزانێـت مێژوو چییـە، چەند کتێـب و دەسـتنووس و مۆزە و ئەرشـیفی گەورەی هەیە، زۆر لە دیار باوکە نەخۆشـەکەی، دڵە ماندووەکەی، چاوە کزەکانی، دوا سـاتەکانی ژیانی و هەناسە قورسەکەی، بەڵێن بە باوکە نەخۆشەکەی دەدات، باشە باوکە، بەڵێن بێت، سەد بەڵێن ئەوە دەکەم! مێژوو دەخوێنم، بەشێک دەخوێنم هیچ کوڕێک، کەس لە منداڵە دەوڵەمەندەکانی ئەو شارە، بیر لە خوێندنی ئـەو بەشـە نەکەنـەوە، تەنیا من نەبێت! ژیـان و چاو و دوارۆژم بـۆ ئەوە تەرخان دەکەم.

***

هەمەوەندەکانی ناو هەولێر
باوکم بەقاڵێکی بازاڕە جەنجاڵەکەی شـێخەڵا بوو. کەسـێکی لاواز و ماندوو، زووتر و بەر لەوەی دوکانەکە دابنێت، زۆر ماندوو بوو، زۆریش پەرۆش بووە لەبەر سێبەرێک کاسـبییەکی حەلاڵ بکات، تا دەگاتە ئەوەی دوکانەکە بکاتەوە و بناسـرێت کەنەفتە و ماندوو ببوو. بەڵام هەر باش بوو. ژیان و دروسـتبوون و پێگەیشـتن؛ جەسـتە و

ماندووبوون و شــەونخوونی و تەمەن و چاوەڕوانی زۆری دەویســت. دوکان و کاسبی شــیاو، بوخچەیەکی سەرشــان و دەزگایەکی ســادە و بچووک و بڕە پارەیەکی کەم و جورئەتی زۆر و سەرکەشــی بەورەی دەویست.

ئەو بۆ خۆی و راپەڕاندنی بازاڕەکەی، چەند وردە نووسین و ناو و ژمارە و ژماردنی و کۆکردنەوەی قەرزی رۆژانەی دەزانی. هێنان و بردن و فرۆشتنی ناو دوکانەکەی بە نووســین و ژمارەوە فێر ببوو. ئەوانەی دەزانی و هەرگیز بە منداڵی، بە گەورەییش نەچووبــووە قوتابخانــە، دەفتەرێکی ســی لاپەڕەیی بە نووســین پــڕ نەکردبووەوە. منداڵــە گوندییەکیــش نەبووە، دایکی یــان باوکی بینێرێتە بــەر خوێندنی حوجرەی مەلایەک، لەوێ قەڵەمی هەبێت و بزانێت نامەیەک بنووســێت.

ئەویش لە کۆتایی پەنجاکان، دەچێتە ناو بەلەم و بەر شەپۆڵ و سێبەری شیوعییەکان، کــە لەودەمانــە لەناو هەولێر ئەندام و ســەرکردە و دۆســتیان زۆر بــووە. ژن و پیاو و گەنــج و پیریــش، مەلای مزگەوت و ئاغاکانیش هەندێ لــە کوڕەکانیان دەچنە ناو شانەکانی ئەو حزبە. حزبێک بوو، لەگەڵ ئەوەی حزبی کرێکاران بوو، زۆر لە قوتابی و مامۆســتا و جوتیــار و دەوڵەمەندەکانیش تێــدا ببوونە ئەندام، چەکوچی کرێکاران بۆ خەبات و رەنگە ســوورەکەیان هەڵگرتبوو. ئەویش گەورە شــیوعییە دڵسۆزەکانی ئەو شارە دەناسێت، لەگەڵ ئەوانیش ماوەیەک دەگیرێت، لە زیندانەکانی ناو عێراق، بــە یاســا و بڕیارەکانــی دەســەڵاتی پاشــایەتی دەگیرێت و ئازادیــش دەبێت، بەڵام وەک چــۆن عەبدوڵا گۆرانی شــاعیر «دەگێڕنــەوە، خەڵکەکەی لەگەڵ ئەو گیرابوون، دەڵێــن ئــەو لەنــاو زیندانا فێرە خوێنــدەواری کردوم» ئەویش لەنــاو زیندانەکە، بە قەڵەم رەساســێکی تیژکراو بە دەمی موســێک، پاش ئەوەی دەیان جار ریشــی خەم و چاوەڕوانی و سەرکەشــی ئەوانی تاشــیبوو، قەڵەمەکە تیژ دەکات و لەســەر کۆنە دەفتەرێــک؛ کە لەناو چارۆگە و بوخچەی خوشــکی یەکێکیــان، لەناو چاوی گریاوی دایکــی شــیوعییەک، دەگاتە ناو زیندانەکە، فێری هەندێک نووســین و خوێندنەوە و ژمارە و نامە نووســین و ناو دەکرێت.

بە تەمەنی گەورە، بە مێشکی تژی لە هزری چەپگەرایی، بە نیازی ئەوەی زوو ئازاد بن و بچنەوە ناو چایەخانەکانی ناو شــار. بچنەوە ماڵەوە و کۆبوونەوەکانیان لەگەڵ

«عادل سەلیم» و «شێخە شەل» تەواو بکەن. لەسەر سک درێژ دەبن، ئەلف و بێ دەنووسن و دەخوێنەوە. دەنووسن و بیر لە رۆژی دادگایی و گۆڕینی پاسەوانە دڕ و پۆلیسە خراپەکانی بەر شیشبەندەکان ناکەوە. دەنووسن و دەخوێنەوە، بەڵام نازانن کەی ئازاد دەبن، یان زۆر بڕوایان بە دوارۆژی خۆیان و حزبەکەیان هەبوو، زوو ئازاد دەبـن و دەچنـەوە ناو شـار! ئەو پیاوە لەودەمانە فێر دەبێـت، لەوێ ناو و بایەخی مێژووی دەکەوێتە مێشک. لە دیار شیشە ژەنگاوییەکانی زیندانەکە، بەپێوە وەستاوە و چاوەڕوانی دایکی دەکات. سـەیری تفەنگە ئینگلیزییەکەی پۆلیسـەکە دەکات کە دەستە جلێکی دڕی خاکی لەبەرە، زۆریش بەبەرییەوە گەورەیە، پۆستاڵە رەشەکەی لە ترسی رەئیس عورفاکەی رەش رەشکردوە، سەیری دەرەوە دەکات. دەیەوێ ئازاد بێت و بگەڕێتەوە سـەر دوکانەکەی. بەرامبەر مەرقەد و مەزارەکەی شـێخەڵا، روو لە کاسـبی بکاتـەوە. لەو رۆژانەوە؛ لەبەر سـۆزی منداڵ و خێـزان و ژیان، لەو بازنەیە وشـەی مێژوو ختوکەی دەدات! زۆرتریش عاشقی وشەی ئاشتی دەبێت.

***

لەودەمانـە، کـە لە زیندان بووە، دەیـەوێ بزانێت لـە دەرەوە چ دەگوزەرێت. لەناو شـار، ئەویش لەناو زیندانە، چ روودەدات. دەرەوە، دەرچوون، ناسـین و زانین چەند خۆشە، شەیدای دوور و کۆن و خەڵک دەبێت. لە زیندانا بیر لەوە دەکاتەوە؛ ئەوەی دەیـەوێ بزانێـت، فێری ببێت و شـرۆڤەی رووداو و کەس و رۆژگارەکان بکات، ئەوە مێژووە!

مێژوو، کایەکی بەستەزمانە. دیرۆک بە چەندان شێوە، وەک قووڕ دەستکاری دەکرێت. چەندان پەیکەری مەڕمەڕ و گۆزەی شەرابی خەیاڵی لێ بەرهەم دەهێندرێت. مێژوو، منداڵە و گەورەکان بەخێوی دەکەن، پەروەردەی دەکەن. ئەوان، بە ئارەزووی خۆیان راهێنانی پێ دەکەن! مێژوو، بۆتە بەرهەم و چالاکی؛ سەرکردە دەبەنگ و شەڕخواز و جەلادەکانیـش، بـەڵام خەڵکانی تریش، نووسـەرانی تریش مێژوو دەنووسـنەوە، تۆماری دەکەن. مێژوو موڵک و ساباتی هەمووانە. بۆیە ئەویش دەیەوێت و خوازیارە کیژەکەی مێژوویێک بنووسـێتەوە، کەم کەس بیری لێ کردبێتەوە.

***

مام ڕەحمان دەزانی کیژەکەت، ئەوەی ناوت ناوە ئاشتی، کیژە ئارام و چاپوکەکەت لەناو کۆشک و مۆزە و باڵەخانەی ئەرشیفی عوسمانی، بە دوای ناوی ئەربل و کورد و کوردستان پەرۆشە. دەیەوێ بە دوو چاوی شەرمن و کەمێکیش ترساو، بچێتە ناو ئەرشـیفخانەکەیان. لەناو تورکەکان، لەگەڵ دۆکومێنتە تورکییەکان وشەکانی؛ ئەربل و کورد و کوردستان بدۆزێتەوە!؟

دەزانـی مـام ڕەحمان ئەو چالاکی و ماندووبوونەی کیژەکەی تۆ دەیکات، باڵکێشـە. ئەویش بەردەوام گوتوویەتی:

«مێژووم لەسەر وەسیەتی باوکم خوێندەوە».

ئەگـەر چالاکـی و بەرهەمەکەی ئیمـڕۆش زۆر باش و گەورەش نمایـش نەکرێت، لە داهاتوو، ناوی ئەو و چالاکییەکانی، شـانازییەکی گەورە بەناوی خۆی و شـارەکە و زانکۆی جیهان دەبەخشێت!

دەزانـی مام ڕەحمان، تـۆ لە خوارەوەی قەڵات لەدایکبوویـت، لە ماڵەوە بە کوردی قسـەت کـردووە و تورکییەکەت باش نەبوو، بەڵام کیژەکـەی دەبێتە بەخت و بووک و تـارای تـۆ. «هاوسـەرەکەت» کوردییەکەی باش نەبوو، تورکییەکەی زۆر باشـتر بوو. لەو پرۆسـەیەدا، کیژێک بە دوو چاوی ڕەش و کەزی و بسـک و مەکر و نازەوە لەدایـک دەبێـت و گەورە دەبێـت. ئەویش بۆ خوێندنی مێژوو، بـە کوردییەکی باش و تورکییەکـی خـراپ، دەیەوێ مێـژوو لە تورکیا بخوێنێت. بەڵام کۆشـش دەکات و خوێندنەکـە تـەواو دەکات. دووبارە بە پیتی لاتینی و تورکی ئەسـتنبۆلی، دەیەوێ دەقە عوسـمانییەکانی بە پیتی عەرەبی و ڕێنووس و زمانی عوسـمانی نووسـراون، ورد و بە ئەمانەتەوە بخوێنێتەوە.

❊❊❊

مـن خـۆم چوومە تورکیـا «هەزارەها کەس ئەوەیـان لە دەفتەری یادنووسـەکەیان نووسـیوەتەوە» تـا چارەنووسـی خـۆم بدەمـە دەسـت قاچاخچییەکـی دەبەنگ و سـەرکەش. پارەیەکـی زۆرم لەناو دەسـتی کرد، تـا لەو کاروان و بڕیـارە دەربازم بـکات. دەکەومە دەسـت پیاوێکی لاوازی زۆرزان. ئـەو ماوەیەکی زۆر لە ژوورەوە و بەدیـار دووکەڵ و چای زەردەوە مابووەوە، ڕەنگی مردووی گرتبوو، بۆیە دەترسـام

ـ بـەڵام چارەم نەبوو ـ بەو بەلەمە ترسـناکانەی دەریـای ئیجەیان دەبڕی، منیش بە کوشتن بدات.

ئـەو و ئێـوە و هەمـوو؛ بـۆ دەریـا و خـواردن و سـەیران و دکتـۆر و شـەوچەرە جوانەکان دەچوونە تورکیا. بەڵام ئاشـتی رەحمان دەچێتە شـارێک دوور لەو بەزمە، لە سـنوورەکان، لە بازاڕ و پاسـپۆرت و ناونووسینی «یو ئێن» و تەکیەکەی شێخ. دوور لەوانە کیژەکە دەچێتە شـاری مەراش. ناو زانکۆیەکی ئارام و لاچەپ ناونووس دەکرێت. کێ ئەو زانکۆیەی بۆ دەدۆزێتەوە!؟ چەند شار و زانکۆ دەگۆڕێت تا لەسەر ئـەو زانکۆیــە جێگیر دەبێت! لە شـارێک، تورکەکان شـانازی بە سـوارچاکی میر و سـوارەکانی دەکەن. ئەوان زوو و ئازایانە شـارەکە لە حەلەب جیادەکەنەوە و شەڕی فەرەنسـییەکان دەکەن. شـارەکە دەگێڕنەوە ناو باوەشی تورکیا! لەوێ تورکیا گەرم و سەنگینە، لەو شارە، چیرۆکی قوربانی زۆرە! بەڵام وا کیژە کوردێک لە هەولێرەوە دەچێتە ئەو شـارە، لـە زانکۆ مۆڵەتی خوێندنی وەرگرتـوە، بڕیارەکەی خۆی داوە، دەچێتە تورکیا و ماسـتەر لە مێژوو دەخوێنێت.

بەڵام ئەو زووتر لە ئامادەیی عیشق «سەرەتا کە ئەو ئامادەییە لەناو هەولێر دامەزرا و دەکرێتــەوە، قوتابی سـەرەتایی وەردەگرێـت، گوتیان خەڵکی شـارەکە و هەموو کوردسـتان و شارەکانی پارچەکانی تریش، لە هەندەرانیش دەیانگوت:

ئەزموونـە سیاسـییەکە، خوێندنـە کوردییەکە دەکەوێتە بەر هەڕەشـە و مەترسـی ترسناک. دەیانگوت:

هزرە تۆرانییەکە پەرەدەسـەنێت و کوردستان داگیر دەکەن. دەیانگوت:

وێنـەی ئەتاتورک لە پۆلەکان هەڵدەواسـن و زمانی کوردی لەبیر منداڵان دەبەنەوە. دەیانگوت:

خوێندنی کوردی بەرەو زمانی تورکی دەبەنەوە. دیارە زووتریش بەشـێکی خەڵکی نـاو شـاری هەولێر هەر بـە زمانی تورکی قسـەیان کردوە» لە باڵەخانەکەی سـەر شـەقامی شێسـتمەتری! لەوێ کۆرسـی زمان بە نووسـین و خوێندنەوە فێر دەبێت! بەوەیـان هەمـوو ئامادەییـەکان دەکات بچێتـە تورکیـا، تا لەوێ مێـژوو بخوێنێت. تورکـەکان، زانکـۆکان، بەرپرسـانی بـواری خوێندنی باڵای تورکیـا، حەز دەکەن و

پەرۆشن، ئاسانکارییش بۆ ئەوانە دەکەن، کە بە تورکی مێژووی تورکیا و سەردەمی عوسمانی دەخوێنن!

کیژێکی تەمەن سی ساڵەی شەرمنی سەرپۆش، ترساو و بەگومان و دوودڵ! بە جانتایەک جلوبەرگ و خواردن و کەرەستە و فەرهەنگ و کتێب و پێڵاو و جانتای دەستی و کەمێک بۆن و مکیاژەوە، دەچێتە ناو پاسێکی گەورە، بەرەو شاری جەزیرە، لەوێ بەرەو شاری غازی عەنتاب دەڕوات. ئەو ناچێتە ئەنکەرە و ئەستنبۆل. ئەو دەیەوێ بچێتە شاری مەراش! شارێکە کەسی لێ ناناسێت، هەرگیز و زووتر تەنیا ناوی دوور بە دووری بیستبوو. شارەکانی تورکیا زۆرن، سنوورەکەی گەورەیە، ئەدی ئاوی دیجلە و فوراتیش لەو وڵاتە هەڵناقوڵێت، سێ وڵات تێر ئاو و ماسی و ناز و جوانیش ناکات!؟ ئەدی ئەو وڵاتە سەردەمانێک حوکمی بەشێکی گەورەی ئەو جیهانەی نەدەکرد!؟ بەڵام ئەو کیژە بەستەزمانە، تازە دوو ساڵە خوێندنی مێژووی تەواو کردوە، هیشتا باش ناو شاری هەولێر شارەزا نییە، دوو جیرانی ماڵەکەیان ناناسێت، نازانێت و ناتوانێت ئۆتۆمبێل لێبخوڕێت! دەیەوێ لە تورکیا ماستەر تەواو بکات، بابەتەکەشی کورد یان کوردستان بێت!

***

بەر لەوەی بچێتە ئەو بازاڕییە بچووکە، ئەو قژبڕینە ئێوارەییە، ئەو سەیرانە کورتە، ئەو میواندارییە لەناکاوە، ئەو داوەتە بەناچارییە، بچێتە تورکیا. ئەو پەرۆش و راستگۆیانە لەگەڵ دەستە خوشکێک، کیژێکی دڵسۆز، یەکێک لە یەکەمەکانی تری بەشەکە، رێکدەکەون! پەیمانێکی دروست لەگەڵ پەیمان دەبەستێت.

باشە، هەر چۆنێک بێت دایکم ئیقناع دەکەم. ئەو دڵم ناشکێنێت، هەرگیز دڵی نەشکاندوم «یەکێکیان بەوەی تریان دەڵێت». تۆش دایکم ئیقناع بکە، «ئەوی تریان بە دەستە خوشکەکەی دەڵێت»، دایکم کەمێک دوودڵ و بەگومانە، لە هەموو شتێک دەترسێت، بەیەکەوە بچینە تورکیا و مێژوو بخوێنین!

- قاوەکەت سارد بووەوە، نازانم کەی فێر دەبیت قاوە بەگەرمی بخۆیتەوە!؟

- رەنگە ئەگەر بچینە تورکیا لەوێ فێر بم.

- بڕوا دەکەیت، بچین و ئاسانکارییمان بۆ بکرێت!؟

ـ نازانـم وا بیرۆکەکـە لـە کەللـەی هەردووکمانـی داوە، لەجیاتـی هەموو شـتەکان بیرمان لەوە کردۆتەوە. «لە کافتریاکە هەڵدەسـتن، جانتاکانیان نەک تەنیا رەنگ و شێوەیان وەک یەک بوو. کەرەستە و پێویستییەکانی ناوەوەی و پارەکانیشیان وەک یەک بـوو. ئەوان بەیەکەوە دامەزراون، بەیەکـەوەش موچە وەردەگرن، بەیەکەوەش شـۆپینگ دەکـەن. داهـات و مەسـرەفەکانیان دروسـت وەک یەک بـوو، بۆیەش لە پارەدانـا جیاوازییـان نەدەکرد، یەکێکیان پارەی دوو قاوەکە و پارچە شـیرینییەکە دەدات. بەدەم قسە و گفتی گەرمەوە لە کافتریا گەورە دوو نهۆمەکە دەچنە دەرەوە، لەسـەر شـەقامە زۆر قەرەباڵغەکە زوو تاکسییەک بۆ ناو کۆلێژ رادەگرن و دەڕۆن».

هەردووکیان ئاخاوتنەکەیان تەواو دەکەن. دەست دەدەنە جانتا سادەکانیان و بەرەو بەشـەکانیان دەڕۆن. بۆ ماوەیەکی کاتی دادەبڕێن، بەڵام نیمچە بڕیارێک دەدەن زۆر بەیەکـەوە بمینێنـەوە؛ شـەو و رۆژ، مانگ بە مانگ و دوو سـاڵ زۆرتریش بەردەوام بەیەکەوە بن.

مـن باوکـم نەمـاوە، «ئەو دەمانـەی باوکم دەمریـت، تۆ لە هەموو کەسـم زۆرتر و پەرۆشـتر هاوخەمم دەبیت و تۆش خەمەکەم سـووک دەکەیت». بەیەکەوە دەچینە لای باوکت و داوای لێ دەکەین ببێتە دوو باوک، باوکی دوو کچ، باوکێکی دڵۆڤان بۆ کچێکـی هاوڕێی کچەکەی، ئەو رەزامەندی بفەرمووێت بەیەکەوە بچینە تورکیا. وەرە هەردووکمـان بەیەکەوە ئـەو نارنجۆکە لەیەک کاتدا، لە هەردووماڵەکە بتەقێنینەوە. بـەو بـەردە گۆمەکـە بشـلەقێنین. بەیەکـەوە پرسـیار و داواکە بکەیـن، بەڵام زۆر بەدڵنیایی و شێلگێرانە! پرسیار و داواکە دەکەین، زوو وەڵامی رامان و گومانەکانیان دەدەینـەوە، زوو پێیان دەڵێین، بڕیاری خۆمانداوە، تەواو.

من زووتر داوایەکم داوە بە راگری کۆلێژەکەمان «چۆن من ئاگادار نەبووم، بەردەوام بەیەکەوەین، کەی نووسـیت و کەی پێشکەشـت کرد، بۆ کەس بۆی نەگێڕاومەتەوە، کەس باسی نەکردوە؟».

منیش هەر ئێستا نامەیەک دەنووسم و داواکەم پێشکەش دەکەم، با هەموو مەرج و پێداویستییەکانمان بەیەکەوە بێت.

***

دوایــی و پــاش ئەوەی لــەماڵەوەیان بابەتەکــە دەبڕێتەوە، ئیتر لەگــەڵ ژمێریار و خۆیەتی و بەرپرسەکانی بەڕێوەبەر و حزبیش قسە دەکەین. تۆ پاش من و یەکسەر وەرە و بــڕۆ و بڵــێ و شــەرم مەکە، یان من دەڵێم بەتەنیا ناچــم و ناتوانم و ناکرێ ئەگەر یەکێکم لەگەڵدا نەبێت!

من پێش تۆ، بەر لەوەی هەواڵەکانی تەلەڤزیۆنەکە دەست پێ بکات، بێژەرەکەی دوا مۆدەی کۆســتەمی لەبەرە و دەنگی لەناو ســتۆدیۆکە دەلەرێنێتەوە، بەڵام تۆزقاڵێک من ناجووڵێنێت، بکەوێتە ناو وردەکارییەکان و شرۆڤەی پێشهاتەکان بە باوکت بڵێ، بەڵام بەکورتی، ئاماژە و پەیڤە و ئاکاری دەموچاوت و جووڵەی پەنجەکانی دەستت وا نیشــان بدەن، کە زۆر بەڕاســتی قســە دەکەیت و بڕیارەکەت دوا بڕیارە و تەواو، پاشگەزبوونەوەی تێدا نییە، هەموو ئامادەکارییەکانت تەواو کردوە، پەیوەندییەکانت کردوە، مۆڵەتت وەرگرتوە، شــەهادەکەت کردوە بە تورکی، لە وەزارەتی دەرەوەش پەســەندت کردوە، خۆت وا نیشان بدە.

تۆش، بەر لەوەی دیســان دایکت باســی دوارۆژ و گەورەبوون و قســە و خەڵکت بۆ بکات. ئەو رۆژانە، داوا و هەڕەشە و هیوا و خەیاڵەکانی رووبەڕووت دەکاتەوە، بەڵام ئــەوەی باشــە کــەم دەتبینێت، کەم لە ماڵــی و کەمیش بەدیار ئــەو وەک بووکەکە سەما دەکەیت، ئەو ناتبینێت! شەرمی لێ مەکە، قسەکانی خۆت بکە، باسی گرنگی مێژووی بۆ بکە، نمونەی زۆری بۆ بێنەوە، پێی بڵێ پاڵەوانەکان، ســەرکەوتووەکان مێژوویــان نووســیوەتەوە، بۆیــان نووســیونەتەوە، تۆماریان کردوە، پاراســتویانە، ئێمەش دەچین، دەخوێنین، تا مێژووە نووسراوەکە شرۆڤە بکەین، لە چەندان گۆشە نیگاوە ســەیریان بکەینەوە. بە دایکت بڵێ:

هەمــوو وردەکارییەکانــی وەرگرتــن و چوون و مۆڵــەت و ئاســانکارییەکانمان تەواو کردوە، هیچمان نەماوە، تەنیا ئەوە نەبێت داوا و پرسیار و ماچی ماڵئاوایی نەبێت. جانتاش بەئاســانی ساز دەکەین و دەڕۆین.

❊❊❊

مــن شــەرمم لە ریشــی ســپی و هەیبەتــی باوکت نەکرد، قســەکەم لەناو دەســتی دانــا و گوێزەکــەم جــوان و بــاش بە بەردێکی نەرم بۆ شــکاند. ســەیری چاوەکانی

ئەویشــم دەکــرد، تــووڕە نەبوو، گلەیی نەبوو، هەســتم بە بزەیەکی شــیرینی ســەر لێوەکانی کرد، بە ئاگری گەشی چاوەکانی گەرم بوومەوە، لە ریتمی دەنگی سۆزێکی شــیرین داپپۆشــیم. ئەو پاش ئەوەی دەزانێت من چیم دەوێ و بۆچی هاتووم، دڵی دەگەشێتەوە. باوکت شادمان، چاوەکانی بوون بە کڵافەیەک لە تروسکایی ئەستێرە. بەڵام هیچم لەو ئاماژانە، باش و روون بە قســە و پەیڤێک لەو نەبیســت! دڵی گەش بــوو، بۆیــە نەیتوانی یان پێویســتی بەوە نەبــوو زمانی بپەیڤێت، بــەڵام دیارە ئەو ئاســوودە نەدەبوو، یەکســەر کەشــەکە بە دەربڕین بڵێتەوە. ئەو بەو دیمانەیە، بەو داوایە زۆر ســەیر و لەناکاوە، دەبێت بە مرۆڤێکی باڵدار و باوکێکی نەرم و شــیرین. لەبەر چاوی من، باوکت دەبێتە کەســێکی شــاناز، بەڵام قســەی نەکرد. بەر لەوەی جووڵەیــەک بکــەم، لەناخــەوە بڵێم تەواو دەڕۆم، دووبارە رووشــیرین و رەزامەند بە چاوەکانــی، بە گەرمایی دەســتەکانی و بە لوتفە شــیرینەکەی، بــە هەنگاوەکانی کە بەڕێــم دەکات، هەمــوو ئاکار و رەزامەندییەکانم لێ بەدی کرد، بەڵام هیچ قســەیەکی نەکــرد، هیچی بۆ نەهات، چ بڵێت:

بڕیارمانداوە بچینە تورکیا و مێژوو بخوێنین. هەردووکمان دەچین و ئامادەکارییەکانم تــەواو کــردوە، کەس دەتوانێت بەرگەی هەژموون و لێشــاوی تونــدی مێژوو بگرێت! تۆش ئیمڕۆ وەرە، پەلە بکە، بەبێ پێشەکی و نوزانەوە، یەکسەر ئەو داوا و سۆزەی باوکــت و نیگا شــیرینەکانی، بــە دایکم بڵێ و رووبەڕوو بڵێ باوکــم بۆ هەردووکمان رازییە.

کچی باش، بزانە من بەتەنیا ناڕۆم، بەتەنیا ناچمە تورکیا، بەیەکەوە دەچینە تورکیا. مــن بــە راگری کۆلێژەکەمــان دەڵێم، دڵنیــام زۆری پێ خۆش دەبێت و پشــتیوانی گەورەمان دەکات. تۆش بە بەرپرســی بەشــەکەمان بڵێ. من بە قوتابییەکان دەڵێم، ئەوانــەی بەردەوام دەخوێنەوە، دەنووســن، چالاکن، کیژ و کــوڕەکان. تۆش لەگەڵ چاخواردنەوە «دیارە زۆر حەزت لە چای گەرم و تاڵیشــە» لە یانەی مامۆســتایان، لەناو مامۆستاکان بڵێ:

ئێمە هەردووکمان بەیەکەوە دەچینە تورکیا، لەوێ مێژوو بە زمانی تورکی دەخوێنین. من بەشــێکی ســەردەمانێکی مێژوو دەخوێنم. ئەویش سەردەمانێکی تری بۆ خوێندن

و توێژینەوە هەڵبژاردوە. مێژووەکەمان بەشــکردوە، کردومانەتە بە دوو بەش، ڕەش و ســپی. دوور و نزیک. ڕۆژەڤ و دوایی ســەردەمی عوســمانییەکان. بە نووســینی تورکی کۆنی ئەلفوبێی عەرەبی و نووســینی پیتی لاتینی! هەردووکمان مێژووی شــار و وڵاتەکەمان دەخوێنین.
ماڵەوەمــان، کۆلێژەکــە، کوڕ و کیژانی ناو کۆلێژەکــە تێدەگەیەنین، ئەوانەی چاویان لەســەر ئێمەیە، ئەوانــەی چاوەڕوانن، بەنیازین ڕۆژێک پێیان بڵێن، وەرە با دەســت لەناو دەســتی یەکتری بنێین! با ئەوانەش بزانن، لەناو فنجانێکی قاوە وەک عەرەب دەڵێن باهۆزێک بەرپابکەین. ئاســاییە وا ســەدان کچ و کوڕی زانکۆکان، دەرچووانی ئامادەیــی بــە پارەی خۆیــان لە تورکیــا و مالیزیا و وڵاتانی ئەوروپــا دەخوێنن. وا حکومەت بە بەرنامەی تواناســازی، هەموو ئاســانکارییەک بۆ خوێندنی قوتابییان لە دەرەوە دەکات، موچە و دەرماڵە و پارەی زۆریان بۆ ســەرف دەکەن.
وەرە، بــا بەیەکــەوە، بچینــە ناو تورکیــا و تێبگەین ئەوان «میللەت و سیاســەت و مێژوو و ئەرشــیف و خوانی خواردن و ئەتەکێتی پۆشــاک و ئاخاوتن» چۆن باسمان دەکــەن. نیازیــان چییە، ئێمە هاوســێیەکی چۆنین. ئەوان چۆن لە هاوســێیەتییمان دەڕوانــن. بە چ چاوێک، هەســتیان چییە، کەم و باڵا یــان خزمەتکار و کۆیلە، چۆن ســەیرمان دەکــەن! لەوانە قورســتر و ئاڵۆزتــر و مەزنتر، کچێ وەرە بــا بزانین، بە خۆمــان بخوێنینەوە، ببینن، ئەوان، ئیمپراتۆرە مەزنەکەیان، چۆن حوکمی وڵاتەکەی ئێمەیــان کردوە. چۆن ســەرانە و باجیــان وەرگرتوە. من لە دەقێکــی کۆن بینیومە پــارە و باجیــان لە کەنگر و تۆڵکەی خوداییش وەرگرتوە. ژنێکی داماو، دوو منداڵی ناســک، شــوانێکی بەســتەزمان، بە هەوەستی بەهار و بارانی شــیرین، گیا و گوڵ و پیفۆکیــان کــردوە، تۆڵکەیان پنج بە پنــج کردوە، کۆیانکردیتــەوە، ئەوەی خوراوە و گــەرم کــراوە، لەبەر چاوی ســاوەر و روون کــراوە، ئەوەی تریان هێناوەتە شــار بیفرۆشــن، ئینجا باجیان لێیان وەرگرتوە! لــە تۆمارەکانیان، لە دەفتەرەکانی باجدا بوونی هەیە، نووسراوە.
کچــێ وەرە بــەڵام قســە ناکەین، دەچیــن و دەخوێنین و دەزانین چ لــەو وڵاتە، لەو دەوڵەتــەی ســەدان ســاڵ حوکمی کــردوە چی کــردوە، چی بردوە، کێی کوشــتوە،

کام عەشـیرەت و بنەماڵـەی راگوێـزاوە، دەزانیـن چـۆن قوتابخانەی «سـبیان» و «روشـدیە»یان بەڕێوە بردوە. قوتابخانە ئایینییەکان، پیاوانی مزگەوت و تەکیەکان چەند گوند و موڵکیان وەرگرتوە! زۆر شـت دەزانین، ئێمە یەکەم کەسـین دەچینە ناو پاوان و گەنجینە و سەندوقێکی داخراوی لەبیرکراوی ناو تورکیای کۆن و نوێش! بوارسـازە دەچینـە نـاو ئەرشـیف و مێژووی لەبیرکـراو. دەچین و دەبینـە قوتابی مامۆسـتایەکی تـورک. دەچینە نـاو کتێبخانەکانیـان. دەبینە هاوڕێـی فێرخوازانی تورک، باش زمانەکەیان دەزانین، مێژوویان شـرۆڤە دەکەین، لەسـەری دەنووسـین! لەگـەڵ خوێنـدن و توێژینەوەکانـا، لەگەڵ کتێب و دەفتـەر و فەرمان و جلوبەرگ و کۆشک و مزگەوتەکانیان ئاشنا دەبین.

- یەمـۆ دەزانـی بۆچی من دەمەوێ بچمە تورکیا و زۆرتر مێژوو بخوێنم!

- بـۆ! تـا دوارۆژ و موچە و مێرد و منداڵی ئاسـوودە پەیدا بکەیت. «بە پێکەنین و رووێکی شـیرین تا ئەو تووڕە نەبێت».

- نا، قسـەکە مەکە بە بەزم و گاڵتەکردن، ئیشەکە تەواوە.

- گاڵتـە نییـە، وا بڵێم باشـترە تا زوو راسـتی و گرێی دڵت بکەیتـەوە، بزانم بۆ وا شـەیدای مێژوو و تورکیا لە کەللەی داویت.

- دەمەوێ لەبەر داوای باوکم مێژوو زۆرتر بخوێنم، یەکەم کەسیش بم، بابەتێکی نوێ بخوێنم، یەکەم بم، یەکەم.

- ئـەوەی باوکت دەزانم، بەڵام یەکەمییەکەت تازەیە!

***

باوکم دەیگێڕایەوە، ئێواران ـ ئێواران، بۆ ماوەیەکی کورت یەکترمان دەبینیـ لەنزیک ئـەو دادەنیشـتم. لەمێژە، مـن منداڵبووم و لەبیرم ماوە، نازانم باسـی کێی دەکرد، لەوەیـان مەبەسـتی کێ بووە. ئەگەر ناوەکـەم لەبیر مابوایە دەمزانـی و دوور نییە کەسێکی نزیک خۆمان بێت. کەسێک بووە نزیک لە خۆی، چونکە ئەو باسی خەڵکی نەکردوە، بۆیە دەڵێم دووریش نییە، هەر باسی باوکی خۆی کردبێت. یان هاوڕێیەکی خۆی:

دڵنیام، پیاوێک بووە دوکانیان لە شێخەڵا هەبووە. بەیەکەوە لە شارەوانی دوکانەکە

بەکرێـی مانگانــە یان ســاڵانە دەگــرن. کرێیەکەش چەنـد دینارێک بــووە بەیەکەوە دەیدەن. ئەوان بەیەکەوە بەشــداری کارەبایان هەبووە، بۆ شووشــتنەوەی سەوزە و میوە، بەتایبەتی توور و ســڵق و دەســکی ســەوزەکان، هەر بەیەکەوە یەک شێرەی ئاویــان هەبــووە. کە ســەرمایان دەبوو، دەســتیان لەناو ســەوزە و ئاوە ســاردەکە دەتــەزی، بەیەکەوە بەدیــار ئاگرێکی گڕداری ناو تەنەکەیەکــی قۆپاوی روونی راعی دەوەســتان، دەســت و دەستەسڕ و پێ و پێڵاو و شەرواڵ و بەرسینگی تەڕیان گەرم و وشک دەکردەوە. ئەوان بەیەکەوە بەیانییان زوو لە گومرگی سەر کەند و پردەکەی ســەیداوە. بە بار و بە ســەندوق و شــلیف و کۆمەڵ، ســەوزە و میوەیان بۆ هاتووە. بە عارەبانەی دەســتی، لەناو ســەندوقی داری ســەر داخراو، دوو سێ سەندوقیان بۆ هاتووە. ئێوارەش پارەو ســەندوقە بەتاڵەکەیان ناردوتەوە. بەیەکەوە لە یەک دەڵاڵ رەزقیان بۆ هاتووە. بەیانییان کابرای دەڵاڵ، کاتبەکەی دەفتەرێکی لە دەست بووە، جۆرکێکی گەورەشــی بۆ وردە و درهەم و نیو درهەم و دە فلوســەکان هەڵدەگرت، میوە و ســەوزەکانیان بە مەزاد دەفرۆشــتە دوکاندار و عارەبانچی و دەســتفرۆش و دەڵاڵی شار و گوندەکان.

ئــەوان دەیانزانــی چی، چەند، کەی باریان بۆ فلانــە دوکان ناردوە. دەیانزانی چەند قەرزارن و کەی پارەکە دەنێرنەوە. پارەکەیان بە دەستی عارەبانچییەکە، حەمباڵەکەی بارەکەی دەبرد ناردوە یان نا!؟ هەموویان دەزانی، کاتبەکە، ئەفەندییە رەقەڵە سەر رووتەکەی ــکەچەڵ نەبوو، سەرکۆت بوو ـ زۆرتر پانتۆڵ و چاکێتی لەبەر دەکرد، لە گەرمــەی کڕیــن و بارکردن و ناردن و هەڵبژاردن و قــەرز و ژماردنەکانی ناو گومرگ بەشــدار دەبــوو. کە بار و پیکەب و لۆری لەناو حەوشــە چیمەنتۆیــە پانوبەرینەکە، بن دیوارەکانی دەرەوەی، ئەگەر زســتان و باران نەبوایە، تەواو دەبوو. عەرەبەکانی شــووتی و گنــدۆرەی نــۆ مانگی و پرتەقاڵ و لیمۆ و خورماشــیان هێنابوو، ســواری لۆرییەکانیان دەبونەوە و بەرەو ســامەرا و بەلەد و خالس و بەعقوبە دەڕۆیشــتنەوە. جوتیــاری گوندەکانی ســەر ئــاوی کەلەک، گەعێتڵ و کەور و ســفەیە و ئەو دەشــتە دەچوونەوە. هەموو دەستفرۆشــەکانی دەگەڕانەوە گوندەکان و تەواو دەبوون.

ئــەو، کاتبە باڵابەرزە ســەروپرچ درێــژە ئەفەندییەکە ماوەیــەک دەمایەوە، دەچووە

ژوورەکەی و دۆڵابە ئاسنەکەی دەکردەوە، دەفتەر و گەورەکانی دەردەهێنا، چەندیان بۆ هاتووە و چەندیان فرۆشتووە، ئەوانەی لەناو دەنووسی و وەسڵەکانی بە بەنێک دەبەستا و لەناو دۆلابەکە هەڵیدەگرتن و ئیتر دەوامی لەناو گومرگەکە تەواو دەبوو. سەبر سەبر بەسەر دوکانەکانی شێخەڵاو سەوزە فرۆشەکانی ناو قەیسەری دەسووڕایەوە، پارەکانی کۆدەکردەوە. ئەگەر باوکیشم پارەی لەبن دەستی نەبوایە، دوکانەکەی تەنیشتی، برادەرەکەی قەرزەکەی بۆ کاتبەکە دەژمارد. باوکم باسی پیاوێکی ئەو سەردەمەی دەکرد، ئەگەر باسی باوک و مام و خاڵێکی خۆی نەکردبێت، ئەوەش دوور نییە، ئەو بۆی گێڕاوەتەوە:

لە چلەکانی ئەو سەدەیە، لەناو شار هەموو ئیشوکارێکم کردبوو، ماڵمان لە سەعدوناوە بوو، نزیک ماڵە جووەکان و ناو بازاڕ بووین. زوو و بۆ ژیان دەستم بۆ هەموو کاسبییەک بردوە. ساڵێکیان لەنزیک خۆمان بە کۆنە لۆری پیاوێک، لۆرییەکە بە هاوبەشی، زۆرتر بە پارەی پیاوێکی جوو کڕابوو، بارمان دەبردە گوندەکان، کە دەگەڕاینەوە ئێواران یان هەر بەیانییەکەی زوو، زوو دەردەچووین و زووش دەگەیشتین، پارەکانمان دادەگرت و تەواو دەبووین. بەتاڵ نەدەگەڕاینەوە، بۆ کورەچییەکان، بە سەبەتە، بە دەست و پاشۆڵ زبڵمان لەسەر گوفەکان کۆدەکردەوە، لۆرییمان پڕ زبڵی وردی زەردی ناسکی سەر گوفەکان دەکرد. لەناو گوندەکە شارەزا بووین، دەمانزانی کام بەر قەمتەرە، بندیوار و بەر جۆگە زبڵی زۆرترە، کۆماندەکردەوە. زبڵەکەمان دەفرۆشتە کورەچییەکان، ئەوان لەگەڵ قووڕی خشتەکانیان دەیانشێلا و دەیانگوت:

ئەو زبڵەی بە دەست و سەبەتە لەناو گوندەکان کۆبکرێتەوە، قووڕەکە جوانتر دەکات و خشتیش پتەو دەکات! بەوەش دیوار راست و پتەو و جوانیش دەبێت.

شوفێرەکە، لۆرییەکەی بە هاوبەشی لەگەڵ جووێکی خەمچی هەبوو، ئەوانەی لەسەر بان و بەر دەرگا و چۆڵەوانییەکانی نزیک قەبرستانەکەی شێخی چۆلی خمیان دەکرد، رەنگیان دەکرد، ریسیان رەنگ دەکرد، ئەو و زۆر لە جووەکانی ئەو شارە، دەستیان رەنگین بوو، کارمەند بوون، لێزان و پیشەساز بوون. پارەکانیان لە زۆر بوار سەرف دەکرد، پارەکانیان بە هاوبەشی لەگەڵ موسڵمانەکان بەکاردەهێنا.

ئــەو پیــاوەی لۆرییەکەی لە گەڕەکی ســەعدوناوە لێدەخــوڕی، پیاوێکی جەربەزە و زیندوو بوو. پیاوە جووەکەش، دەیزانی کێ دەکاتە هاوبەشی خۆی، پارە و ئاسن و مەکینەکەی دەداتە دەستی کێ!

ئــەو دەیگــوت: من هەمەوەندم، ناترســم، شــەوانەش بە بارەوە دەردەچم، بەســەر هــەورازان دەکــەوم. باری زۆرتر هەڵدەگرم، باری تووتن بە دزی، ڕەژوو بە شــەوان، شــەکر و چــا، دار و گوێــز و خــوری و مــەڕ، هەمووشــتێک دەبەم، من لــە تیرەی هەمەوەندم. باپیرانم عوســمانییەکانیان ســەرقاڵکردوە، ئەوانیان هەراسانکردوە! من نەوەی ئەوانم!

هەمەوەندەکان، لە کۆنەوە لەنێوان ململانێیەکانی ئێرانی و عوســمانییەکان، بابان و ویلایەتەکانی عوسمانی یاخی دەبوون و ئاشتدەبونەوە و دەربەدەر دەبوون! چەندان خێزان، ژن و منداڵ و پیر و گەنجەکانیش لە گوندەکانیان دەردەکران، راویان دەنان، هەڕەشــەیان لێ دەکردن، دەردەپەڕین. بەلەنگاز گوندەکانیان جێهێشتووە. ترساو و سەرکەشانەش دەڕۆن، لە سنووری دەسەڵاتی عوسمانییەکان دوور دەکەوتنەوە! تیرە تیرە، چەندان بنەماڵە بەیەکەوە، پیر و نەخۆش و ژنەکان، لە دەرەوەی ســنوورەکە لە گوندێک، لەناو دەوەنی ئاوەدانییەک، لەگەڵ ڕەشماڵی ڕەوەندان، لە دیار گۆمێکی وەســتاوی چاو شــیرین دەمانەوە. چاوەڕوانیــان دەکرد، تا پیــاوەکان، تفەنگەکان، ســوارەکان دەگەڕانەوە. دووبارە هەمەوەنــدەکان دەهاتنەوە، دادەمەزرانەوە. ئەوەی دەکەوتنە ناو هەولێر، ناو گوندەکان، ون دەبوون، نەدەناسرانەوە، زمان و زاراوەیان دەگــۆڕا، ڕەنگیــان بــە گەرما و ســەرما و ماندووبوون و برســیەتی بــەردەدا و کاڵ دەبونــەوە، دەبونــە پیفــۆک و نەدەناســرانەوە. هەمەوەندەکان لەناو شــاری هەولێر ئاوێتــە دەبوون! دەبونە کارێز و شــیرین دەبوون، لەناو شــارەکە دەبونە دەســت و کاسبی و خزم و هاوشاری.

باوکــم زۆر باســی ئەو هەمەوەندەی کــردوە. لە ماڵەوەمان نــاوی هاتووە، بەڵام من بچــووک بووم، ناوەکەم پێ ســەیر بوو. نەدەمزانــی هەمەوەند چییە، گوندە، یارییە، خواردنــە، شــیرینە یــان زۆر تاڵــە، «بۆ خۆیان و عوســمانییەکان تاڵ یان شــیرین بوون؟» ژمارەیان زۆرە یان کەمن! نەمدەزانی هەمەوەند بۆ باوکم شــیرینترە یان بۆ

بسک و نازی مندالّی من!
مـن گـەورە دەبم. ناوەنـدی و ئامادەیی تەواو دەکەم. لەبەر ویسـتی باوکم و حەزی زۆری ئـەو بـۆ مێژوو، لە لیسـتی ناو کۆلێـژەکان، ناوی ئاداب لەنـاوە یەکەمەکانی لیسـتی داواکانم بۆ وەرگرتنم لە زانکۆ دەنووسـم! بۆیەش ناوم دەردەچێت، دیسـان بەشـی مێـژوو داوای یەکەمـم دەبێت و دەچمە ئەو بەشـە! لەو بەشـە، لە خوێندن و توێژینـەوە. دووبـارە پاش ئەوەندە سـاڵە، باوکـم نەماوە، لۆرییەکـەش نەماوە، بێگومان شـوفێرە کوردە هەمەوەندەکەش منداڵ و نەوەی هەیە، نازانم باوکی چەند کوڕ و کیژی ئەو شارەیە. چەندیان نازناوەکەیان هەڵگرتووە، یان هەر نازانن باوکیان هەمەوەند بووە، لە سـەردەمی عوسـمانییەکان زۆر دەربەدەر بوون و هەواری زۆریان دیوە. ئینجا لەو شارە گیرساونەتەوە، تێدا کەس ناوی نەداون. کەس پەنجەی لەسەر سـمێڵە رەشـەکانیان، رەنگە ئەسـمەرەکانیان دانەناوە. ئەوانیش لەگەڵ ئاوارەیی و ماندووبوونـی رێبوارەکانی تر ئاوێتە بوون و ون دەبن!
دیـارە زووش جـوو کـۆچ دەکات و دەگاتە ئیسـرائیل. ئەو و هەمـوو جووەکانی لە خۆرهـەڵات، لـە وڵاتانی عەرەبی دەچنە ئیسـرائیل. لەوێ ماندووتر دەبن، کۆشـش زۆرتر دەکەن. لەناو دڕکەزەردە، لەسـەر زەوی چەقێن و بەردەڵان، دەسـت دەدەنە داس و تـەور و بێـڵ و قازمـە و خـاک دەچێنـن. لەبـەر هەتاو نەمـام دەچەقێنن، زانسـتیانە رووەک موتربـە دەکەن. بۆ خۆپاراسـتن چەکیش هەڵدەگرن، سـەربازی دەکەن، شـەڕ دەکەن. دەخوێنن و ئاو رادەکێشـن و چاندن گەشـەدار دەکەن! بەڵام پیـاوە هەمەوەندەکە لەناو شـارەکە دەبوژێتەوە و کاسـبی خۆی دەکات. ئێسـتاش ناویـان لە ئەرشـیفە عوسـمانییەکان ماوە و نووسـراوە لەناو هەولێـر و دەوروبەری گیرساونەتەوە.

***

من لە بەشی مێژوو دووبارە ناوی هەمەوەند بەخێرایی و سەرپێی دەبینم دەخوێنمەوە. نازنـاوی هەمەوەندیـش بەنـاوی هونەرمەندێـک، قوتابییـەک، تابلـۆی بوتیکێـک و کارگەیـەک دەبینـم! بەڵام زۆرتـر نازانم تا دەگەمە ناو ئەرشـیفی عوسـمانییەکان. لەوێ دەزانم لە چەندان بەڵگەنامە، لە چەندان شـوێن ناویان هاتووە، باسـیانکراوە، کۆچبارکراون، دەرکراون، رایانکردوە، گیراون، دووریان خستوونەتەوە. عوسمانییەکان

چۆنیان ویستووە باسیان کردون، زۆریش و لە هەموو میللەت و عەشیرەتەکانی تری کوردستان وەک یاخیبوو، شەڕکەر و چەکدار ناویان هاتووە!
کە کتێبەکەی هەولێر بە دوو بەرگ لەلایەن زانکۆی جیهان بەناوی هەولێر لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا دەردەچێت. ژمارەیەکی زۆری بەڵگەنامەی عوسمانی بە زمان و ڕێنووسی کوردی بڵاودەکرێتەوە.
دوو هەمەوەند، سێ پسپۆر لە مێژووی ئەو عەشیرەتە! زۆر ورد و باش دەقەکان دەخوێنەوە. بە دیتنی ناوی عەشیرەتەکەیان شانازن، شکۆدارن، چونکە بەردەوام ئەوانە لەگەڵ سوپا و سیستەم و دەسەڵاتی عوسمانییەکان ناکۆک بوون، نەیار بوون، دژایەتییان دەکەن، سەرپێچی بڕیارەکانیان دەکەن!
- کەواتە من نەوەی ئەو بنەماڵە هەمەوەندییانەم، ئەوانەی بە دزی و بە زۆرەملێ هاتوونەتە هەولێر!؟ دوورخراونەتەوە و گەڕاونەتەوە.
- نازانم، من ئەوەم لەناو ئەرشیفەکانیان دۆزیوەتەوە. لە دەقەکانا ئەوەش بەڕوونی دیارە.
- کام ئەرشیف!؟
- ئەرشیفی عوسمانییەکان.
- نامە و داوا و بڕیارەکانی خۆیانە.
- بەڵێ مێژوو وا نووسراوەتەوە!
- چۆن نووسراوەتەوە؟
- نووسراوەتەوە، ئەوانە لە ناوچەکانی گەرمیانی ویلایەتەکە، سەرپێچی زۆریان کردوە، سزادراون، رایانکردوە، چوونەتە ناو ئێران، شانازیش لەوێ راگیراون، بەڵام هەندێکیان بە بەڵێن و پەیمانیش گەڕاونەتەوە، زۆریان بە دزیش هاتوونەتەوە.

❊❊❊

**بابی عالی**

**ئەنجومەنی تایبەت**

**لە مێژووی ٢٦ جەمادی یەکەم ١٣٠٤**

**وێنەیەکی بڕیارنامەکە**

هەمەوەندییەکان چەکیان راست کردۆتەوە، سەرکردەکانیان بە ئاماژەی فەرمی

پێشوو، داواکردنەکەیان قەبوڵکراوە، کە ئەو منداڵ و خێزانانەی لە ئێران ماونەتەوە، لەگەڵ خۆیان بە کەفالەت رەزامەندی دراوە، لە بارەی نیشتەجێکردن و جێگیرکردنیان لەسەر هەندێک تێبینی لە ویلایەتی موسڵ بە مێژووی ٢ شوبات ١٣٠٢ بە تەلەگرافنامە هاتووە، بەبێ تەلەگرافنامەکە سەرۆکی ناوداری هەمەوەندەکان لەگەڵ هەندێک لە خزمەتکارەکانی بێنە ناو ئەرکی ئەفسەرایەتییەوە، بەو شێوەیە بهێندرێنە گەڕەکە دوورەکانی سنوور منداڵ و خێزانەکانیشیان، بهێنە ئەو گەڕەکانەی کە نیشتەجێ دەبن و لەوێ نیشتەجێ بکرێن، ئەوانی تریش لە قەزای هەولێر لە زەوییە خاڵیەکان نیشتەجێ بکرێن، کەچی سەرۆک و خزمەتکارەکان و لایەنگیرەکانیان لە ویلایەتی موسڵ و دیاربەکر بە شێوەی پەرشوبڵاو نیشتەجێ بکرێن، بۆ ئەم مەبەستە ویلایەتەکانی دیاربەکر و موسڵ لە رێگەی نەزارەتی ناوەخۆ بە نووسراوی پاشا ئاگادار کراونەتەوە.

***

**بۆ سەدارەتی پەناهی**

**١٧ زیلحیجە ١٣٠٣**

**٤ ئەیلول ١٣٠٢**

ماوەیەکە لە سنووری عەشیرەتی هەمەوەند و جاف دەستیان بە کاری بەد و دەستدرێژی کردوە، هەروەها بۆ ورياكردنەوەی ئەوانە سەرباز نەهاتووە، بە مەبەستی کۆچ پێکردنیان بۆ شوێنی تر پێویستە هەر چی زووە هێزێکی سەربازی بێت، ئەو تەلەگرافنامانەی لە ویلایەتی موسڵ و ویلایەتی شارەزوور و سولێمانی بە مێژووی جیاواز وەرگیراوە. بەپێی هەندێک تەلەگرافنامە هاتووە، لەسەر قسەی خدێوی لەسەر چاودێری سەروو تەلەگرافنامەکانیان دواکەوتنی هێزی سەربازی بۆتە هۆکاری ئەوەی چەتەکان بەرەو لای هەولێر برۆن و ئاسایشی ناوچەکە تێکبدەن، بۆیە بە ناچاری ئەو پۆلیسانەی کە لە بنکە بوونیان هەیە، ناردراونەتە لای هەولێر، لەوێ دە کەس لە چەتەکان دەستگیرکراون و بۆ چەتەکانی لای کەرکوک شەش بلۆک رژێمی سواری رۆیشتوە ژمارەی چەتەکانیش سی کەس بووە، کە جگە لە چەتەیەک لە سەربازانی شاهانە سێ کەس بریندار بوونە و ئارەڵیش لەناوچوون، بەداخەوە ئاوا

نووســراوە، لە تەلەگرافنامەکانی موتەســەرفەکانی شارەزوو و سولێمانی بۆ ویلایەتی نێردراوە، نزیکەی ســەد هەمەوەند هێشــتا لە ئێران لەســەر ئەو کارانە بەردەوامن، بەپێی تەلەگرافنامەی شــارەزوور پێویســتە سەربازی شــاهانە وانەیەک بەم چەتانە بدات.

***

**پوختەیی دارایی**

لــە هەمەوەنــدەکان چەکیان رادەســت کردوتەوە، ســەرۆک و لایەنگیرانیــان بەپێی ئاماژەی پێشــووی پاش رەزامەندی لەســەر لێخۆشــبوونیان لە بارەی گواســتنەوەی خێزان و منداڵەکانیان کە لە ئێران ماوەتەوە، لەســەر نیشــتەجێکردنی خێزانەکانیان هەندێکیان لێکۆڵینەوە کراوە و لە ویلایەتی موســڵ بە مێژووی ٢ شــوبات ١٣٠٢ بە درێژی تەلەگرافنامە هاتووە.

***

**٢٦ جەمادەی یەکەم ١٣٠٦**

**بابی عالی**

**فەرمانگەی ناوخۆ**

**تەلەگرافنامە بۆ ویلایەتی موسڵ**

هــەواڵ هاتــووە لە ١٣ کانونی یەکــەم ١٣٠٤ ئەو هەمەوەندانــەی رایانکردوە روویان کردۆتــە قــەزای هەولێــر، هیواداریــن هەمەوەنــدەکان دەســتگیر بکرێــن و رەوانەی شوێنەکانیان بکرێنەوە.

نازری کاروباری ناوخۆ

***

**بۆ ویلایەتی موســڵ ١٣ رەبیعی یەکەم ١٣٠٨ ١٥ تشــرینی یەکەم ١٣٠٦**

لــە کاتی چوونی بۆ ســەر ئەرکەکەی لەلایەن چەتــەی هەمەوەندی بە بڕی ٤٠ هەزار پارە و کەلوپەلیان لێ دزیوە و بەتاڵان بردویانە، خۆشی بە ٢٢ ئەندامی خێزانەکەی تووشــی تەنگانە و پەریشــانی بژێوی ژیانیان بۆتەوە، بۆ چارەســەری ئەو کێشــەیە

لەلایەن نائیبی قەزای هەولێر ئەحمەد ئەفەندی بە تەلەگرافنامە شێخەکانی کەرکوک ئـاگادار کراوەتـەوە بۆ ئەوەی پارە و کەلوپەلەکان بۆ خاوەنەکەی بگەڕێندرێتەوە.

***

سـەیرکە هەمـوو بەڵگەنامـەکان، هەموو بڕیـارەکان قازانج و بەرژەوەنـدی خۆیانە، هەموویان دەسـەڵات و بردنەوەی خۆیانە! بەزەیی و ئاسـوودەیی دەگەیەنێن! بەڵام مـن نەوەیەکی ئەو هەمەوەندانەم، باپیرانـم، لەجیاتی ژنەکان، داپیرە و پوورەکانم، حیکایەت و سـەربردە و سامان و گوندەکانی تێدا ئاوارە بوون دەگێڕنەوە. ڕێگاکانی بواری دەربازیان دەدەن، دەکێشـنەوە. سـێبەرەکانی لە سوتان فێنکیان دەکەنەوە، سنوورەکان کە ڕەش دەبنەوە، دەناسنەوە. ئەوان ڕەشماڵەکانی خەڵکەکەی ناپرسن لەکوێ و بۆ و کەی هاتوون، شـاناز دەکەن.

ئەوان دەیان خێزان، باری زۆر، ترس و دڵەڕاوکێ توند ئاودیو دەبوون، بەڵام ئازایانە ملـی ڕێـگا دەگرنەبـەر. جەربەزە و ئازا بـوون، بۆیە باری گرانیان سـووکە، خەمی گەورەیـان پەڕەمووچێکـی لانەوازەیـە و دەڕۆن و ئاودیو دەبن. لـەوێ ناحەوێنەوە، دووری دەیانسووتێنێت. لە تاراوگە شەوەکان تاریکتر، ڕۆژەکان سەخت و کولەمەرگی بووە. بە ڕۆژ خۆیان دەشـارنەوە و شـەوانە دەگەڕێنەوە. دێنەوە و سوود لە سێبەر و تاریکی هەور دەبینن و دەپەڕنەوە. دەگەنەوە ناو بۆنی خاک و زێدیان. دەگەنەوە وڵات، لەو هەولێرە وەک نوشـتەیەکی نێوان سـوخمەیەک، عەشـیرەتێکی گەورە بە چەک و سـوارەوە وەک بوخچەیەک. دەیان خێزان، وەک پارووە نانێکی بە ماسـتی تێشـووی شـوانێک. هەموو بارگە و بوخچە و ڕاز و سـەربردە و فەرمانەکانی گرتن و ڕاونان و ترسـەکانیان، وەک پشـیلەیەکی چاو کەسـک، وەک دوو گوڵە گەنم، یان کۆشـی منداڵێکی ڕوومەت قەڵشتووی بەر هەتاو.

هەموویـان لەنـاو هەولێر و گوندەکانا دەشـاردرێنەوە. گەرم دەبـن، فێنکیش دەبن! لـەو هەولێرە ماوەیەک شـاراوە، دوورە دەسـت و بێدەنگ، بەڵام هـەر بە هەمەوەند دەناسـرێن! دەژین، پیرەکان دەمرن و منداڵەکان گەورە دەبن، ناوی هەمەوەند لەناو شارەکە دەبێتە نازناوێکی شیرین.

***

# سڵێوە لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە

لەناو مەسیحییەکانی عەنکاوە، هەموو شار و شارۆچکەکانی نزیک هەولێر و شارەکانی تریش، سەدان پیاوی مەسیحی ناوی «سڵێوە»یە! دیارە ناوێکی پیرۆزە، دەزانم ناوێکی ئایینی و کۆن و دێرینی کریستیانییە، بەڵام بەڕاستی پیرۆزییەکەی بۆچی و کەی دەگەڕێتەوە، ئەوەیان نازانم! بەڵام ئەوە باش دەزانم، ناوەکە لە کڵێسا و دێر و زەنگ و قورسایی ناقوسەکانی ناوچەکە کۆنترە! زۆربەی بنەماڵە دیانەکانی ناوچەکە سڵێوەیەکی زیندوو و چەندان دانەی مردوویان هەیە و هەبووە. بەڵام لەوانە یەک سڵێوە، لەناو دۆکومێنتە کۆنەکانی عوسمانی تایبەت بە هەولێر، ناوی هاتووە و سەربردە و رۆژانەکەی بووە بە مێژوو و شیاوی یادنووسییە.
ئەو ناوە، بەهۆی پیاوێکی داماوی سەرلێشێواوی عەنکاوەیی گەیشتووتە ناو دۆکومێنتی عوسمانییەکان. لە بەدبەختی کریستیانەکان لە هەولێر و ناوچەکە پێیان دەڵێن دیان. لە شوێنی تر پێیان دەڵێن گاور. لە هەندێ شوێنیش پێیان دەڵێن فەلە. ئەوەی روون و ئاشکراشە دیارە مەسیحیشیان پێ دەڵێن و نەوەکانی دوای سڵێوە دەقەکە، نامەکانی سەبارەت بەو پیاوە عەنکاوەییەی بووە بە ئیسلام، دوایی پەشیمان بۆتەوە، نەفەوتاوە، وەک خۆی ماوە، جوانیش بە توێژەرەکە خوێندراوەتەوە. لەبەر ئەوەی توێژەرەکەش کچێکی هەست ناسک و ماندووش بووە، دوور نییە زۆریش بەزەیی بە دۆخ و نالەباری خۆی و بنەماڵەکەشی هاتووە! لەوەش سەیرتر ئەوەیە، یەک دەق و نامەش نییە. دوو دەقی بەڵگەنامەکەی بە جوانی ماون و باشیش دەخوێندرێنەوە. ئەگەر بۆ خەڵک و دەزگا زانستییەکان خوێندنەوەی

دەقەکە ئەستەم و قورس بێت، بۆ توێژەری بەڵگەنامەکان، ئاشتی ڕەحمان ئاسانە.
هەر ئەویش دەقەکەی شـیکردۆتەوە، لە کتێبەکەی چاپی کردوە.
لەو دەمانەی پیاوەکە بووە بە موسڵمان و دوایی گەڕاوەتەوە سەر کۆنە ئایینەکەی، ڕۆژەڤەکـە باڵکێـش و هەسـتیار بووە، بۆیەش زۆر باسـکراوە، نامە و راسـپاردە و داوای زۆری لەسەر هاتووە. ئاساییە دوو دەقی رەسمی دۆسیەکەی سلێوە، بە باشی پارێزراو بێت و مابێتەوە.
پیاوێکـی دەوڵەمەندی ئەو گوندە، عەنکاوە، هاتووە و گوتوویەتی:
دەمەوێ ببمە ئیسـلام! دینەکەم دەگۆڕم و تەواو.
ئـەو بـە ڕەزامەندی خۆی، چۆتە دوو مزگەوتی ئـاوەدان و خانەقایەکی کۆن و ماڵی چەند مەلایەکی سـەر قەڵات و خوارەوە و گوندە نزیکەکانی هاموشـۆی کار و کاسبی لەگەڵ کردون. بە دەسـتە جلێکی کوردی نوێ و خاوێن و پشـدێنێکی ئەسـتووری گـەورە و جەمەدانییەکـی بەگوڵینگـی پاک، بە تووتن و چـەرخ و ئاوێنەی بچووکی گیرفانیەوە، سـەردانی کردون. کەسـایەتییە ئایینییەکان، نوێژکەرەکان، لەوانەی لە بێکـەس و دامـاوی ئەو شـوێنە پیرۆزانە هەوار و ماڵیان بـووە، لەوانەیە زوو پێیان گوتووە:
- کاک سلێوە، دەمانەوێ باش بیر بکەیتەوە، نامانەوێ لەسەر تۆ، لەبەر شەهادەیەکی تۆ، قسـەمان بێتە سـەر، بڵێن لە هەولێر، شـێخەکان، مەلاکان خەڵک بەزۆر دەکەنە موسـڵمان. قەشـەکانیش لە خۆمان زویر بکەین، دڵنیاین و باشـیش دەزانین، لەبەر ئـەوەی زۆر کـەم مەسـیحییەکان دەبنە موسـڵمان، بابەتەکە گونجـاو نییە. ئەوان، خزمەکانـت پێیـان خۆش نییە و لێمان لالووتیش دەبن! باش بیر بکەوە.
- نا مامۆسـتا، جەنابی شـێخ، بە تەواوی قەناعەتەوە هاتووم و بڕیاری خۆم داوە، هاتووم لەبەردەم جەنابتان شـەهادە بێنم! ببمە موسـڵمان و موحەمەد بە پێغمبەر و قورئان بە کتێب بناسم.
«شـێخ و مەلا و ناسیارەکانی دووبارە پێیان گوتووە»
نامانـەوێ تۆ ببیتە موسـڵمان و هەواڵەکـە بڵاوببێتەوە، ئاسـایی، لە گەرمەی دۆخ و کاردانـەوەی خەڵکەکـە، تۆ بگەڕێیتەوە عەنکاوە. لـەوێ بژیت و دووبارە خەریکی کشـتوکاڵ و بازرگانی خۆت بیت. ئاسـان نییە، بۆ تۆش و بۆ ئێمەش باش نییە.
- کەس حەقی بە سـەر من نییە و تەواو.

ـ دەباشـــە برۆ موفتیخانە لەســـەر قەڵات، لەوێ شەهادەیەکی حەق بێنە.

***

زۆر پێـش ئەو پیاوە، ماوەیەکـی زۆرە بنەماڵەیەک، یان خێزانێکی گەورە لە گوندی «هەرمۆتە»ی وڵاتی کۆیە، بوون بە موسڵمان. لەگەڵ بڕیار و شەهادەکەیان، لەگەڵ بڕوابـوون و ئیمانەکەیان، ئەوان زوو و یەکســـەر بارگەیـــان دەپێچنەوە، مەڕ و ماڵات و خیـــوەت و کاریتـــە و دەرگا و مەنجـــەڵ و کەرەســـتەکانی ماڵەکانیـــان بـــار دەکەن و دوور دەڕۆن. دەڕۆن و نازانـــن کێـــوە دەچـــن. ئەوان دەڕۆن، تـــا ئاوەدانی هەبووە ڕۆیشـــتوون. تـــا مزگەوت هەبووە نوێژیان کردوە. لەو هـــەوار و کاروانەدا ڕەمەزانیان بەسەردا هاتووە بەڕۆژوو بوون. لە گوند و ئاوەدانییەکانی دێتە پێشیان، ڕایاندەگرن و داڵدەیان دەدەن و بەشـــداری خۆشی و پرسەکانیان کردوە. ئارەزوومەندانە لەگەڵ بەستەیەک شاییان کردوە، لە کارەساتەکانیش، ئەو دەمانە زۆر بوون، بەشی هەموو خەڵکەکەی کردوە، بەشـــداری پرســـە و کۆســـتەکانیان کردوە. ئەوان ڕۆیشـــتوون و ئاوەدانییەکانی شەمامک و کەندێناوەیان تەواو کردوە. لە گوند و زەنگی کڵێساکەیان زۆر دوور کەوتوونەتـــەوە، نەیانویســـتووە ڕووبـــەڕوو جارێکـــی تر لەگەڵ کریســـتیانی ناوچەکـــە یەکتـــری ببینەوە. پرســـیاریش دەکرێـــت، بـــۆ زۆر دوورکەوتوونەتەوە؟ بۆ ڕۆیشـــتوون؟ بڕوا ناکرێت، لەو دەڤەرە و لەو زەمانە لەبەر هەڕەشـــەیەکی کوشندە و لە ترسانا باریان کردبێت.

بەگوێرەی ئەو دەمانە، ئەوان زۆر دوور ڕۆیشـــتوون، لە وەڵامدا دەڵێن:

دیار نییە بۆ ڕۆیشـــتوون. بۆ ئەوەش لێکدانەوەی جۆراوجۆر گوتراوە و بیســـتراوە.

ئەوان کە دەڕۆن، وەرزەکە بەهار بووە. لەناو مێرگ و جۆگە و دەشـــتایی کەســـک و تەڕ و شـــیرین، دوودڵ یان بە قەناعەتەوە لە هەوارێکی دڵگیر و شایســـتە دامەزراون. لەگەڵ کەش و هەڵکەوتەی گوندە نزیکەکان، لەگەڵ ڕەوەند و مەڕدارەکان ئاشنابوون و زمانیـــان کـــوردی بووە، هەڵســـوکەوت و ئـــاکار و پەیڤەکانیان هیـــچ جیاوازییەکی دیاریان نەبووە. بۆیە لەوێ دامەزراون.

زۆر ڕۆیشـــتوون و مەبەستیان بووە دوور بکەونەوە، بەڵام ئەوان نەیانویستووە بگەنە ئاقاری ئەو گوندانەی عەرەبن. چونکە زمانی ئەوانیان نەزانیوە، ئاشنای هەڵسوکەوت و جلوبەرگیان نەبوون! ناچنە ئاوەدانییەکانی نزیک ڕووبارەکە، لە ناوچەی شـــەرگات و ســـوڵتان عـــارەب دوور دەکەونـــەوە. لە دەڤەرەکـــە چەند ئاوەدانییەکـــی نوێ، لە

دەشتە بەرینەکە ئاوا دەکەنەوە!
ئەوان چەند بنەماڵەیەک دەبن، بەیەکەوە دەژین، ئاوەدانییەک دادەمەزرێنن، گوندێک و زۆرتریش ئاوا دەکەنەوە. گوندەکان لە بناخەوە دادەمەزرێنن. ماڵ بە ماڵ، خێزان بە خێزان، لەو دەشتە بەرینە پشت بەیەک دەدەن و ریز دەبن. بەیەکەوە کار دەکەن، بەیەکەوە چاو لە تەواوبوونی بەرهەم و ئاوەدانییەکەیان دەکەن. بیر بۆ ئاو خواردنەوەی شیرین لێ دەدەن. باش و لێزان مەڕداری دەکەن. باش ئاشنای رۆژهەڵات و ئاوابوونەکەی، با هەڵکردن و جۆرەکانی زیندەوەر و ئاژەڵ و باڵندەش دەبن! لەوێ دەژین، لە دوو سێ خێزانی بەلەنگاز، دەبنە دە و بیست و زۆرتریش. لە گەڕەکێک دەبنە دوو و سێ گەڕەک. چالاک و ئازایانە ئاوەدانی تر ئاوەدان دەکەنەوە، دەشت و زوورگ و چۆمی تر دادەبڕن و بەناوی خۆیانی دەکەن. خاک و زەوی و ئاوی ژێرزەوی و ئاسمان و جۆگە بەهارییەکانی ناوچەکە خۆماڵی دەکەن. زەوی و دەشتە بەرینەکە، تاپۆ و موڵک و ناو و ناوبانگی نازانێت، زوو دەبنە موڵکی؛ دەست و هەوجاڕ و شمشاڵ و کەپر و چاوەڕوانی و گوڵە گەنمی شیرین.
ئیتر زۆر دەبن و پشت ئەستوور و راوەستاو دەژین. هاتوچۆی شار دەکەن، ئاشنای شارەکە دەبن. خۆیان بە قائیمقام و بنکەکانی پاسەوانی نێوان چیاکە و شارەکە دەناسێنن، سەردانیان دەکەن. کۆشش دەکەن لەوێ چەند گەنجێکیان دامەزرێن. دوو سێ منداڵیش دەنێرنە حوجرەی مەلایەکی دوازدە عیلمی گوندەکانی نزیک خۆیان. لەگەڵ دوو سێ بنەماڵەی گوندە دوورەکان، بە ژن و خزمایەتی و سەپانی و شوانی تێکەڵ دەبن، بەڵام زوو و بە خۆشییەوە پێیان دەڵێن «بندیان»! خۆشیان دەزانن، یان نازانن کەی هاتوون و بۆ هاتوون و چۆن هاتوون!
هەندێکیان دەبنە ئاغا و کوێخاش. زۆریشیان دەبنە کرمانجی رەنجدەر و شوان. هەندێکیان زۆر هاتوچۆی شار دەکەن. زۆریشیان لەبەر پیرۆزی خاک و ئەستێرە و کرانەوەی چاوی گوڵە گەنم و گوڵە جۆ، زۆرتر لە ئاواییەکان دەمینێنەوە و ناڕۆن! ئەوانە ماوەیەکی زۆر بوو ببوونە موسڵمان، بەڵام ناویان هەر بە بندیان دەمینێتەوە. موسڵمانی تەواون، دەچنە حەجیش، مزگەوتیش دروست دەکەن! بەڵام هەر بندیانن. پیاوەکەی عەنکاوە، ئەوەی بەتەنیا لەناو عەنکاوە، کەسیش نازانێت بۆ بڕیار دەدات چەند مانگێک ببێتە موسڵمان. وادەزانێت بوونە موسڵمان هەورێکە و بارانی بەسەردا دەبارێنێت. لەگەڵ ساماڵ و هاوینەکە، وەرزی خەرمان و دروونەیە و تەواو

دەبێت! بۆیە دەیەوێ پەشــیمان ببێتەوە! بەڵام پەشیمانبوونەوەکەی ئاسان نەبووە، پەشــیمانییەکەی دەستشــکانەوە و تف قووتدان و هەڵوەســتەیەک نەبووە و بەس. بڕیارەکەی دەبێتە کێشــەیەکی گەورەی نێوان شــارەکان، نێوان قائیمقام و ویلایەت، ویلایــەت و کۆشــکی یەڵــدز و هومایــۆن، نێوان مــەلا و موفتی و والیــەکان. هەموو دونیاش بە کێشــەکەی ئەو دەزانن. ســڵێوە ســوارێکە و دەڕوات، بەدوای ئایینەکەی دادەگەڕێت، دەپرســێت، سەرگەردان و ماندوو و کەساسیش، شانگران و دڵ بە زام، لەگــەڵ خێزانەکەی ناوی دەکەوێتە ناو مێژوو و ڕەنج و عیبرەت.

***

دەقی یەکەم

لــە قــەزای هەولێر ســەر بە ئەیالەتــی بەغدا، لە گونــدی عەنکاوە کەســێک بەناوی سڵێوە کە لە ئایینی ئیسلام وەرگەڕاوەتەوە و یەکێکە لە دەوڵەمەندەکانی عەنکاوە، کەسێکە خۆی ناپارێزێت لەو شتانەی کە لێی قەدەغە کراوە، ناوبراو داوای داواکراوە لەگــەڵ دوو کچەکــەی و خێزانەکــەی بۆ دەرســەعادەت بنێردرێت، بــەڵام ئاماژە بۆ والی موســڵ و ســیواس رۆیشــتوە، کە پێویســت بە هاتنی ناکات، بەپێی فەرمانی ســەدارەت کە بۆ دەرســەعادەت نێردراوە، دوو ســاڵ پێش ئێســتا کەســیک بەناوی مەرعی نێردراوەتە دەرسەعادەت، بەڵام هێشتا سەبارەت بە رۆیشتنی سڵێوە جێگیر نەکراوە، لە راســتیدا ئەگەر نەمانەوێت ناوبراو بۆ دەرســەعادەت بڕوات ئەوا مامەڵە جــوان دەکرێــت و چۆن جووڵە دەکرێت هیچ زانیارییــم نییە، ئەمر و فەرمان بۆ ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

٣ شەعبانی ١٢٦٤

والی ئەیالەتی بەغدا

محەمەد نەجیب بەگ

***

ئەوە نامە و راگەیاندنی والی بەغدایە، دیارە ئەوەش پاش نووســراو و زانیارییەکانی هەولێر و موسڵ نووسراوە. ئەوان بەغدایان ئاگادار کردۆتەوە، ئەوان گوتوویانە، مام ســڵێوە، پەشیمان بۆتەوە، دووبارە دەیەوێ ببێتەوە مەسیحی.

لە عەنکاوەش لێی توورەن، کڵێساکانی موسڵیش سەریان لێی ئەستوور بووە. خۆی بۆتە موسڵمان و شەهادەی حەقی لەبەردەم خەڵکێکی زۆر، بەتایبەتی پیاوانی ئایینی و شێخەکان هێناوە. بەڵام منداڵەکانی نەبونەتە موسڵمان و نەیانویستووە بچنە مزگەوتێک و بەردەم شێخێک شەهادەی ئایینی ئیسلام بێنن. بەڵام ئەو، پیاوەکە شەهادەی هێناوە، باش لە ئایەت و حەدیسەکانیش تێنەگەیشتووە. پەشیمانیش دەبێتەوە و توورە بووە، نیگەرانە.
هەر ئەو نییە لە زمانەکە تێناگات، موسڵمانەکانیش زۆر دڵسۆزانە روو لە قیبلەش دەکەن، زۆر کەم لە قسە و فەرموودەکانی ئەو ئایینە کە بە زمانی عەرەبییە، تێدەگەن. ناتوانن لەبەری بکەن.
ئەو پیاوێکی دەوڵەمەند بووە، واتە هاموشۆ و تێکەڵاوییەکی زۆری لەگەڵ ناو شاری هەولێر و قەزای کۆیە و رەواندوز هەبووە. بۆیە ئاساییە زمانە کوردییەکەی باش بێت، بەڵام بڕوا ناکرێت، ئەوەندە دەوڵەمەند و بازرگانێکی گەورە بووبێت، لەگەڵ عەرەبەکانی موسڵ و حەلەب شارەکانی تر هاموشۆ و پەیوەندییەکانی گەرم بووبێت و زمانە عەرەبییەکەی ئەوەندە باش بووبێت، باش و جوان لە پیرۆزی و وردەکارییەکانی قورئان و حەدیسەکان تێگەیشتبێت.

***

پیاوە عەنکاوەییەکە بۆتە موسڵمان، بەڵام دوودڵە، لەناو عەنکاوە شوێنی لەق بووە، کار و کاسبی و سامانەکەی لار بووە. دوو کەس لە هاوپیشەکانی، کەسە دڵسۆزەکانی ئامۆژگاری دەکەن، با بچێتە ناو بندیانەکانی کەندیناوە و قەراج، لەوێ رەنگە بتوانێت ئاسوودە بێت و منداڵەکانی بژین! بەڵام خێزانە عەنکاوەییەکە، لەو دەشتە وشکە، لەناو خەباتی گەرم و بەردەوامی شەو و رۆژی؛ جوتیاری و مەڕداری و قووڕکاری ئاسان نییە بحەوێنەوە!
بندیانەکان زۆر لەمێژە بوون بە موسڵمان، هیچ شوێنەواری ئایینەکەی باپیرانیان، لە رەوشت و هەڵسوکەوت و رەنگ و رووش نەمابوو، نەک ناو و نازناویان زۆر گۆڕابوو، رەنگیشیان بە هەتاو گەرمەکە، بە سەرما و بارانی پیرۆزیش گۆڕابوو. ژنەکانیان وەک پیاوەکانیان، حەیران بۆ جوانی و ژیان و ژووان و کۆشش دەچڕن. پیاوەکانیان دەنگ هەڵدەبڕن و حەیران دەڵێن بۆ ئەوەی زەوییە کێڵدراوەکانیان، رانە مەڕەکانیان، گوڵزاری بەهار و ئاوێنەی ئاوی باران، ئاشنا و پیرۆز بکەن!

پیاوە عەنکاوەییەکە، لەناو مزگەوتێکی شارەکە، لە دیار دوکانێکی ناو قەیسەرییەکە، پیرێکی ئەو بنەماڵەیە دەدۆزێتەوە، لێی دەپرسێت:
- ئێوەش دیان بوون و بوون بە ئیسلام! «کە پرسیارەکە دەکات سەرکز و ماندوو دیارە».
- وا دەڵێن، بۆیەش پێمان دەڵێن بندیان! «ئەو چەند ساڵە لەناو هەولێر دەژیت و کاسبی دەکات، لەگەڵ جووێک لەبەردەم حەسارێکی نزیک مزگەوتەکەی شێخی چۆلی، گەنم دەکڕن و دەفرۆشنەوە. بەیەکەوە لە وەرزی داهات و گەنم و جۆ، خەڵکی ئەو گوندانەی کە پارەیان بەسەر گەنم و جۆ بە جوتیارەکان داوە، بەسەردەکەنەوە».
- ئێوە کەی بونەتە موسڵمان؟ «سلێوە، بۆ دۆزینەوەی کازیوەیەکی رووناک و هیوایەک لێی دەپرسێت. دەیەوێ تێبگات، ئەو خۆی و ئەگەر نەوەی لێ کەوتەوە، کچ و کوڕەکانی چەندان ساڵ و وەرزیان دەوێت، وەک ئەو پیاوە بگۆڕێن».
- دیار نییە! «کابرا جگەرەیەکی لە تووتنەکەی بەردەمی بۆ تێ دەکات، لەگەڵ پێچانەوەشی سەیری دەموچاو و ئاکار و جووڵەی چاوەکانی کە نیگەرانییان پێوە بووە، دەکات. جگەرەکەی بۆی رادەگرێت».
- هەرگیز تووتنم نەکێشاوە! باشە باش، بونەتە موسڵمان و ئێستا پەشیمان نین!؟
- بیرمان لە پەشیمانی نەکردۆتەوە، چونکە هیچ پەیوەندییەکمان بەو رابردوومانەوە نەماوە. بۆ بگەڕێینەوە سەر چی! ئێستا خزموکەس و بنەماڵەکەمان ولاتێکمان لەژێر دەستە، هەموو دەشت و دەر و زوورگەکانی ناوچەکە موڵکی ئێمەیە، هیچ باڵندەیەک لەو ئاسمانە نافڕێت، ئەگەر ئێمە رەزامەندی لەسەر کردنەوەی باڵەکانی نەدەین. دوو بەردی خاڵخاڵی ناو زەوییەکی بە پیت و دوو پنچ و گرمۆلەیەکی دڕکی سڕی گیرساو بە لاسکی جۆی سالی پار و پاشماوەی لەوەڕ، نابنە هێلانەی قەتێ و هەوێردەیەک، ئەگەر سۆزی حەیرانێکی ئێمە نەرمی نەکات.
ئەوان لەوێ، تا چاو بڕ دەکات چەند باران بیگرێتەوە، داس و پاوان و حەیران و سروەیان دەیگرێتەوە. چەندی بیانەوێت، دەتوانن بکەین بە گوڵزار. دەشتەکە بکەن، بە هێلانە، یان راستتر بڵێین هێلانەکان دەپارێزن.
ئەوان، بە پیاوە عەنکاوەییەکە دەڵێن وەرە لێرە بژی. ژیان لێرە راستە وشک و رەقە، بەڵام بواری شیرینی زۆرە. وەرە ئەو سامان و پارەی زەکاتی لێ دراوە و حەڵاڵە بەو دەشتەی بدە، بە مەڕی باش، مەڕی زۆر بکڕە. بەرانیان بۆ بکڕە. ئەدی

مـەڕ نەبـوو مرۆڤایەتی دەربـاز دەکات و حەزرەتی ئیبراهیـم بەرامبەر کردگار رزگار دەکات، بەرخێکی دەکاتە قوربانی!
پیاوە عەنکاوەییەکە، چەند رۆژێک لەو دەشتە وشکە، لەو دووریيەی هیچ بۆنی خوێن و برینـی مەسـیحی پێوە نەبـوو، دەمینێتەوە. بۆیە لەناخەوە، زۆرتر دادەوەشـێت، بەڕاسـتی پەشـیمان دەبێتەوە، ژن و کیژەکانی پەریشـان و عەودالتر دەردەکەون، بەڵام کەس یەخەی ناگرێت، کەس دەسـتی پیرۆزی ماچ ناکات و کەسـیش نەفرەتی نـاکات! شـەوانە، هاوین بوو، لە سـەربانی دیوەخانـی کوێخای گوندەکە، سـەیری حەوشـە گەورەکـە دەکات. هەمـوو جووڵـە و ژیانی ناو ژوور و کۆڵیـت و تەویلە و عەمبـارەکان دەبینێـت. کەس و هیچ ئاماژەیەکی خـودا و ئایین و کتێب و نوێژ لەو پێکهاتەیـە، لەناو خەڵکەکە بـەدی ناکات! باش تێدەگات ژیان و چاوەڕوانی باران و سـەلامەتی ئاژەڵـەکان و بەژنی گەنم، تاکە هیـوا و چاوەڕوانی ئەوانە! ئەوانە نازانن کـەی بـوون بە موسـڵمان، نازانن باپیرانیان بۆ بوون بە موسـڵمان، چەند سـاڵ و گۆڕان و سـەردەمی ویسـتووە تا دەگۆڕێن، تا رەنگێکی تر دەگرن، بۆ ئەوەی بتوانن موسڵمان بن.
بندیانـەکان، زووتـر خێزانێکی گەورە بـوون، پەشـیمانییەکە، گۆڕانەکە بە زیرەکی دەکـەن، بۆیـە سـەرەتا لە کڵێسـا و زامی مەسـیح و ئاوێنەیـی رووی مریەم دوور دەکەونـەوە، زۆر دەڕۆن، لـەو کاروانـەدا زۆریـش بـە هەتاوەکە دەسـووتێن، بەڵام بێباک دەڕۆن. ئایین، بێجگە لەوەی ئیمان و بڕوابوون و هەڵوێسـتە، کار و فەرمانە، رەنگیشـە! بـە منداڵی، بـە کۆرپەیی، لەبەر خاتری شـیری دایک و سـۆزی باوکت ئیمانـدار دەبیـت، دوور نییە کە گەورە دەبیت و بیردەکەیتەوە، لەوەیان، لەو بڕوا و ئیمانە دوودڵ و نیگەران بێت. بەڵام سـڵێوە گەورەیە و ئیمانی دەگۆڕێت، کاسـبە و ناسراوە، منداڵی گەورەشی هەیە، برسی نییە، رووت نییە، ئیمانداریشە، وا بووە بە موسـڵمان، زووش لەسەر ئەو ئیمان و ئایینە دوودڵ و پەشیمانە!

***

ژن و کیژەکانی، یان پیاوەکە ناتوانێت بەرگری ئەو ژیانە بگرێت! زوو وەک دارێکی وشـک و تەبارەیەک لەبەر هەتاوەکە دەسـووتێن، کز دەبن، دەلەرینەوە. ئەوان لاواز بوون، ژنەکە دەگریا و خاچی لەسـەر سـینگی دادەنا و کیژەکانیش یەکیکیان ناوی مریەم بوو، لە باوکی دەپاڕێتەوە:

بابە، سـلێوەکە، تۆ بۆ ژیانی ئێمەت شێواند، بۆ دەربەدەرت کردین! ماڵمان دڕکە و ئاسـمانە خوێنە، دونیا بووە بە دوژمن و نەیار!

بە رۆژ گوندەکە چۆڵ بوو، دەشتەکە ئەوەندە بەرین و پانە، کەس کەس نادۆزێتەوە، کابرا کەس نادۆزێتەوە، کەس نییە قسـەیەکی لەگەڵ بکات، هەر هیچ نەبێت رێگای گەڕانەوەی نیشان بدات!

ناکرێ لەبەردەم کەس، لەبەر خۆی بڵێت ئەوە میللەتە چۆن دەزانن وا بژین. دەتوانن وا کاسبی بکەن، چۆن دەتوانن موسڵمان بن!؟ هەرگیز بڕوا ناکەم موسڵمانم، ناتوانم ناوی کەسـایەتییەکانی ئەو ئایینە فێر بم و بیناسـم، قسـە و ئایەت و مەرجەکانی زۆرە! بەرگەی ئەوە گۆڕانە، ئەو راچڵەکینە ناگرم! زۆر دوور کەوتوومەتەوە، دەترسم دوورتریشـم ببـەن، یـان خـۆم داوا بکەم دوور برۆم و ببمە سـەراب، لە سـەرابیش ناسکتر و نەرمتر!

***

**دەقی دووەم**

گونـدی عەنـکاوە سـەر بـە قـەزای هەولێـر کەسـێک بەنـاوی سـلێوە یەکێکە لە دەوڵەمەندەکانی عەنکاوە لە ئایینی ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە، بۆ هیچ شوێنێک ناڕوات و لەگەڵ هیچ کەسێک قسە ناکات، هەر چەندە بەپێی نووسراوی١٧ رەمەزانی ١٢٦٤ داوای کـردوە بچێتـە دەرسـەعادەت، بـەڵام وا باشـترە بنێردێتـە دیاربەکر و لەوێ زیندانی بکرێت، بەپێی فەرمانی پاشـا نابێت بچێتە هیچ شـوێنێک و زیندانی بکرێت، بـۆ ئەو مەبەسـتەش نووسـراوە، لە وەڵامیشـدا هاتووە ئەگەر ناوبـراو لە زیندانیش بێت، ئەوا پلەی مەردە و نەخۆشـە، ئەگەر ناوبراو نەچێتە مەملەکەتی خۆشـی ئەوا پۆلیسـێک هاوەڵی دەبێت و بۆ شـوێنێک بیبات و نیشتەجێ بکات.

**٩ رەمەزانی ١٢٦٤**

**والی ئەیالەتی کوردستان**

***

زۆرتر لە ١٧٥ سـاڵ نامە و داوایەک بە مانگی رەمەزان، لەسـەر سـلێوە نووسراوە، بەسـتەزمانەکەی نەیزانیوە بۆ دەبێتە موسـڵمان. دواییش بۆ پەشـیمان دەبێتەوە، چەند لەسەر ئایینە نوێیەکەی ماوەتەوە، چەند نوێژی کردوە. بەڕاستی فێری نوێژ و ئایەت و هیچ حەدیسێکی پیرۆز بووە؟ یان زوو کە ژن و کیژەکانی دەزانن، تێدەگەن

سـڵێوە لە ئاییــنی باوک و باپیرانــی هەڵگەڕاوەتەوە، نەفرەتی دەکــەن. ئەوان یان خەڵکی عەنکاوە! بۆیەش پەشـیمان دەبێتەوە؟
دوو دەق و داوا و هــەواڵ لەســەر ئــەو پیاوە داماوە دۆزراوەتــەوە، لەناو کتێبەکەی هەولێــر تۆمارکراوە. یەکەمیان پەریشــانی والی بەغدایــە، دیارە تووڕەیە، بەڵام دیار نییــە لەکــوێ داوا دەکات، بــەڵام دیــارە چی دەوێــت. دووەمیان لە والــی ئەیالەتی کوردستانەوە نووسراوە:
لە پیاوەکە توڕەن، حکومەتی بەغدا، لەســەر زمانی والی، لە هەموو بەڵگەنامەکانی تــر هیچ نامە و هەواڵێک بەناوی والی ئەیالەتی کوردســتان بوونی نییە، لە کتێبەکە تاکــە ئیمــزا و راســپاردە بەو پۆســت و ناوە کــراوە، ئەویش هەڕەشــە و چاودێری داماوێکە، ســەری هەموو دونیایان لێ گەمارۆ داوە، نازانێت روو لەکوێ بکات! چیتر لە عەنکاوە ژیانی ئاسایی و کار و پیشەکەی نەماوە. لەناو هەولێر جێگای نەبۆتەوە، چوویتــە گوندەکانی بندیانان لەوێ نەژیاوە! گەڕاوەتەوە ناو هەولێر، تێدا نەیتوانیوە ئاســوودە بژیــت. لە ســەدارەت و باب عالــی داوایان دەکەن، یــان خۆیان دەیانەوێ بچنە کۆشــکی یەڵدز و پاداشــتی بوونە موسڵمانەکەیان وەربگرن، یان بواریان بدەن ئاسایی بژین!
- ژنەکــە، کیــژەکان من باوکتانم، دەزانم ئێوەش منتان لا گەورەیە، منیش بۆ ئێوەیە دەمــەوێ قوربانــی بدەم، کۆشــش بکــەم! واز ناهێنــم! «چاوەکانــی ماندووبوون و هەراســانی، بەڵام سەرکەشی تێدا بەدی دەکران».
- چ دەکەیــت؟ «هەمــوو ئەو رازە دەدرکێنن، بەڵام دەنگیان بریتی بوو لە نوزەیەکی کز و باریک».
- دەڕۆین و دەگەیەنە خزمەت ســوڵتان! «سڵێوە دەبێژێت».
- چۆن! «ئەو ئامادەیە هاوشــانی بێت، ئامادەیە».
- با بڕۆین!
- بۆ کوێ؟
- بۆ ئەو شــوێنەی خۆم دەدۆزمەوە، ئەوانیش من دەناســن! خۆم یەکلادەکەمەوە.
- زۆر دوور دەڕۆین؟ «یەکێک لە کچەکان دەپرســێت، بەڵام زۆر سەرســام و شڵەژاو دیارە».
- ئەگــەر دوور بڕۆیــن و مانــدوو بیــن، لەیەکتری، لە ئــەوان، لە عەنــکاوەش نزیک

دەبینەوە!

***

ژنەکەش ڕۆژێکیان لەو کاروانە دوورە، یان تازە لە سەرەتای کاروانەکە دەبن، لەناو دیوەخانـی ئاغایەکی ناوچـەی مزورییەکان، گەردییەکان، زووتـر هاوڕێی مێردەکەی بوون، سۆزی بۆ دەجوولێت:
«سـلێوە، من لە کلێسـایەکی پیرۆز، چاوم لەبەر ڕووناکی پەنجەرە بچووکەکە بوو، سـەرم ئەوەندە بەرز بووە، بەڵام نەدەگەیشـتە بنمیچەکە، چەندی دەمویسـت زووتر دەستم بگاتە ناو دەستت، ئەوەندە و زۆرتریش ئارەزووم بوو، زووتر قەشەکە، ناومان بەیەکەوە بڵێتەوە! لە پیرۆزیی ئەو شـوێن و ڕۆژە، بەو دوو پێیە ناسـکە ڕووتەوە، بە دەسـتی ئەو دوو پەڕەسـێلکەی پەڕیان ببووە باڵ و ئێمەیان بەرز دەفراند!».
«ژنەکە، بە چاوە ماندووەکانت سوێند دەخۆم، بە چاوە کز و خامۆشەکانی هەردوو کچەکـەم لـەو کاروانە درێژە سـەختەدا، بـارم گەنجینەیەکی گرانبەهایە، شـەرەفە، ویژدانە، پەشـیمانییە، دەربازبوونە سـوێند و پەیمان و کۆشـش دەکەم، لەو گێژاوە بەرگەی لێشاوەکە بگرم و بپەڕمەوە».

***

ئەوان دەڕۆن، لەسـەر ئەو بەڵێنە، بەیەکەوە فەرمانیان پێیە، پاسـەوانیان لەگەڵە، یان پاسـەوانەکان بە شـیرینییەکی کەم، تەنیا بەشـی ئەوە بکات ماوەیەک زمانیان شـیرین و سـەریان کەش بکات، دەڕۆن و کۆترەکانی ڕۆحیـان بەڕەڵا دەکەن! چوار کۆترن. کۆترێک زۆر ناتوانێت بە ئاسـمانەوە بمینێتەوە، ئاسـمانی هەراسان کردوە، بۆیە باڵەکانی کە ماندوو دەبن، تیشـکی هەتاو وزەی پێ دەبەخشـێت. دەگەنە ئەو هەوارە.
لەوێ زوو پێیان دەڵێن:
میوان سـەر چاوان، ماڵمان گەرمە، ئاومان سـازگار، شـەومان پڕ ئەستێرەیە، بەڵام ئەگـەر دەتانـەوێ بچنـە گوند و نـاو خێزانی مەسـیحییەکان. دەتانەوێ سـەردانی کلێسـایەک بکەن. لەوێ لەبەردەم خاچەکەی بنووزێنەوە، مۆمێک داگیرسێنن، چەند هەنگاوتـان مـاوە بڕۆن! دوور نییە، گـەور و پێچێک و هەورازێکتـان ماوە، دەگەنە گوندێکـی جوان، ڕەز و کانیاوێکی شـیرین. خەڵکی گوندەکە هەموویان مەسـیحین، کلێسایان ئاوەدان، ئەگەر با و باران نەبێت، جاروبار گوێمان لە زەنگی کلێساکەیان

دەبێت! لە ئێمەوە نزیکە، هەست بەو دەنگە شیرینە، بەو سەدایە پیرۆزە دەکەین. بڕۆن، ئەگەرنا هەموو گوندەکە، ئاو و کانییەکانیان وەک میوە شیرین نەبوو، بگەڕێنەوە سەرچاوانمان.
کابرای میوان، سلێوە نالێت نا ناچین، نالێت راستە من عەنکاوەییم، ژن و دوو کیژەکەم مەسیحین، بەڵام خۆم بوومەتە موسڵمان، ئیشم بە کڵێسا نەماوە، یان راستتر بڵێم ئەوان دەریانکردووم، ئەوان هیچ جۆرە سۆزێکم پێ نابەخشن، وشکن قبووڵی نیگای چاویش ناکەن سەیرم بکەن! بۆیە شەوەکەی لەوێ دەمینێنەوە، دواتر تا بواری بەڕێکەوتن دەدۆزنەوە و سەفەرەکەیان ئاسانتر دەبێت، لەوێ چاوەڕوان دەکەن و دەمینێنەوە.
ژنەکە، ژنەکەی نەبووە بە موسڵمان، هێشتا مەسیحییە، ئەو شەوە لە دیوەخانەکە گەرم دەخەوێت. شوێنەکە ئارامە، ترس و هەڕەشە و ناڕەزاییەکانی خەڵکی عەنکاوەی لێ دوورە. باش دەخەوێت، لەنێوان هەردوو کچەکەی دەخەوێت. خەوێکی گران و شیرین. ئەو شەوە لەو خەوەدا، لە نووستنی بەرامبەر پەنجەرەکانی دەیڕوانییە رەزێکی تەڕ و فێنک و کەسکی هەنار و ترێ. دەوەنەکانی شەو نەخەوتن و هاشەیان هاتووە، بەو قەدە باریکە کورتەی خۆیانەوە، سەمایان بۆ ئاسمان و ترشبوونی هەنار و شیرینی هەنجیر کردووە! بەرامبەر هاژەی ئاوێکی سپی سارد و تەقەتەقی ئاشێکی گەورە. چۆن ئاوی نەرم و شیرین، ئەو بەردە رەقە گەورانە دەخولێنێتەوە؟ بەئاسانی و لەسەرخۆ گەنمەکە دەهاڕێت، ئەوە دەپرسن، ئاردە سپییەکە دەبێتە چەند نانێکی گەرم و ئاسوودەیان دەکات، لە بوارە سەختەکە دەربازیان دەکات.

***

ژنەکە لەو شەوەدا خەونێک دەبینێت. لەو خەوەدا سلێوەی مێردی، ئەوەی بە پیرۆزی کڵێسا هاوژینی بوو، بەڵام کە دەبێتە موسڵمان ئەو پەیوەندییە خاو دەبێتەوە و دەکرێتەوە، دەبێتە دوو گرێی ئاڵۆز و بەدحاڵ، بەڵام ناپسێن، ناکرێنەوە، پەیوەندییەکە ناپچڕێت! خەون دەبینێت، کە سلێوە، لە خەوە قورسەکەی لەمێژە وا نەخەوتووە، هەڵدەستێنن، بواری نادەن جەمەدانییەکەی ببەستێت، چاوێک لە خەوتنی دوو کیژەکەی بکات، بواری پێیەکانی بدۆزێتەوە، سەری بخورێنێت، هەردوو چاوی یان تەنیا چاوێکیشی هەڵپشێوێت.
توند دەیگرن، دەیگرن، کێ دەیگرێت؟ هەزارەها دەست و مەچەک. دەیگرن دەیفڕێنن.

لە درزی دیوارە ئەستوورەکە. لەنێوان ڕەنگی پەنجەرەکە و شووشە زەلاڵەکە. لەناو دووکەڵکێشــە باریکەکە، رایدەکێشــنە ناو داران، ســەر ئاوەکە و دەیبەن. دەیبەن و بــۆ ئــەوەی بڕوات و قامەتی نەشــکێت، مســتێ ئاوی لە هەناوی دەکەن. دوو ســێ دانــە زەیتونــی کەســکی دەدەنــێ. دەڕۆن و پەلکێشــی دەکەن، لە چەنــدان چیا و وڵات و دەشــتودەر دووری دەخەنەوە. هەر بەو شــەوە کورتە، لەو خەوە شیرینەدا، ژنەکەی دوو کیژەکەی لە ئامێزە، ئاگاداری مێردەکەی بوو کە دەیبەن. ئەو ئاســان بــە پێیەکانــی دەڕوات، دەڕوات و دەگاتە؛ ئەســپ و ڕم و هەنگاوەکانیان و دەیبەن و دەڕۆن!

هــەر بــەو شــەوە کاروانە گەورەکــە، هاتوهــاوار و بانگ و ســەدای هەزارەها کەس، ئەوانــەی هاوڕێیەتــی دەکــەن، خەڵــک هەبوو؛ لــە دوورگەی «کۆرفــۆ»ی یۆنان و شــەقامێکی باریکی ڕۆما و جوتیاری گوندێکی قەراخ دەریای سیســیلیا، خەڵکی ناو شــاری لەندەن و کریستیانێکی بەیروت، دوو سێ کەسی دیانەکانی هەولێر و بادینان ــئەوان ڕێنیشاندەری دۆزینەوە و شــوێنهەڵگری بوونـ و مەسیحییەکانی ئەسکەندریە و باشووری سودانیشیان لەگەڵدا بوو.

خەڵکەکە، ڕێپێوان و هەڵمەتەکە، ڕەش و ســپی و ئەســمەر و زەرد، لووت گەورە و ورد و باڵابەرز و کورتە باڵای بۆرما و تایلاندیشیان لەگەڵدا دابوو. ژن و پیاو و پیر و قەشــەی کەوا ڕەش و ریش گەورە و داربەدەســت، ئەســپ و مەڕ و بزن و باڵندە و دان و ئاویان پێ بوو. لەشــکرێکی گەورە بوون، ســوپایەکی نەبەزیو بوون. ئەوانە بــوون لە شــەڕەکانی مانەوە و خۆڕاگــری قەڵاتەکانی ئەورووپا و کڵێســا بەرزەکانی ســەر کەنارەکانی دەریای ســپی ناوەڕاســت مابوونەوە، ئەوانەی بەجەرگ و ئازایانە بەرگرییان کردبوو. لەشــکر و خەڵک و زیندەوەر و کەســە گیراوەکە، دەگەنە بەردەم خاچەکــەی مەســیح. بەپێی خۆیــان و زیندوو، دەگەنە بــەر ژان و خوێن و دڵڕەقی خەڵکەکــەی مەســیحی دامــاوی بــێ باوک لــە خــاچ دەدەن. لەوێ ئەویــش دەگاتە بەرجەســتە و خاچ و ئازار و خوێنی ڕژاوی حەزرەتی مەسیح.

سڵێوە دەبەنە بەر دارەکە، خاچە زامدارەکەی مەسیحی پێوە بوو. ژنەکە بەو شەوە و لەو خەوە دەبینێت، هێشــتا پەتەکە لە جەســتە زامدارەکە ئاڵاوە، هێشتا تەرمەکە ماوە، هێشــتا نەچووە بۆ ئاســمان. ســڵێوەی تاوانبار لەبەردەم دار و ژان و خوێن و زامەکان رادەگرن، پەتەکان لە جەســتەی مەســیح دەکەنەوە، جەســتەی ئەوی پێ

دەبەستنەوە. بەڵام جەستەی ئەو بەستانەوەی نەدەویست، خۆی بەسترابووەوە. تاقەتی هەناسە و ڕۆیشتن و دەربازبوونی نەمابوو. نەیدەتوانی لەبەردەم رم و بەرد و هەتاو و سەرماش خۆی دەرباز بکات. «یەکێک دەیگوت» مەیبەستنەوە، تەواو بووە. لەوەتی بڕیارەکەی داوە و بوونە بە موسڵمان و شەهادەی هێناوە، تەواو بووە. «نوزەیەکی ماندووی ڕێگا دوورەکە دەڵێت» تاوانەکەی گەورەیە، سێ مرۆڤی پەریشانکردووە، لە داری بدەن، سێ ڕۆحی کوشتوە!

ئەو رادەگرن، تا یەک یەک بزمارەکان، هێشتا ژەنگیان نەگرتبوو، تیژی و شەوقیان نەڕۆیشتبوو، لە جەستەی مەسیح دەردەهێنن، پێویست ناکات تیژی بکەنەوە، گەرمیان بکەنەوە، بیبەنەوە سەر کوورە و بەر ئاگردان و دەستی گەورەی ئاسنگەر، میخەکان بۆ کوتانی جەستەی ئەو گەرم و تیژن! توند و ئاسان لە جەستەی سڵێوەی دەدەن. لەگەڵ یەکەم بزمار و یەکەم تەقەی کوتکەکە سڵێوە دەمرێت. دەڕوات ئیمانی لاواز بوو، بڕوادار نەبوو، زوو بە بزمارەکە بەر لە خوێنەکە پێش شکانی ئێسقانەکە، دوایی بەستنەوەکە، لەگەڵ بردن و دەرچوونەکە تەواو دەبێت!

ژنەکە لەو خەوەدا، لەناو دیوەخانە گەرم و هەوارە خانەدانەکە، بەدیار مردنی سڵێوە بوو. ئەو لەنێوان هەردوو کیژەکەی بوو، خەوتبوو، بەڵام هەموو کوتکەکان بە سەری دەکەوتن، بە جەستەی دەکەوتن، بە هەردوو چاوی دەکەوتن!

ژنەکە لەو مردنە بە ئازارەی سڵێوە، لەگەڵ سووری و شەوقی خوێنی جەستەی سڵێوە، ئەوەی لە کڵێسا پیرۆزەکەی عەنکاوە بەیەکەوە هاوسەرگیریان کردووە، لە خەوەکە رادەپەڕێت، ڕاپەڕینێکی گەورە لە دڵ و هەناسە و ڕۆح، بەڵام نەرم و لەسەرخۆ نەوەک دوو کیژەکە، سڵێوەی داماو لە خەوەکە بترسێنێت! سەیری هەوارە گەرمەکەی ئەو دەکات، دڵێکی ماندوو، جەستەیەکی گەورە خەوی لێکەوتووە! خاچێک لەسەر سینگی دادەنێت و شادمان سەر دەکاتەوە سەر بالیفە نەرمەکە و پەنجەیەکی بە تەڕی و ئاوی چاوەکانی دەکەوێت. بەر لەوەی ئاگای لە کشانەوەی پەنجەکەی بێت خەوی لێ دەکەوێتەوە.

***

کاروانەکەی ئەوان درێژ و سەخت بووە. گاڤێ لەناو زیندانێک ژنەکە گیراوە، زۆریش دوو کیژەکەی زەلیل دەبینران. خەونەکانیان دەبێتە سەراب و دەڕەونەوە، کە ئەوە دەڵێم مەبەستم روونە، ئیتر هیوا و ژیانیان بۆ ناگەڕێتەوە. ژنەکە داماوە، زۆرتر

دەنوزێتــەوە، ســڵێوە دیار نییــە، ئەو لــە ژوور و بەندینخانەیەکی تــرە، یان زووتر گیراوە. سەرکەشــە دەیەوێ بڕوات و مافەکانی خۆی وەربگرێتەوە، دووبارە ئاســایی بژیت. ســامان و بازاڕ و دەســتمایەکەی بدۆزێتەوە. دەڕوات و زۆر دەڕوا بۆ ئەوەی بگاتە هەوارێک، شــوێنێک بڕیارێکی بچووکی لێ وەربگرێتەوە!

ژنەکــە تونــد یەخــەی دەگرێت، گریاو و چاو بە فرمێســک، لاواز و ســیس، شــانی دەتەکەنێــت، رووبەڕوو ســەیری چاوەکانی دەکات، چاوەکانــی وەک خورما جوان و شیرین بوون، وا بوون بە دانەیەک لە قەسپی رەقی کرماوی! دیسان دەیدۆزێتەوە و سەیری چاوەکانی دەکات:

پیاوەکــە دەربــەدەرت کردین! خۆت و ئێمەت ســەرگەردان کرد، لە چیمان کەم بوو. عەنــکاوە بــۆ ئێمە بەقــەد ڤاتیکان پیرۆز بوو. «ناســرە» و «بیــت لەحم»ی ئێمە بوو. لەوێ وەک ئەوەی لە کڵێسای مەهد نزیک بین، لە مەزار و شوێنەواری مەسیح نزیک بین، بۆنی ئەومان دەکرد. لە عەنکاوە، باران دەباری بۆ ئێمە بوو. شــەوەکان بۆ پشــوودانی ئێمە بوو، بۆ ئەوە بوو بەیانی هەڵبســتینەوە و سەیری دەستکەوت و بەرهەمی ماندووبوونی تۆ بکەین!

پیاوەکە، هەموو دونیا لە ئێمە نزیک بوو. لەناو رووبەرێکی تەســکدا، لەناو دوو ســێ تەبــارە و عەمبــارە گەنم و خانووێکی بچووک، دونیایەکــی گەورەمان دەبینی. ئازاد بووین. یەک بســت دەڕۆیشــتین دوو شــارمان دەبڕی. چاومان هەڵدەبڕی دەریایەکی بەرینمــان ئاودیــو دەکــرد! رووبەرە بچووکەکــە دونیایەکی گەورە بــوو. پیاوەکە لە چیمان کەم بوو! توخوا بوار ماوە بگەڕێینەوە، بۆ قبووڵمان ناکەنەوە؟ بۆ نەفرەتمان دەکەن، بەس نییە من نەفرەتم کردی؟ چاوی هەردوو کچەکەم و نوزانەوەیان، بەس نییە، ئەوە نیشــانەی پەشــیمانی و بەزەیی نییە؟ بەستەزمانی و رووتی ئەوان بەس نییە!؟ ئەو کڵێسایە، قەشەکانمان بۆ ئەوەندە دڵڕەقن، بۆ ئاسوودە و ئارام نابنەوە، یــەک تۆز، هیچ بەزەیی مەســیحیان لــە دڵدا نییە. هەموو بزمارەکانی لە جەســتەی ئەو دراوە بەر جەســتەی ئێمە کەوت! درک و بواری ســەختی نیوەی دونیامان بڕی، بەو سزایە پاک نەبووینەوە. تاوانەکەمان بچووکە، بەڵام سزاکەمان ئەوەندە قورسە، بەرگەی تاوان و کوفری زۆرتر دەکات، ئێوە بوارمان دەدەن، هانمان دەدەن گوناهی زۆرتر بکەین. ئەدی کەی ئەو سزایە؟ لە سزای مەسیحیش توندتر و دژوارترە. بەس نییــە، یــان دەتانــەوێ زۆرتر بچینە ناو زەلــکاوی تاوان، تاوانیــش، زنجیرەیە، یەک

بەیەکتری بەستراوەتەوە. دەستمان بگرن، با لە برسانا دزی نەکەین. قاچمان بگرن، تـا نەچینــە ناو موڵک و باخ و سـێبەری حەرام! زوو لێمان ببوورن با زۆرتر تاوانبار نەبین! سـزایەکمان بۆ ببڕنەوە، هەزار جار بەقەد گوناهەکە بێت، ئێمە رازیین!

***

باوکـە، ئێمە بە ئاگری تۆ سـووتاین، لەسـەر ئەو دونیایە بووینــە خەڵووز، بووینە دووکەڵ و بە سـەر ئەو ناوچەیە پەخشـان بووین. تازە بچینەوە ناو ئەشکەوتەکەی، سـەرچاوە کۆنەکانی کریسـتیانەکان دەڵێن عیسـای تێدا لەدایکبووە. بەڵام قورئان دەڵێـت نـا مریـەم لەبن سـێبەری دارخورمایەک، پشـتی دەداتە قەدەکـەی و ژانی لەدایکبوونــی لــێ بــووە، لەوێ عیسـا هاتووتە دونیـا و گەردوون روونـاک بۆتەوە. بابچینەوە بەر ئەو دوو شـوێنە پیرۆزەش، لەوێ نزا بکەینەوە، رێگا و تەمەن بەشــی ژیانی بۆ ئێمە نەهێشـتووتەوە! «کیژەکان بــە نوزانەوە دەڵێن» ئێمە، هەردووکمان وا گــەورە بووین، هەناســە و ژیانمان نائومێــدی و مایەپووچییە! نازانین لەو کاروانە بە حەڵاڵی شـوو دەکەین، هاوسـەرگیری جوان دەکەین، یان چەتەکان دەمانفڕێنن و لە بازاڕی کەنیزەکانا دەستاودەسـت و بە پارە و قازانج دەمانفرۆشنەوە!
تۆی بێ دەسـەڵات، هیچ پشـتیوانێکت نییە، پێغمبەر و کتێبێکی پیرۆزت نەما، کێ دەتپارێزێـت، کەسـت نەما، ناوی باوکـت بەناوی خۆتەوە قرتـاوە، ناوی عەنکاوەت پێـوە نەمـاوە! کـێ بەرگری لە ئێمــە دەکات، تۆ بەرگری خۆت پــێ ناکرێت، کەس بـڕوات پــێ نـاکات! چەکــی بەرگری لەو زەمانە کەسـوکار و برا و پسـمام و زاوا و عەشـیرەتە. هــاوار و نزاش بــۆ پێغمبەر و کتێبی پیرۆزە... تــۆ هیچت لەوانە نەما! مایەپووچ و بێ دەسـەڵات و دیلیشی تۆ.

***

پیاوەکە و دوو کیژ و ژنەکە بەدوای چەکدارێکەوە دەڕۆن، یان چەکدارەکە چاودێریان دەکات! شـەوانە ئەوان لە داماوی و کەساســی خۆیان خەویان نییە، چەکدارەکەش خــەوی نییە، نــەوەک ئەوان خۆیان بدزنەوە، دوور بکەونــەوە و دووبارە بچنەوە ناو کڵێسـایەک، بچنە بەر خزمەتی مۆمێکی گەش، لە دیار جەسـتەی بە ئازاری مەسیح بپاڕێنەوە. بیانەوێ بزمارەکانی جەستەکەی دەربێنن. بیانەوێ دڕکە تیژەکانی سەری نەرم نەرم راکێشـنە دەرەوە و ئازاری سـووک بکەن، تا بەهانایانەوە بێت و تاقەتی ئەوەی هەبێت، نزا و تیمارێکیان بکات! تا لێیان ببوورێت، تا بەیەکەوە ئاشـتبنەوە.

باوکە، ئاشتمان بکەوە، هەموو گیانمان بزمارە و دەڕۆین، چاومان کوێرە و دەبینین. چیمـان بەسـەرهات، لەناو قشـڵەیەکی بەردینـی کۆن، دەمانبەنە نـاو یەکێکی تری دەرگا ئاسنی تاریک، دەچینە زیندان و بێ گوناح و تاوان دەردەچین. لە کاروانسەر و خانـی مانەوەمـان مەرگ دەبینین، چیمان کـردووە، تۆ چیت کردووە، بۆ ئەوەندە زیندانەمان پێ دەکەن!؟

لەوەتی سلێوە بڕیارەکە دەدات. کە ژنەکە دەزانێت، لەو ڕۆژەوە بەیەکەوە نەخەوتوون. بـۆ یەکتـری حەرام بوون. دوو کەسـی جیاواز، ئەوانەی بەیەکـەوە حەڵاڵ بوون، بە داوای پیاوەکە و بە موسڵمانبوونی، لە ژنەکەی حەرام دەبێت. یان هەردووکیان چیتر ئارەزووی یەکتری ناکەن، خەمیان زۆر بووە و دڵیان بەو سەرمایە، بەو گەردەلوولەی تێیکەوتـوون ناکرێتـەوە! چۆن ژنێکی مەسـیحی هەوری لەسـەری ناسـک و دایکی دوو کیژی پارچەڵە، ورد، شـیرین، خوێندەوار دڵی دەچێتە پیاوێکی موسـڵمان. با هەر ناوی سـلێوەش بێت؟ با چەند سـاڵ پێش ئێسـتا لە کلێسای سەر گردەکە. لە قەسـرەکە. لەوێ قەشـەکە هاوسـەرگیرییان پیرۆز دەکات، وەک چۆن هاوسەرگیری حەزرەتی ئیبراهیم و سـارا، هاوسـەرگیری ئیسـحاق و ڕەفقە، هاوسەرگیری یەعقوب و ڕاحیلـی پیـرۆز کـراوە! بەڵام ئێسـتا حەڵاڵی یەکتـری نین! هاوسـەرگیرییەکە وا هەڵوەشـاوەتەوە، ئاسان نییە ببەسترێتەوە، بکرێتەوە و پیرۆز بکرێتەوە.

***

کلێسـا و ڕێنماییـەکان و پیاوانـی ئایینـی جیابوونەوەی ژن و مێردی بە ناپەسـند و نەشـیاوی ناسـاندووە. کە هنری هەشـتەم پاشـای بریتانیا قسـەی پاپا لە ساڵی ١٥٣٤ی زاینـی دەشـکێنێت و کاترینی هاوسـەری تەڵاق دەدات، کلێسـایەکی نوێی لـێ دەکەوێتـەوە. بۆیە لە کۆنـەوە جیابوونەوە ئەوەندە ترسـناکە. بـەڵام ئەوە لە عەنـکاوە نەکـراوە. سـلێوە، کلێسـا تەڵاقی بـۆ تۆ ڕەفـز کردبوو، بـەڵام تۆ منت تەڵاقـدا. منـت لە پیرۆزی خۆمان دەرکرد. ژنێکم هیـچ پەیوەندییەکم بە تۆ نەماوە، بـەڵام چارەم نییە هاتووم، بەگەڵت کەوتـووم. تۆ دەگرن و دەمینێیتەوە و دادگایی دەکرێیت و بەڕەڵاش دەبیت. من هاوڕێی تۆم، هاوشـانی تۆ بوخچەم لەسـەر شـانە، پاسـەوان و چاودێری دوو کچەکەمان دەکەین! تۆ ون دەبیت و سـەرئاو دەبیتەوە، دەربـاز دەبیـت و دەگەڕێیتـەوە. چـاو دەگێڕیـت و دەپرسـیت و لەنزیـک خۆتەوە

دەماندۆزیتــەوە! ئێمە دوور ناکەوینەوە، ناڕۆیــن، بچینە کوێ!؟ کێ وەرماندەگرێت؟ کێ راماندەگرێت؟ هەموو دەماننناســن. دەناســرێین. دەزانــن پیاوەکەمان باوکی دوو کیژەکــە، دەوڵەمەندەکــەی عەنــکاوە، چەند رۆژێک، ماوەیەکی کورت، هێشــتا نزا و داوا و خواســتەکەی نەگەیشــتبووە ئاســمان کە دەبێتە موســڵمان، مەلائیکەتەکان فەرمانەکانیــان نەبردبووە ئاســمان، بەئاشــکرا پەشــیمان دەبێتەوە. هێشــتا داوا و شەهادەکەت لەناو عەنکاوە دەرنەچوو بوو، کە دەبێتە موسڵمان موڵک و سەرمایەت مۆرانــە تــەواوی دەکات. باران دەیڕزێنێتــەوە، گەرما دەیســووتێنێت و مایەپووچ و برسی دەردەچێت. ئەو زووش پەشیمان دەبێتەوە! بۆیەش لە هەردوو ئایین دەبێت، نەدەتوانێت ببێتە موســڵمان، نەدەتوانێت بگەڕێتەوە بەر پەیکەرەکەی مەســیح و نزا بکات. ئاســان نییە پیاوێکی بە تەمەن و بە ئەزموون، بەیەک بڕیار بگۆڕێت، بەیەک قســە بچێتە سەر بڕوا و عەقیدەیەکی تر!

ئاییــن تووتــن نییە بیکێشــیت و دەســتبەرداری ببیتەوە. ئایین لــە منداڵییەوە، تۆ هێشتا لەناو سکی دایکت کۆرپەلەی مرواری، چاوەکانت دروست نەبوون، پەنجەکانی دەســتت نەبــوون بە دە پەنجە. هێشــتا پەنجــەی پێیەکانت، پارچەیەک گۆشــتە و نەبــووە بە دە پەنجــەی کورت. دڵت دڵۆپە خوێنێکە، رێخۆڵەکانت شــلەیەکی لیچی نەرمە! هێشــتا ســەرت وەک گوێی زەوی خڕ نەبووە! کەســیش دڵنیا نەبوو لەوەی گــۆی زەوی خــڕە، بەڵام ســەری ئەو کۆرپەیە دوایــی خڕ دەبێــت. لەودەمانە وەک گیانلەبەرێک ئایینێکی بەناو کراوە!

بۆ سڵێوە بەیەک قسە بیگۆڕیت و ژیانمان بکەیتە دۆزەخ!؟ لەسەر ئەوە، لەسەر ئەو وەرگەڕانــە، هەمــوو دونیایان بە ئێمە کردووە، هەمــوو زیندانێکی ناوچەکەیان بە تۆ کــردووە. چەند دەڕۆین ئەوەندە لە مەســیح نزیــک دەبینەوە، تۆش نزیک دەبیتەوە، بــەڵام کەس بــڕوات پێ نــاکات! وەرناگیرێیتەوە، دەســتت بۆ ئاگرێکــی زۆر گەورە بــردوە، هەزارەهــا باخ و مەزرا و گوندت ســوتاندوە، چیت کرد و چیت لەو دەشــتە قەومانــد، ئاگرێکــە بە کەس ناکوژێتــەوە. دوایی تۆ کوێت ماوە، کەســت لێوە دیار نییە. کەس پشتیوانت نییە، ژنێک و دوو کیژ نەبێت، ئێمەی مێینە، کە لەو دەڤەرە، لەناو سنووری ئەو دەسەڵاتەدا، مێینە؛ کەنیزە و جاریە و هەوەسە، وەک گۆشتێکی

نــەرم و شــل و بۆنداریــش، بۆنمــان دەکەن و دەمانگــۆڕن! دەســتیان پێمان گەرم دەکەنەوە، تاممان دەکەن، سەیرمان دەکەن، پیاوان بە جووتبوون و هەوەسەکانیان فەریزەیەکی ئایینیش جێبەجێ دەکەن.

***

بەیەکەوە ماوەیەک زیندانی قەڵاتی هەولێرمان بینی. لەوێ شــەوانە ئەســتێرەکانیش خۆیان لێمان دەشاردەوە! لەوێ قەڵاتەکە باڵای نەبوو، بەرز نەبووە، چاڵێکی گەورە، کۆنــە هــەواری بورکانێــک بوو، وەک ئەوەی ســەدان، یان هەزارەها ســاڵە تەقیوە. ئــەو قەڵاتەمــان لێ ببووە، چــاڵ و دوومەڵ و برین. عەنکاوەش ســەرابێک بوو، پێ و خەیاڵ و ویســت و ئارەزووی پێ نەدەگەیشــت، نەماندەدۆزیەوە. دەچینە زیندانی موســڵ، ئەو شــارەی دەیان کڵێســای تێدا بوو، لــە بەرزاییەکان بــۆ فڕینی گیان و ڕۆح و قوربانییەکانی مەســیح زەنگی گــەورە و گرانبەهای هاوردەی زۆریان دانابوو. لەوێش بۆ بەغدا، والیەکەی بەغدا توندکارە، تووڕەیە، دوورمان دەخاتەوە. وادەزانن پیاوەکــە خــۆی دەدزێتەوە و دەیەوێ بگاتە ئەســتنبۆل. بەڵام دیــارە باڵی نەبووە، دەســتی نەڕۆیشتووە، تاقەتی نەمابوو، بەردەوام دەخرێتەوە ژێر چاودێری توندەوە. دەڕۆیــن و نازانیــن بــۆ کام هەوار دەڕۆیــن و چەند دوورین. چەندمــان ماوە بگەینە مەزارەکــە، هەوارەکــەی گوایــە دەربازمان دەکات! لــە بیرەکــە دەرماندەهێنێت، تا دەگەینە دیاربەکر و سیواس. لەوێ لەجیاتی پێشوازی و شانازی دووبارە دەتگرن و ئێمەش چاوەڕوانت دەکەین! ئێمە ریسوا دەکەن و تۆش ڕەزیل، تۆ برسی و ئێمەش ڕووت، ئەوان بەئەنقەســت دەیانەوێ ڕووت بین!

باوکــە چــۆن؟ بە چی و کەی دەگەڕێینەوە ســەر کارێــز و ئاوەکەی عەنکاوە؟ لەوێ دەبینەوە منداڵەکەی جاران، بە چاوی گەشــی بەختیار، ســەیری ماســییە وردەکانی نــاو جۆگەکە دەکەین و گەمە دەکەین! هەموو گەمەمان لەگەڵ دەکەن، وەک ئێســتا نییە، کەس قســەمان لەگەڵ ناکات، کەســیش نایەوێ گوێ لە نزا و پاڕانەوەشــمان ڕابگرێــت. لــە دەرەوە و دووریش لە دەشــتەکە، لەگــەڵ زەنگی کڵێســا ماڵەوەمان بەبیردێتەوە، تۆ دواکەســی ماندوو و شادمان دێیتەوە و دەرگای ماڵەوە دادەخەیت، ئیتــر لەنــاو ماڵەکەمان ئاســوودە دەخەوین! باوکــە کەی دەگەڕێینــەوە ئەو ژیانە؟

کـەی تـۆ دەرگامـان لەسـەر دادەخەیت و کەس دەرگا لەسـەر تۆ و بـەڕووی ئێمە بەتووڕەییەوە داناخات!؟
ئەدی باوکە بە فەرموودەی ئایینی مەسیحی تۆ لەگەڵ دایکم نەبوون بەیەک جەستە، ئاوێتـە نەبـوون؟ بـۆ وا جیابوونەوە، بۆ شـەقبوون، بۆ دابڕان؟ دیـارە تۆ دەتەوێ بچیتە مەککە و مەدینە!؟ ئەویش بچێتە ناسرە و کڵێسای مەهد!؟ ڕوانگەتان دوورە، ئاڕاسـتەتان زۆر لەیەک دوورە، بەڵام هەر بەیەکەوەن!
دایکـە، ئەگـەر باوکـم ئازاد بێـت و بگەڕێتەوە عەنکاوە، سـامان و موڵکەکانیشـی نەمینێت، ئامادەی دووبارە ببنەوە یەک جەسـتە؟! ئامادەی بچیتە کڵێسا بەرزەکەی سـەر گردەکە، ڕووبەڕوو لەگەڵ جەسـتەی بەزامی مەسیح، نزای چاکە و ئاسوودەیی بۆ بکەیت؟!
«هەمـوو شـتێکی بـۆ دەکـەم، ئەدی نابینـن وا چەند ئـازاری بۆ دەچێـژم، چەند ماندووم، چەند ویلایەتم بەدوای کردوە. ماڵە شێخ و تەکیەی پیرۆز نەماوە سەردانی نەکەم، چوومەتە ناو کەلاوەی کۆنە کڵێسـاکانی ئورفە و مێردین، سـەرپۆش و کز و کەساس بۆی دەپاڕێمەوە!».
پێیان دەڵێم سـەیری دەموچاوی مەکەن، سـەیری شـان و ڕوومەتی مەکەن، مەبینن دەڕوات و پۆشـتەیە، ئـەو پیـاوە پاش ئەو بڕیارە شـەکەتە، لەبەر ئـاوە، گەرما و هەتـاو و ئارەقـە دایوەشـاندوە، نەماوە، چیتـان لێی دەوێت بـەڕەڵای بکەن! ئێوە وادەزانن پیاوەکە بووە بە دوو بەش، بە دوو کەسایەتی، بڕوای بە دوو ئایین هێناوە، شـانێکی لە مزگەوتە و یەکێکی لە کڵێسـایە. دەسـتێکی ترساوی قورئانە و یەکێکی پەشێوکاوی ئینجیلە. ئەو بەستەزمانە، لەوەتی قسەکەی کردوە، لەوەتی بەناو بووە بـە موسـڵمان، لە هەردوو ئاییـن دەرکراوە. هەردووکیان نەفرەتـی دەکەن. هەردوو کچەکـەی زویر کردووە، ئەوانیش پێغەمبەر و کتێب و ڕوانگەی ئەون!
«ئەوە باوکمانە، دەمانەوێ سەردانی بکەین، بزانین ماوە، پێویستی بە چ هەیە!؟».
«با پێویسـتیەکی هەبێت، ئێوە چیتان هەیە، چیتان پێ دەکرێت! «پاسـەوانی بەر دەرگای زیندانەکە پێی دەڵێت».
«ماچی دەکەین، کە ماچمان دەکات بۆنی مەسـیح دەکات!». «بوخچەیەکی لەسەر

ســینگی دانــاوە، تــا مەمک و ســێوە ترشــەکانی دەرنەکەون و چاوی تــێ نەبڕن و نەیگێڕنەوە».
«ئەو موسڵمانە!». «هەموو وا دەڵێن، بەس خۆی و ژنەکەی و دوو کیژەکەی ئەوە ناڵێن».
«ئێمەش کریســتیانین!». «هێشتا کچەکە توند بوخچەکەی باوەشی گرتووە وەڵامی دەداتەوە».
«کێشــە نییە، ئێمە یەک جەســتەین، باوک و منداڵین». «کیژی دووەم تا ســۆزی گەرمی بۆ باوکی بنوێنێت دەیەوێ قســەیەک بکات».
«ئێوەش ببن بە موســڵمان، دەتوانن ببنەوە کیژی ئەو!».
«نابینــە موســڵمان و دایکیشــمان نابێتــە موســڵمان، ئینجــا ئەو باوکــی ئێمەیە و هاوسەری دایکمانە!».

***

ســڵێوە و ژن و دوو کیژەکەی دەیانەوێ بگەنە ئەســتنبۆل. پیاوەکە دوودڵە بچێتە ناو مزگەوتە شــینەکە، لەوێ نوێژێک بکات و داوای لێبوردن لە موســڵمان و ئایین و قورئانەکەی بکات. پەشــیمانە و نایەوێ ئایینەکەی بگۆڕێت! دایک و دوو کیژەکەش بچنە کۆنە کڵێســاکەی ئایا ســۆفیا، لەوێ بە دزی کەس دیار نەبێت، خاچێک لەسەر ســینگیان دابنێــن و دوعا و نزایەکی بەســتەزمانانە بکەن. ئــەوان یەکێک بدۆزنەوە، چەکێــک، نزایــەک، دەرچەیــەک، فەرمودەیەک، ئــەوان لەو کەندە ســەختە دژوارە دەرباز بکات و بگەڕێنەوە عەنکاوە.

***

ئەگەر قەشــەکانی کڵێســا کۆنەکەی عەنکاوە بوار بدات، تاقەتــی هەبێت بگەڕێتەوە ســەر کۆنە تۆمارەکانی هاوســەرگیری بنەماڵەکانی عەنکاوەی پێش ١٨٥ ســاڵ دوور نییە، ناوی سڵێوە بدۆزێتەوە، ناوی ژنەکەی بدۆزرێتەوە! پاش دە دوازدە ساڵ پاش ئەو هاوسەرگیرییە ناوی هەردوو کیژەکەش بدۆزرێتەوە! بەڵام بەپێی نووسین و دەقی هــەردوو نامــە و هەواڵەکەی لە کتێبەکە بڵاوکراوەتەوە. لەناو ئەرشــیفی عوســمانی دۆزراوەتەوە، دوور نییە پیاوەکە لەو کاروانە سەختە لە گیران و ئەشکەنجەکانا زوو

مردووه، یان ژنەکە زووتر لە خەمانا گیانی سـپاردووه، بەڵام لەکوێ، چۆن نێژراون! دوو کیژەکەش، بەتەنیا یان وەک دوو کەنیزە، بەڵام لە دوو دەست و ماڵ و سێبەری جیاوازدا چەند رۆیشـتوون، لەکوێ و کەی گیرسـاونەتەوە! تا کام مەنزلی کاروانەکە هاوشانی یەکتری و دایک و باوکیان بوون! کەی و چۆن و بۆ لەیەک دابڕان!؟ ئەوان بەڕێدەکـەون تـا دانەبڕێـن. پیاوەکە دەبێتە موسـڵمان و ژنەکەش تـووڕە دەکات، ئینجیلیـش تـووڕە دەکات، ئینجا لەیەک دادەبڕێن. بەیەکەوە بـۆ دۆزینەوەی خۆیان دەڕۆن. ژنەکـە دەیـەوێ دڵنیا بێت ئەو ون بووە، یان پیاوەکە ون بووە.

***

کیـژە گەورەکـە، ئەوەی بەناوی مریـەم کراوە، بوخچەیەکی بە سـینگیەوە گرتووە، گەردێک رقی لە دڵدا نییە، بەسـتەزمانانە بە دایکی دەڵێت:

ـ دایکە، باوکم لە کڵێسا وەرنەگیرایەوە، ناکەوێتە بەر رەحمەت و نزاکانی گەورەمان عیسا و مریەمی نازدار!

ـ کچم دەتەوێ چ بڵێیت!؟

ـ هیچم نەگوتووە، بەڵام زۆرم لە دڵە، پرسـێکی گەورە و دژوارم پێیە!

لە چاوەکانی ژنەکە وەڵامێک بەدی دەکرێت، دەخوێندرێتەوە، وەک ئەوەی بە کچەکە بڵێت باوکت حەلاڵی من نییە، چیتر ئێمە ژن و مێرد نین، بەیەکەوە ناخەوین، ناومان لەتەنیشـتی یەکتری سـڕاوەتەوە، لەناو هەموو تۆمارەکانی کڵێسـاکە زوو ناوەکەیان کوژانـدەوە، حوبرەکەیـان بە زمان و دەسـت و تووڕەیی لەسـەر دێر و نووسـینەکە هەڵگـرت. بـەڵام من سـڵێوەی باوکتان بە هەمـوو دونیا ناگۆڕمـەوە، ماوەیەک ئەو دەبێتـە موسـڵمان و هاموشـۆی چەند مەلایـەک و مزگەوتـەکان دەکات، پێم خۆش نەبوو، تووڕە ببووم، قسـەم هەبوو، بەڵام ئەوم وەک هاوسـەر ویستووە و دەمەوێت! کڵێسـا و خزمەکان نەفرەتی دەکەن، من دەیگرمەوە! بە ئایین جیاواز بووین، بەڵام هێشـتا لەناو یەک جەسـتەدا ماوین و هەناسـە دەدەین! من چەند مانگێک و چەند رۆژێک، شـەوان و نیوەڕۆیان، لە گەرمەی ئیشـکردن و خەمخواردن لە چارەنووسـی دوو کیژەکەم و سـەرگەردانی سـڵێوەم، جەسـتەیەکی موسـڵمانی ئـەوم لەناو دڵم دانابـوو، چاندبـوو. دەمارە موسـڵمانییەکەی رەگی کوتابوو، هەسـتم پێی دەکرد و

ئاویشــم دەدا. ئــەو رۆحی خۆم بــووە، لێی راهاتبووم، فێری ببــووم، نەدەکرا لەناو رۆحــم دەربچێــت! لەو دەمەی قەشــەکە ئێمەی پیرۆز کرد، لەو دەمەی جلی ســپییم بۆ لەبەرکرد، لەناو کڵێســاکە دەســتم لەناو دەســتی دانا و دایکم و باوکم روومەتیان ماچکرد و پیرۆزباییم پێ دەڵێن:

ســڵێوە، رەنگ و دەنگ و خوێنی لەناو جەســتەم جێگیر بووە و دەمینێتەوە.

ئــەو هەســتەم پێ لــە ئایینەکان لا پیرۆزتــرە، لە کتێبەکان بەســۆزتر و گەورەترە! ســڵێوە لەنــاو کتێبەکانە، لە ئاســمانە، هاوســێی پیاوە مەزنەکانــە. چەند رقم لێی بۆتەوە، ئەوەندە و زۆرتریش خۆشمدەوێ و پشتیوانی دەکەم. بەڵام هەرگیز بەردێکی کڵێســاکان، پەیکەرێکی رووناکی دایە مریەم و حەزرەتی مەســیح بە خوێن و دڕک و زامەوە، هەرگیز خشتێکی کۆنە کڵێساکەمان بە هەموو پەرستگاکانی تری ناگۆڕمەوە و نایدۆڕێنم!

❊❊❊

## بەرەو ئەستنبۆل

لە شاری مەراشی ناو تورکیا، ئاشتی، کیژە فێرخوازەکەی لە ماستەر لە مێژوو وەردەگرێت. تا لەوێ بخوێنێت، بەڵام بەتەنیا نییە، بۆیەش بەتەنیا ناچێتە تورکیا، بەتەنیاش ماستەر ناخوێنێت. ئەوە ماوەیەکە، ساڵێکی تەواو نەکردوە. لەگەڵ دەستەخوشکەکەی بەردەوام بەیەکەوە دەخوێنن. پاش ئەوەی بەیەکەوە لە بەشی مێژووی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین وەردەگیرێن، دەبنە هاوڕێ و دەستەخوشک، زۆرتر بەیەکەوە دەبن. لەسەر یەک تەختە دادەنیشن. بەیەکەوە نان دەخۆن. زۆریش شیرین و دڵسۆزی یەکتری دەبن! دوایی بەیەکەوە دەچنە شاری مەراشی تورکیا.

هەردووکیان لە دە یەکەمەکانی بەشەکەی خۆیان بوون. لەوێش لە لیستەکە ناویان لەدوای یەکتری هاتبوو، بەڵام نەدەزانرا ناوی کامیان لە پێشەوە بووە! بەیەکەوە لە کۆلێژەکەیان وەک مامۆستا دادەمەزرێن. پاش ئەوەی وەک مامۆستا، لە وانەو دەوام و ڕەوشتیان ڕازی دەبن، مۆڵەتی ئەوەیان دەدەن، بە موچەی تەواو بچنە تورکیا و ماستەر بخوێنن!

هەردووکیان لەناکاو وەک ویستی سەیر و هەڵچوون، حەز دەکەن لە دەرەوە ماستەر تەواو بکەن. بچنە دەرەوە، بەڵام بۆ خوێندن، نەک بۆ دیتنی دەریا و بوتیک و مۆزە و شەمەندەفەری تیژڕەو و هوتێلی چوار پێنج ئەستێرە. ئەو دوو کیژە دەیانەوێ بۆ خوێندن بچنە دەرەوە. هەردووکیان، بەڕێکەوت، لە دەرەوەش حەز بە تورکیا دەکەن. ئارەزوویان تەریب و نزیک بووە، بۆیەش برادەر و هاوڕێ دڵسۆزن.

بیریان لەوە کردبووەوە، چوونە تورکیا و خوێندن لەو وڵاتە بۆ ئەوان ئاسانترە. بۆ ئەوەی باش و گونجاو لە خوێندن وەربگیرێن و دامەزرێن، مێژوو بخوێنن، مێژووی کوردستان و ناوچەکە، تورکیا هەڵدەبژێرن. باشترین شوێن و زانکۆش بۆ ئەو خوێندنە، زانکۆکانی تورکیا بوو.
ئەوان بۆ ئەوەی بخوێنن و زۆریش دوور نەڕۆن، لەناو تورکیا زۆر دوورنەکەونەوە، دەگەنە شاری مەراش. دوایی زۆریش ئەو شارەیان خۆشدەوێت. ڕۆژانەی ژیان و خوێندن و پەیوەندییەکانیان، لەو شارە ئاسوودە دەبێت، زۆریش دڵنیا خوێندنەکەیان تەواو دەکەن و سەردەکەون. خولیای شار و زانکۆکەی دەبن، بەڵام زۆریش شارەزا نابن. خۆشیاندەوێت، بەڵام زۆر ناچنە ناو هەموو وردەکاری و نهێنی و بۆن و بەرامی جڤاتەکە. دەمینێنەوە، دەژین، ئاسوودەن، بەڵام بەپەلەش دەیانەوێ زوو خوێندنەکەیان تەواو بکەن و بگەڕێنەوە زانکۆی سەلاحەدین! پلەی مامۆستایەتیان بەرزتر ببێت، زانیاریی زۆرتر، بابەتێک فێر بن، کەسی تر، پێش ئەوان لەو بابەتە نزیک نەبووبێتەوە، ئەو بابەتەی نەخوێندبێت!

***

ئاشتی لەگەڵ دەستە خوشکەکەی، دەم بە پێکەنین و شیرین، بەیەکەوە نانی ئێوارە دەخۆن. بەردەوام بەیەکەوە بوون، بەیەکەوە دەبن، چونکە بەیەکەوەش لە هەولێر بۆ خوێندنی مێژووی تورکیا دەچنە تورکیا. بەیەکەوە و بەیەک ڕۆژ بەرنامە دادەنێن! خۆیان بڕیار دەدەن، پرس بە کەس ناکەن، بەڵام ڕەچاوی زۆر لایەن و بۆچوون و پێویستی و پرنسیپەکان دەکەن.
«باشە ئێمە مێژووی تورکیا دەخوێنین؟».
«بەڵێ لەناو مێژووی تورکیا، کورد و شارەکەمان دەدۆزینەوە».
ئەوان ڕۆژانە دوو ژەمی خواردنیان لەماڵەوە ساز دەکرد و دەیانخوارد. کەم کەم لە دەرەوە دەمانەوە، کەم دەچوونە ناو بازاڕەکە، ناو مۆڵ و سەنتەر و شارەکە. کەمیش لە یانەی زانکۆ نانیان دەخوارد. خۆیان لەناو شوقە بچووکەکەیان هەموو کەرەستەیەکیان هەبوو. هەردووکیان کیژی کابان و خاوێن و بەزەوقیش بوون. ئەوان هیچ کار و پیشە و خەمیان نەبوو، خوێندن و زانکۆ و توێژینەوە و نووسینەوە و تەواو! بۆ لەدەرەوە و بە پارەی زۆر نان بخۆن. یەکێکیان ژەمە خواردنەکەی سازکردوە، ئەوی تریش بەردەستییەکان دەکات. ئازایانە و بەزەوق و پاک، قاپ و

کەوچـک و خوانەکان دادەنێت و دوایی هەڵیاندەگرێتەوە.
نان دەخۆن و چای گەرمیش دەخۆنەوە. ئەوان خۆیان گۆڕیوە، ئیتر ناچنە دەرەوە، بەدرێژایی ڕۆژەکە لە زانکۆ بوون. لەناو شـار بوون، لەسـەر شەقامە سەرەکییەکەی گەڕەکەکەیـان پێویسـتییەکانیان هێنابـووەوە. دەنگی موزیکەکـە کز دەکەن، دەبێ کەشـەکە ئـارام بکـەن. هەردووکیـان ئارەزوومەندانـە دەگەڕێنـەوە سـەر کتێب و نووسینەکانیان. هەموو سەرچاوەکانیان بە زمانی تورکی و پیتی لاتینییە، هەموویان لە تورکیا کڕیوە. کە هاتوون، لەو زانکۆیەی ئەوان زانسـتیان خوێندوە، لە هەولێر، دوو کتێبـی لـەو جۆرەی تێدا نەبـووە، هەموویان لە کتێبخانەکانی شـارەکە کڕیوە، یـان لـە کتێبخانەی زانکۆ وەرگرتوە. تورکی دەنووسـن و بـە تورکیش دەخوێنەوە. بڕیاریشـە ماستەرەکەشیان بە تورکی بنووسن. بە تورکی دەنووسن، چونکە ماستەر و نامەکەیان بۆ زانکۆیەکی تورکیایە، مامۆسـتا و سەرپەرشتیارەکەیان تورکە. لەبەر ئـەوەی ئەو و هەموو مامۆسـتاکانی تری ئەو زانکۆیـە، بێجگە لە زمانی تورکی هیچ زمانێکی تر نازانن، بڕواشیان بە هیچ سەرچاوەی زمانەکانی تری ناوچەکەش نەدەکرد، بەتایبەتـی ئەگـەر بە کوردی نووسـرابوایە، لەنـاو عێراق و هەرێمی کوردسـتانیش چاپکرابوایە.
کتێبـە گەورە تورکییەکانیان لەسـەریەک دانراون. دەفتەر و دەسـتنووەکانیان، هەر کەسـە و بەشـی خۆی، لەبن سـەری داناوە. بەرپەنجەرەی ژووری نووسـتنەکەیان کردوە بە دوو بەش. بەشێکیان بۆ ئاشتی، بەشی دووەم بۆ پەیمان. کتێب و دەفتەر و ئەرشیفەکان، هەموویان بابەتی مێژوون. بابەتی شەڕ و دەوڵەت و دەسەڵاتە. دوو کیـژە هەولێری لە زانکۆیەکـی تورکیا، مێژووی تورکیا بـە زمانی تورکی دەخوێنن. نووسـین و لێکۆڵینـەوە و توێژینەوەیـان لەسـەر تورکیایە، بـەڵام لەناو دوو چەمک و سـەردەم و دوو دیتنـی جیاوازەوە ئیش دەکەن. ئاشـتی نامەکـەی، توێژینەوە و خوێندنەوە و پەرۆشـی بۆ ئەوە بوو، لەناو بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی عوسمانییەکان، دەیەوێ نامەیەک لەسەر هەولێر و بە زمانی تورکی، بۆ وەرگرتنی ماستەر بنووسێت. بـەر لـەوەی وردەکارییەکانی سـەفەر و دۆکومێنتـەکان ئامادە بکـەن. هەردووکیان بـەوردی و باش دەپرسـن لە تورکیا، لـەو زانکۆیەی ئەوان بەنیازی ماسـتەری تێدا بخوێنن تێسـتی توفلی «Toefl»ی شـارەزایی لە زمانی ئینگلیزی دەوێت! پێویست دەکات ئـەو تێسـتە بکـەن و بڕێک پارەش لەوە سـەرف بکەن، ئایـا ئەوەش وەک

زانکۆکانــی خۆمان بۆتە مەرجێکی پێشــوەخت!؟ لەوەش بــاش دڵنیادەبنەوە و ئیتر بە قوڵی دەکەونە ناو مێژوو.

❊❊❊

ئاشتی دەیەوێ ســەردانی مامۆستاکەی سەرپەرشتی ماستەرەکەی دەکرد بکات، کە شــانازی، بابەتی ماســتەرەکەی قبووڵکردوە. ئەو بە رەزامەندنی مامۆستاکەی ناوی لە نامەکە نابوو «هەولێر لە سەردەمی عوسمانییەکان سەدەکانی هەژدە و نۆزدەهەم». پرۆفیسـۆر فــاروق ســویلەماز لــە زانکۆی ســوتچو ئیمــام «SUTÇU iMAM» بابەتەکــەی لێ قبوڵکردووە. ئەو لە هەڵبژاردنی بابەتەکە هیچ دوودڵ نەبوو، زۆریش پەرۆش و ئامادە بوو! ئاســان نییە، دوو ســەدە لە مێژوو و رووداوەکانی شــارێکی شــیرین، قەڵاتێکی کۆن بکۆڵیتەوە، بەدوای دۆکومێنتەکان شەیدا بیت! ئاسان نییە، دوو ســەد ســاڵ، بە دوو ســاڵ بزانیت و بنووســیت، بە زمانی کوردیش نەبێت، بە زمانی تورکی بێت! بە پیتی عەرەبی و کوردی ئاسایی نەبێت، بە پیتی لاتینی بێت!

❊❊❊

ئەو دەگاتە بەشــەکەی خۆیان، دەچێتە ژوورەکەی، ئەگەر مامۆســتاکە کاتی نەبێت، ئەگــەر لــەوێ نەبێت، بلەز و نــەرم دەگەڕێتەوە. ئەو بۆ خوێنــدن رێگایەکی دووری بڕیوە، ئەوەندە چییە! رێگاکە دوور نییە، باخچەیەک و دوو باڵەخانە دەبڕێت. دەچێت و پیاســەیەکی کــردوە. ئەگەر لەوێ بوو، کاتی گونجاوی هەبوو، ئەو پرســیارەکانی دەکات، جوانیــش وەڵامەکانــی وەردەگرێتەوە و سوپاســی دەکات و دەگەڕێتەوە. تا ئەویش دەگەڕێتەوە، پەیمانیش ئامادە دەبێت و دەگەڕێنەوە شــوقەکەیان.

ئەو ســەبر ســەبر دەچێتە ســالۆنی ژووری تایبەتی مامۆســتاکەی. بە دوو پەنجەی باریــک لــە دەرگا دارەکەی رووبەرەکەی بە نەخشــی ورد و نەرم وێناکراوە، دەدات. تــا بــواری چوونــە ژووورەوە وەردەگرێت. لەگــەڵ ترپە و تەقەکە، بــۆ چاوەڕوان و هەســتکردن بە جووڵە و هەناســەی ژوورەکە، کیژەکە سەیری وردەکاری نەخشەکان دەکات، دەبینێــت، لەســەر ئــەو دارە، ئــەو تەختــە رەقــە، چۆن نیــگاری رەنگین، دارەکــەی نــەرم و شــیرین کردوە. تــا دەنگێ بانگــی دەکات بچێتــە ژوورەوە، مات و هێمــن چــاوەڕوان دەکات. دەچێــت و زووتریــش بۆ هاتن و دیدارەکــەی ئاگاداری نەکردۆتەوە، نەیگوتووە دەمەوێ ســەردانت بکەم، ئیشــم هەیە، پرســیارم بۆ گەڵاڵە بووە. بۆیە سەرە پەنجەکانی زۆر بە نەرمی، لەسەرخۆ و کەمێک ترساو لە دەرگاکە

دەدات. بەڵام بە چرپە و خشـپەیە ناسـکە دەنگ و لڤینێک لەناو ژووره گەورەکەی سێ لادیواری کتێب و بڕوانامە و نەخشە بوو، دەخولقێنێت. دەنگ و جووڵە، ئەگەر گەورە یان بچووکیش بێت، سـەدای دەبێت و دەبیسترێت.
کیژەکە باوەشێک کتێب و دەفتەری پێیە. دەیەوێ مامۆستاکەی ببینێت، پرسیارەکانی بکات، داواکانی بگەیەنێت، پرسیار لە سەرچاوەکانی پێویستی پێیان دەبێت، بکات. دەزانێت مامۆسـتاکەش پرسیاری دەبێت، دەیەوێ بزانێت، چ لە بابەتەکە فێر بووە، کام سـەرچاوەی بەکارهێنـاوە! چەنـدی نووسـیوە، هەموو ڕێنماییەکانی نووسـینی پەیـڕەو کـردوە، دەزانێت بە کام فۆنـت تایپەکانـی دەکات، دەزانێت چۆن ژێدەر و سـەرچاوەکانی لە ژێرەوە ریزبەند بکات. مامۆستاکەی زووش ئاگاداری دەکاتەوە:
«ئاشـتی، بـە هیچ شـێوەیەک و هەرگیـز ئەوەم قبـوڵ نییە سـەرچاوەی عەرەبی و کـوردی بەکاربهێنیـت. بـڕوام بە کتێـب و دۆکومێنتێـک نییە لەنـاو عێراق، یان وڵاتانـی عەرەبـی چـاپ و بڵاوکرابێتەوە! ئەوانەم نـاوێ. هەموو سـەرچاوەکانت وا باشـە تورکـی بـن، چاپکراوی ئـەو وڵاتە بـن. من هەموویـان دەناسـم، کتێبەکانم خوێندۆتـەوە، زانیارییـەکان دەزانم، دەزانم کامیان دەکـرێ متمانەیان پێ بکرێت و کامیان خوێندنەوەیان سوودی نابێت! ئەوانەم دەوێ. نەک تۆ، هەموو قوتابییەکانم، ئەوانەی ئێستا سەرپەرشتی نامەکانیان دەکەم، یان ئەوانەی زووتر هاوشانیان بووم و ماسـتەر و دکتۆرایان وەرگرتوە! ئەو قسـەم پێ گوتوون، بەو چەشـنە ئامۆژگاریم کـردون، هەموویان راسـپارەکانی منیـان پەیڕەو کردوە و سـەرکەوتوون! هەموویان لەناو کتێبی دروسـت زانیارییان وەرگرتوە و سوودیان بینیوە».
«دیـارە دەیەوێ ماسـتەرەکەم تەواو نەکەم، رقی لـە منە! بۆ بەو جۆرە، وا توند و بە هەڕەشە قسەم لەگەڵ دەکات. کیژەکە ناحەق نەبوو، لەو دۆخە و بەو داوایە ئەو گومانە نەکات»
- بۆچی مامۆسـتا!؟ «ترسـاو و پەشیمان و رەنگی تێکچووە وەڵامی دەداتەوە».
- بەڵگەنامەی عوسمانی زۆرە، دۆکومێنت «Document» زۆر لەو وڵاتە پارێزراوە!
«زۆرتر چاوی لەسـەر کتێبێکە و قسـەی لەگەڵ دەکات. بەڵام پەیامەکەی دروست و خێرا گەیاندوە».
- دەزانم، دەڵێن سـەد ملیۆن دۆکومێنتی عوسـمانی لەو وڵاتە پارێزراوە! «کیژەکە دەڵێت».

ـ سەد ملیۆن زۆرتریش. زۆرە بەشی هەزارەها فێرخواز و دەزگای زانستی جیهانیش دەکات، زۆریـان هێشـتا هەر نەکـراون بە تورکی! برۆ ئیش لەو بەڵگە راسـتەقینانە بکـە، بگەڕێـوە ناو مێژوو! مێژوو وەک خۆی، مێژوو لەنـاو دەقە مێژووییەکان، نەک لەناو کتێبە نوێیەکانی دوور بە دووری نووسـراون.

ـ مامۆستا هێشتا نەکراون بە تورکی! «کیژەکە بە ترس و نائومێدانە لە مامۆستاکەی دەپرسێت».

ـ نەخێر، ئەوانەی ئیشـیان پێیان نەبوو، سـەبارەت بە دەرەوەن، دوور لە ویسـتی تورکەکانە، یان کەم توێژەرەکان پێویستیان پێیان بووە، نەکراون بە تورکی ئیمڕۆ، هێشـتا عوسـمانییە، بە پیتی عەرەبییە، بە رێنووسـی کۆنە، بە حوبری زۆر کۆن، بەڵام نەسـڕاونەتەوە، ماون و دەخوێندرێنەوە. من ئەوانە لە نووسـینە تورکییەکانی بە پیتی لاتینییە، باشـتر و بە سـۆزتر دەخوێنمەوە! زۆرتر بڕوایان پێ دەکەم.

***

کیژەکـە جانتاکـە لەسـەر شـانە و کۆمەڵێک کتێبی لە باوەشـە! ئەگـەر جانتاکەی دەکردەوە، زۆرتر بۆنی خواردنیشی لێ دەهات، بەڵام خواردنەکەی لە ماڵەوە بەیانی سـازیکردبوو، لەناو کۆنە دۆکومێنت و کۆنە کتێبی تورکی بە هەردوو پیتی عەرەبی و لاتینـی، کتێبـە کۆنەکان، حوبرەکەی بە شووشـەی گەورە گەورە لە ڤینیسـیاوە هاتبوون و بەکارهاتوون، بۆنی گۆشت و روون و نان و بەهاراتەکەیان ناو جانتاکەی باش مراندبوو.

ئەویش ئەوەندە پەریشـانی بابەتی کۆن، زۆر کۆن ببوو، هەسـتی بۆنی نەمابوو، زۆر دەگەڕێتەوە دواوە، زۆر لە شار دوور دەکەوێتەوە، هەزارەها جار میلی کاتژمێرەکانی هەمـوو شـارەکەش بگێڕێتـەوە دواوە. ئـەو هێشـتا دوورتر رۆیشـتبوو، گەڕانەوەی ئاسان نەبوو، دەبوایە بگاتە مەنزلەکە، هەوارەکە، کۆتاییەکە، ئینجا وەک یاریزانانی خلیسـکانی سـەر بەفـر دەکەن، بـەڵام بەپێچەوانەیـان ئەوان بە ترفیک، بە سـیمە کارەباییەکان دەچنە سـەر بەرزایی چیاکە، سـەر لوتکە سـەهۆڵبەندانەکە، بەڵام بە وەرزش و گیانبازی و خلیسـکاندن و دوو قامیشـی باریک و دوو تەختەی لووسی ژێر پێیەکانیان، لەسـەر رێڕەوێکی شـەختە دێنە خوارەوە، پلە و خەڵات و نمرە و ناو و ناونیشان وەردەگرن!

ئەو کاروانەکەی دەستپێکردبوو، ماوەیەکی باش رۆیشتبوو، رۆژانە زۆرتر تورکییەکەی

باشتر دەبوو. نووسین و ڕێنووسەکەی پوخت و پاراوتر دەبوو، سەرەتاکانی زمان کە کۆلێژی عیشق لە هەولێر وەریگرتبوو، دەچەسپا، دەبووە پراکتیک.
ڕۆژانە و ئێواران دەچووە کۆلێژە تورکییەکەی ناویان نابوو «ئیشک» عیشق، گەورە دەبێت و هەزارەها قوتابی خوێندنی تێدا تەواو دەکات. چەندان بەش و لقی تێدا دەخوێندرێت. دوایی لەگەڵ گۆڕانە سیاسییەکانی ناو تورکیا، نەک کوردستان و هەولێر، ناوەکەی دەگۆڕن بە تیشک.

***

کیژەکە تا دەگەیشتە ناو ژوورەکە، بەردەم مامۆستاکە، لەسەر دەفتەر و فەرهەنگ و کتێبەکە، هەر بە کوردی قسەی دەکرد. بە زمانی کوردی لەناو ئۆتۆمبێلەکە، تاکسییەکە، لەگەڵ دەستەخوشکەکەی، لەناو کۆلێژەکەیان، لەگەڵ نانخواردنیش هەر بە کوردی قسەی دەکرد. لەوێ دەبوایە بۆ فێربوونی زمانی تورکی دوو سەعاتێک بگەڕێتەوە سەر زمانە تورکییەکە، بەڵام بە هزری کوردی، بە تێگەیشتنی کوردی.
لەناو هەولێر، لە شارێک پایتەختی هەرێمێکی کوردستانییە. هەموو ئامراز و پەیوەندی و بەرنامەی سیاسی و پەیامی حزبی و بازاڕ و لێدوان و کۆنتراکتەکان بە کوردی بوون! لە هەولێر لە عیشق بە تورکی دەخوێنێت، بە پارە، کۆرسی زمانی تورکی وەردەگرێت و فێر دەبێت!
بەڵام لەو شارە، لە تورکیا، مامۆستاکەشی کورد بوو، کرمانج بوو، بەڵام هەرگیز تا خوێندنەکەی تەواو دەکات، زۆرتر لە سەد دیمانەشیان دەبێت، قسەی زۆریش دەکەن، مامۆستاکەی نەیگوت من کوردم. باسی گوندەکەی خۆی نەکرد و نەیگوت:
تا دایکم مرد زمانی تورکی باش فێر نەبوو. ئەوەی لەناو دڵە هەبووە، بەڵام هەرگیز نەیدرکاند. کەسایەتی زۆر لە دیمانە و یادنووسەکانیان ئەوەیان گوتووە و ددانیان بەوە داناوە، بە سەری سپی و تەمەنی زۆرەوە، بەڵام بە چاوی بەتروسکە و ئاوەوە دایکیان شاناز کردوە و گوتوویانە، دایکمان تا مرد باش فێری زمانی تورکی نەبوو.
یەکجاریش ئەو نەیگوت:
تۆ تەمەنت تەنیا سی ساڵێکە و سی ساڵە زمانی کوردی دەزانیت. من تەمەنم شێست ساڵە و ئەوەندە ساڵەیە کوردی دەزانم. پێش تۆ، ڕەنگە بە تەمەنی باوکت، دایکت و لەوانیش زۆرترە من کوردی دەزانم، هەرگیزیش لە گوندەکەمان،

لەبــەر هەیوانەکەمــان، لــەو دەمانەی چرای شــەوانەی ژووره نەوییە دیــوار بەردینە ئەســتوورەکانمان دەکوژانــەوە، ئیتر حیکایەت دەگێڕدرایــەوە، پاڵەوان هەڵکەوت و عیشــق پەیدا دەبوو، دێو و گورگێک دەگەنە سەر بەرزاییەکان، هەڵۆش لەسەر دوند باڵــی لــە هــەور دەدات و حیکایەت درێژ و بەتام و باڵکێش دەبوو، هەرگیز داپیرە و بابــە گەورەکان زمانی تورکیان بەکارنەهاتووە.

ئەو نەیگوت:

من زمانی کوردی دەزانم!

دەیــان جار بەیەکەوە دانیشــتن، قســەیان کــرد. مامۆســتا فاروق، پرۆفیســۆرەکە «Professor» زۆر رێــزی دەگــرت. ئــەوی خۆشدەویســت و هانــی دەدا و حەزی دەکــرد لــە خوێندن و بەرنامەکەی ســەرکەوتوو بێت. بەڵام هەرگیــز لەبەردەم ئەو، وەک باس و دەمەتەقێیەکی ئاسایی نەیگوت من کوردم. ئەو یەک پەیڤ، رستەیەک، رازێکــی بە کوردی نەدرکاند. جارێکیان پەیڤێکــی بە کوردی نەچرپاندە گوێیەکانی. ئەویش زۆر مەبەستی نەبوو، مامۆستاکەی بە کوردی قسە دەکات، یان دەڵێ کوردم و کورد نییم، مەبەست و بەرنامەی ئەو نەبوو! ئەو بڵێ کوردم یان نەڵێت من کوردم هیــچ لــە بابەتەکە ناگۆڕێت. بە راز و ناســاندنی ناســنامەکەی ئەو، بوونی کورد لەو دەڤەرە هاوســەنگییەکە، ژمارەکە، دەنگ و خەباتەکە بەقەد سەرە موویێک ناگۆڕێت! ئەو دەیزانی دوو سێ مانگ جارێک، من، وەک قوتابییەکەی ئەو دەگەڕێمەوە هەولێر. دەچمەوە سەردانی دایکم دەکەم. سەرێکی پڕ لە سۆز و گریان لە قەبری باوکم دەدەم و هەموو جارێک کتێبێکی مێژووش لەگەڵ خۆم دەبەم. مێژووی جیهان دەبەمەوە کن مێژووەکەی خۆم. ســەردانی زانکــۆ و کۆلێژەکەمان دەکەم. هەرگیز جارێک ئەو هەر بۆ زانین و راســپاردەیەک نەیپرسی! زۆریش چاوەڕوان بووم جارێکیان مامۆستاکەم، ئەوەی سەرپەرشــتی نامەی ماستەرەکەی دەکردم بپرسێت:

«کەی گەڕایتەوە!؟»

منیش لە وەڵامدا بڵێم:

«مامۆســتا دوو ســێ رۆژە هاتوومەتەوە، هێشــتا جانتاکەم باش نەکردیتەوە! خۆم هاتوومەتەوە، بەڵام دڵ و چاوم هەر لە هەولێرە! بەڵام چ بکەم بابەتەکەم زەحمەتە، نووســینەکە دوو سەرە زەحمەتە، زمانەکە نامۆیە، ئەلفوبێیەکە نوێیە، نووسینەکانی

دەبنـە سـەرچاوەی بابەتەکەم زمان و ڕێنووسـی ناوازەیە، مانـدووم دەکات. کەس وەک مـن نەکەوتووتـە ناو ئەو دەریایـە لیخنە، ئەو گۆمەی؛ فێڵ و نیگەرانی و ترس و گومانی زۆری تێدایە. بوارم نابێت زۆر لەوێ بمینێمەوە و لە دوورەوە نووسـین و توێژینەوەکـەم بکـەم، دەبێ نزیک بم لە تۆ و کتێبخانە و فەرهەنگەکان».

«ئەو جارێک لە کیژەکەی نەیپرسی».

- دۆخی ناو هەولێر چۆنە؟ زانکۆکانتان چۆنە، مامۆستای بێگانەت زۆرە، لەناو ماڵان چ جۆرە خواردەمەنییەک لە خوان و بەر دەستی کابانەکان ناودار و بە تامن! ڕاستە دەڵێـن خوێندنی هەموو قۆناخەکانی خوێندن بە زمانی کوردییە!؟ نەیپرسـی، بەڵام لە هەڵبژاردنی بابەتی ماسـتەرەکە، ئیشـکردن لەسەر مێژووی شاری هەولێر، گلەیی نەبوو، دوو دڵ و سـەرکەش نەبوو! ڕەنگە لە دڵەوە پێی خۆشـیش بووە.

«زۆر جار لەسـەر سەری دەوەسـتام، نزیک مێز و دەفتەر و کتێبەکانی نەدەجووڵام و هەناسە هەڵدەکێشا و دەمویست هەستی بورووژێنم، بیدوێنم، تا بەسۆز و پەرۆش سـەر لەسـەر کتێبە کۆنەکە هەڵگرێت. کەمێک سـەری بەرز بکاتەوە. دەسـتێک لە چاویلکەکـە ئەسـتوورەکە بـدات. ئەزیەتێک بخوات و قورگی پاک بکاتەوە، سـەیرم بکات لێم بپرسێت»:

- بـۆ هەولێر، شـارەکەتان ئەوەندە خۆش و ئارامـە!؟ «بەدڵنیاییەوە هەزارەها جار بـە دەسـتەواژەیەک، بە هەواڵ و باس و پێناسـەیەک لە ڕۆژنامـە و میدیای تورکی بڵاوکراوەتـەوە، دەگوترێت و دەنووسـرێت، هەولێر شـارێکی ئارامە. هەمووش لەناو تورکیـا ئـەو ڕاسـتییە دەزانن، هەرێمـی کوردسـتان ئارامە، پایتەختەکـەی هەولێر ئاسـوودە و ئاوەدانـە. هەزارەها کۆمپانیای تورکیش ئیشـی تێـدا دەکات، لە دەزگا فەرمییە تایبەتییەکان ناونووسـکراون. سـەدان هەزار کارمەندیان لەسەر ئەو خوانە، لەو بودجەیە، لەو بازاڕ و مەیدانەش کار دەکەن و دەژین و پاشـکەوتیش دەکەن».

«منیـش بە دڵەوە، بە سـۆزی سـوتانم بۆ دایکم و شـەوانەی ماڵـە گەرمەکەمان و ڕۆژانـەی دەوام و سـەرقاڵییم لەگـەڵ کیژ و کـوڕە گەنجەکانی بـاش دەزانن ڕێز لە مامۆسـتاکانیان بگرن، سـێ ساڵ پێش ئەوان قوتابی بووم، وەڵامی بدەمەوە».

- مامۆسـتا هەولێـر پایتەختی کوردسـتانە! هەمـوو دونیا دەزانێـت! وەک ئەنقەرە پایتەختە! وەک دیمشق و بەیروتە.

«وەک ئەوەی گوێی لەو دوو وشـــەیە نەبووبێت، مامۆســـتاکە زوو دەیەوێ ئاراستەی دیالۆگەکە بباتە ئاراستەیەکی تر، بە مەرجێک دوور  و زۆر دووریش بڕوات». بەڵام خۆی لەو مەدارە نادات و پرســیاریش ناکات.

***

موزیک لە ژووری پرۆفیسۆرەکە

مامۆستاکە ئاگای لە هاتنی ئەو نابێت، تا ئاشتی دەگاتە سەر سەری. ئەو بە هەموو سۆز و ویست و جەستەی چووبووە ناو کۆمپیوتەرەکەی. دەستێکی لەسەر ماوسەکە بوو. دەســتی دووەمی، پەنجەکانی ببوون بە هەزار لق و پەنجە و لاولاوی ناسـک و نەرم و زۆریش تەڕ و شـــل، دەلەرینەوە، ســـەمایان دەکرد. پەنجەش وەک قەدی ژن و قەدی قەڵەم و لەرینی هەور ســـەمای دەکرد!

مامۆســـتا بە تەمەنەکە، مێژوونووســـەکەی، ژیانی لەناو دۆکومێنت و زمانی عوسمانی ســـەرفکردوە. بەسەری پەنجەکانی ڕێنووسی عوســـمانی دەخوێندەوە، هەموو نهێنیی دۆکومێنتەکانی ئەو دەوڵەتە گەورە و کۆنەی دەزانی! کاغەزە کۆنەکانی بۆن دەکرد، دۆکومێنتەکانی دەناسییەوە. بۆ ئەو بابەت هەبووە، لاپەڕەی وا هەبووە، پێش بیست ســاڵ، پێش چل ســاڵیش سەیری کردبوو، زۆریش ئەو نووسینەکانی شرۆڤە کردبوو. ئەو شــاناز نووســینەکانی بەرجەســتە کردبوو، ناوی لە زۆریان نابوو، مێژووی زۆری ســازکردبووەوە! ئەو، باوک و وەستا و مامۆستا و قەڵەم و دڵی دۆکومێنتەکان بوو. ئـــەو خەیـــاڵ، زۆریش خەیـــاڵ ئاگای لـــەوە نەبوو، کیـــژە هەولێرەکـــەی قوتابی ئەو بوو لەســـەر ســـەری وەســـتاوە. ئاگاشـــی لەوە نەبـــوو، پەنجەکانی تەقـــە و چرپە و ترپـــەی نەرمیـــان، بـــە بـــۆرد و تەختـــە و بەرگی کتێبەکانـــی بەردەمی و تەنیشـــتی لاپتۆپەکەی دەکرد. هیچ هەســـتی لەو نەبوو، لەســـەر کورسییەک و لەناو ساڵۆنێکی کۆلێژیـــش دانیشـــتوە، ئەفەندییەکـــی بەتەمەن، جانتاکەی جەنجاڵـــە، ئاگای لەوەش نەبوو، چاویلکەکەی ئەوە حەوت ســـاڵە نەگۆڕیوە، بیریشـــی لەکن کوڕەکەی نەبوو لە ئەڵمانیا چ کارەیە، چۆن دەژێت، ئەو زۆر دوور و ترســـناک ڕۆیشـــتبوو. پەنجەکانی بـــە گۆرانییەکە، بە ســـازە گەرمەکە، ســـۆزە جوانەکەی شـــڤان پەروەر ڕۆیشـــتبوو. دەنگەکە بە ســـۆزەوە لەناو ژوورەکە پەخشـــان بووبوو. سترانێکی کوردی، بە دەنگی هونەرمەندێک چەندان ساڵ بوو، ناو و بەرهەم و دەنگ و قوڕگ و وشەکانی قەدەغە بوون. بەڵام وا لەو دەمانە، دەنگەکە، ســـترانەکە لەناو ژوورێک، ئەرشـــیفی تورکان،

لەبەردەم مامۆستایەک کۆدەکانی مێژووی تورکیای کۆن و نوێی لەبەرە، دەزانێت و ئیشی تێدا کردوە، خوناو و ناز و شیرینەکی ناوازە پەخش دەکات! دەنگی شڤان، سترانەکە، لەناو مێژوو و شانازییەکانی هەموو تورکەکانی تورکیا و دەرەوەی تورکیا دەچووە ناو لاپەڕە و ناو قەدی کتێبە کۆنەکانی ژوورەکە، دەبووە خاڵ و نیشانەی سەر نەخشەکانی لەسەر دیوارەکانی هەڵواسرابوون!

کیژەکە نەیپرسی، بەڵام دڵنیابوو، مامۆستا پرۆفیسۆرەکە لەگەڵ ئەو دەنگ و سۆز و تەمبوورە، یادگارییەکی شیرین و کۆنی هەیە. خولیا و ئاوێتەبوونی دەنگ و سۆز و مامۆستاکە، باش ئەوەی دەگەیاند؛ ئەوانە کۆنە هەڤاڵ و خزم و دۆستی شیرین و دێرینن! بەیەک ڕۆژ، بە ڕێکەوتێکی بەپەلە و لەناکاو، ئەو ئاشناییە، ئەو سوتانە لەگەڵ گۆرانییەکە، ئەو نووستن و خەونە جوانە لەگەڵ شڤان پەروەر پەیدا نابێت! ئەو تەمەنێکی زۆر سەخت، پەرۆش و ماندووش لەگەڵ دۆکومێنت ئیشیکردوە، بۆیە چاو و جەستە و هەنگاوەکانی کۆن بووە. دیارە بۆیەش حەز لە یادگارە کۆنەکانیش دەکات! لەگەڵ گۆرانییەکە، سەمای سازەکە، پەیڤەکانی باش و روون، زۆر لە ئاشتی باشتریش تێدەگەیشت. ئەو خەیاڵ ببوو، دوور ڕۆیشتبوو، ئاساییە پرۆفیسیۆرەکە گەڕابێتەوە لای دایکی. ناو گوندەکەیان، خانووە بەردەکەی یەک دوو هەنگاو لە جۆگەیەک، لە باخەکان، لە هەنار و هەرمێ و رەزە میوەکان دوور بوو.

بەو گۆرانییە، ئەو دەگەڕێتەوە ڕۆژانی ساڵانی شێست و حەفتاکانی سەدەی رابردوو. تا ساڵی ١٩٧٦ کە شڤان پەروەر لە وڵات دەرچووە، رەنگە هاوڕێ و هاوبیریش بووبوون! بەڵام ئەودەمانە ئەو گۆرانی «من بیریا تە کریە» و «هەڕنە پێش» و «کینە ئەم؟»ی تۆمار کردوە، ناوی شڤان بووە، بەڵام ئەودەمانەی ئەوان بەیەکەوە، هاوسێ و هاوپۆل بوون، ناوی ئیسماعیل ئایگۆن بووە. چەندان ساڵ بەڕێکەوت باوکە پیرەکەی شڤانی بینیووە، لە دوورەوە بۆنی ئەوی کردوە! بەڵام جورئەتی نەکردوە سڵاوێکی دڵسۆزانە لەو پیرەمێردە چاوەڕوانە بکات. ئەوەی چەندان ساڵە، بیری کوڕە یاخییەکەی دەکات. دووریش نییە حەزی کردوە، دەستی نەرمی پیری بکوشێت و کەمێک خەمەکانی سووک بکاتەوە. ئەویش دڵ و سۆزی هەبووە بۆیە نیازی بووە، لەبەر سێبەرەکەی بڕوات، بە بیستنی دەنگی سۆزێکی ئاسوودە و بەخشندە وەربگرێت، بەڵام ئەوەی نەکردوە.

کوڕ و کیژی خەڵکەکە دەڕۆن، لەناو تورکیا دەردەچن، دەگەنە ئەڵمانیا لەوێ

بێدەنگ ترســاو ون دەبن، بەڵام کوڕەکەی ئەو، بە دەنگ و ســازەکەی، بە گۆرانی و سروودەکانی ئەنقەرە دەهەژێنێت، بەغدا دەترسێنێت، لە قامشلی دەنگی دەلەرێتەوە. ناچێتــە بەر ســێبەری بەژنی درێــژی پیاوەکە و پێی ناڵێت من لەجیاتی ئیســماعیل دەســتت مــاچ دەکــەم! ئەویــش پێی بڵێــت کوڕەکەم نــاوی بووە بە شــڤان! چیتر کوڕەکەم ئیســماعیل نییە، لەبەر رەحمەتی چەقۆکەی ئیبراهیم، تاســاو و گوێڕایەڵ دابنیشــێت، کوڕەکەم دەربازی دەبێت و ناوی بووە بە شڤان!

***

پاش ئەوەی لەیەکتری دادەبڕێن، ئەو پیاوە، دەکەوێتە ناو مێژووی عوســمانییەکان، تــورک و خەلافــەت و تورکیای نوێ. ئــەو مێژووە ئەوەنــدە دەخوێنێتەوە، ئەوەندە ســەرقاڵی مێژووی ئەوانە دەبێت! ئەو بێ ئەوەی بزانێت و هەســت بەوە بکات، خۆی لەبیر دەکات. ئەو، پاش ئەوەی دەچێتە ناو قۆزاخە رەنگاورەنگە ســەر بە قەوزە و کرۆ و کەســکایەتییەکەی مێژوو، رەنگی دەگۆڕێت. دەچێتە ناو لاپەڕە زۆر کۆنەکان و پەلامــاری مێروولــە و رزیــن و نەمانی لاپــەڕەکان دەدات، تــا مێژووەکە نۆژەن و لەســەر پێ بمینێتەوە. لەو کاروانە ســەختەدا، لەناو ژوورە تاریکە کۆنەکان، لەگەڵ مێژووەکەی، لە سەرانســەری جیهان ــبێجگە لە تورکیاـ کەم شاناز و پیرۆز سەیری کراوە.

ئەو ماوەیەک دەبێتە نووسەرێکی دەسەڵاتداری ناو کۆشک و سەراکانی عوسمانییەکان، لــە مەیــدان و ســەراکانی ئەســتنبۆل و ترابــزۆن، دواییش دەگاتە حەلــەب. دەبێتە باشــکاتب و نووسەری ئینکشاری و والی و بەگەکان. بۆ زۆرتر کارکردن دەگەڕێتەوە وڵاتانــی بەلقــان، ئەوانەی بــە هەموو ئاراســتەیەک زامدار و ئەتککراو و ســووتاوی ئەو ســەردەمە بوون. ئەوانەی بەردەوام و ماوەیەکــی زۆریش هەموو پیرۆزییەکانیان ریســوا دەکرێت، هەموو جوانییەکانیان بە رۆژی رووناک و سەرکەشــانە دەبردن. بە بژارکردن؛ کچ و ناز و شــیرینی و کارامەیی و زانینیان دەبردن.

ئــەوەی لەنــاو مێژووی عوســمانییەکان شــاناز و بەختیار شــەونخونی پەرۆش بێت، دەبێت بە پاپۆڕەکانیان، لەگەڵ ســوپاکانیان، لە رم و شــیر و دوایی تۆپ و بارودی گڕداریان، لەگەڵ پەلاماردان و هێرش و دانوســتانی عوســمانییەکان دەڕوات و دوور دەکەوێتەوە!

مامۆســتاکە لەگــەڵ مێژووەکــە، یــان لەبــەر رۆژگارەکــە، زۆر لەمێــژە کوردبوون و

کوردایەتــی تــەڵاق دەدات، چونکە دەیزانی کوردبــوون و کوردایەتییەکە باجی گران و قــورس بووە. ئەوەی لەو کاروانە ســەختە درێژە ماوەتــەوە، قوربانی زۆری داوە، ئەوەی بەرهەڵســتی نەکردوە، باڵای کردوە، هەڵســاوەتەوە، گەشــەی کردوە، بەڵام نەیزانیوە یان هەســتی بەوە نەکردووە، ئەو کەســێکی لاواز و سیس و چەماوە بووە. بەردەوام کەســانی گەش و ســەرکەش و زیتەکان گیراون، کــوژراون، یان دەربازیان بووە، دەربازبوونیش لەو رۆژگارە ئازایەتییە.

ئــەو لەناو مێژووی عوســمانییەکان کاڵبۆتەوە. لەگەڵ حوبری رەش و شــینی ســەر دۆکومێنتەکان. لەگەڵ فڕین و هەڵوەرینی لاپەڕەی دۆکومێنتەکان. تا دۆکومێنتەکان نەمــرن، نەفەوتێــن، ئەو نــەرم نەرم رەنگی نووســین و فەرمــان و هزرەکەی ئەوان دەگرێــت! تــا دۆکومێنتەکان بژیــن، قوتابییەکان، دەباتە ســەر کۆنە نووســینەکان و فێریــان دەکات! لــە خــۆی زۆرتر، لە کۆنــە گوندەکەی زۆرتر پەرۆش و شــەیدای دۆکومێنتە عوسمانییەکان بووە.

تورکیا، مێژوو و دەســەڵات و نووســین و کەلتووریش عوســمانییەکان لەبیر دەکات، زۆریــش لــە میللەت و زانکۆ و ئەرشــیفیش نەفرەتی دەکەن، بــەڵام ئەو دەچێتە ناو مێژووەکە، زۆر تێدا قوڵ دەبێتەوە، دەخنکێت و دەربازی دەبێت. تورکەکان دەستی دەگرن و دەریدەهێنن. لەناو دەریا و زەلکاوی عوســمانییەکان دەخنکێت و نامرێت! بــەڵام لەورۆژانــە، کە دوو کیــژە هەولێرییەکــە روو لەو زانکۆیە دەکــەن! دەیانەوێ مێــژووی تورکیــا بخوێنن، ماســتەر لە مێــژووی کۆن و نوێی تورکیــا وەربگرن! ئەو دەچێتــەوە ناو لانکــی دایکی و رایدەژەنن. زیندووی دەکەنەوە، پرســی پێ دەکەن، داوا دەکەن، کتێب و نووســینەکانی دەخوێنەوە. ئەوانە دووبارە کابرای پرۆفیســۆر زینــدوو دەکەنەوە، گەنجی دەکەنەوە، منداڵی دەکەنەوە، دەچێتەوە ناو بێشــکەکە، نــاو باوەشــی دایکــی و دووبارە بــە کرمانجی، بــە کوردییە شــیرینەکە رایدەژەنێت و مەمکــی لــە زاری دەنێــت و دووبارە شــیری کوردی و ســۆزی کــوردی لە دەمی دەکاتەوە.

❋❋❋

چەند ساڵ بوو، ئەو لە هەموو رایەڵەکانی دایک و باوک و ئیسماعیل ئایگون ـ شڤان پەروەر ـ پچڕاندبوو. هیچ ئامرازێکی کوردانەی بە ژیان و رۆژانەی ئەودەمانە نەمابوو. ژنە تورکەکەی، خوێندنەکەی، زانکۆ و پیشــەکەی هەموو ئاســانکاری دەکەن، بواری

بۆ ساز دەکەن، ئەو زۆر و دروست تەواو بسڕێتەوە. بسڕێتەوە و ئیسماعیل ئایگون لەبیر بکات و نەمینێت و شاری ئورفا و ڕۆژانەی منداڵی خۆی و سۆزی باوک و دلۆڤانی دایکیشی لەبیر بکات! ئەو هیچ پەیوەندییەکی بە کورد و کوردستان نەمابوو. یادگارییەکی بچووک و کەم و داوێکی باریکی بە کوردستان و کرمانج نەمابوو.

تەواو دەسڕێتەوە، بەڵام پرۆفیسۆرەکە کوردییەکەی، زمانی دایکی باش و جوان لەبیرمابوو. چەند ساڵیش بوو، قسەی بەو زمانە نەکردبوو. بیریشی لەوە نەکردبووەوە، چیتر هاموشۆی خەڵک و زمان و بیرەوەری کرمانجان بکات. ئەو ماوەیەکی زۆر بوو گوێی لە گۆرانی کوردی نەگرتبوو. قوتابییەکی نەناسیبوو، لەناو باڵەخانەکەیان ژن و مێردێکی نەبینیبوو، بڵێن ئێمە کوردین لە وان، یان لە شاری مێردینەوە هاتووین! چونکە ئەو نیوەی تەمەنی لەناو مێژوو و دۆکومێنتە کۆنەکان بەڕێکردبوو. ڕۆژێکیان بیری لەوە نەکردۆتەوە چەند لاپەڕەیەک، چەند دێڕێک، ناوێکی کوردی، هەواڵێکی کوردستان بدۆزێتەوە، بنووسێتەوە، یادیان بکاتەوە، تا ئەو دوو کیژە هەولێرییە بۆ خوێندنی ماستەر، دێنە زانکۆی مەراش. ئەویش لەوێ مامۆستای مێژوو بوو، سۆزی بۆ ستران و پەیڤی کوردی دەجووڵێت و ئەو نەبەردییە دەکات، پێ لە جەرگی دەنێت، جورئەت دەکات، ئازایانە لە یوتوب، لەناو سەدان گۆرانی شڤان، سۆزێک بۆ بیستن و برین کولانەوە و دایک و گوندەکەی دەکاتەوە.

کۆچڕەوەکەی کوردانی باشوور، دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، نەورۆزە گەورە و گەرم و ئاگرە بڵندەکانی دیاربەکر و وانیش نایهەژێنن، نایگۆڕن. بەڵام ئەو دوو کیژە هەولێرییەی هاتبوون مێژووی کوردستان، ڕۆژانەی هەولێر لە سەردەمی عوسمانییەکان و جمهوریەت بخوێنن، پیاوەکە هەڵدەتەکێنن، بۆیە ڕۆژەکە، بەتەنیا بەدیار گۆرانییەکی شڤان پەروەر لە یوتوب دانیشتبوو، دڵگەرم و خەیاڵ و زۆریش سیس بۆ ژیان و هەڵسانەوە دانیشتبوو.

ئاشتی دەزانێت، مامۆستاکەی لەگەڵ خەیاڵی گۆرانییەکی شڤان پەروەر مەست بووەوە. بەو گۆرانییە، بەو سوتان و هەڵسانە گەرمە، لە دەفتەر و دۆکومێنتە کۆنەکان دوور کەوتوتەوە. بەو گۆرانییە گەڕاوەتەوە سەردەمی زانکۆ، خوێنگەرمی و سالانی حەفتاکان، بۆیە تا کیژەکە دەگاتە سەر سەری و سڵاوی لێ دەکات، ئەو هوشیار نابێتەوە، دەنگی گۆرانییەکە کەم ناکات، لە سۆزی گەرمی سترانەکە سارد

نابێتەوە!
ئەو نەدەبوایە گۆرانییەکە کز بکات، نەدەبوو دەســت و پەنجەکانی لەســەر ماوســی کۆمپیوتەرەکە ببڕێتەوە، پێویســتی بەوە نەبوو، کورســییەکەی بجووڵێنێت و روو لە کیژەکــە بکات. دەبوایە لەنــاو بازنەکەی خۆی، ئەو بازنەی تازە، رایکێشــابوو، ئەو خەیاڵــەی تــازە و درەنگیــش دەکەوێتە قوڵاییەکــەی بمینێتەوە و زۆرتــر بکوڵێت و راچڵەکێت.
کیژەکە دەگاتە نزیک تەمبوورەکەی ناو باوەش و رۆحی شڤان پەروەر بوو. پەنجەکانی دەگاتە ژێیەکانی تەمبوور، یان سازەکە. ئەو هاتووە و نەرم نەرم شەپۆلی دەنگەکە دەبڕێــت. هەندێ لە وشــەکان دەناســێتەوە. ســەدان جار گوێی لەو ســروودە، یان گۆرانییەکــە بــووە. بەڵام دیارە مامۆســتاکە لەو زۆرتر ئاشــنای تەمبــوور و ئاواز و دەنگەکە ببوو. کێ دەڵێ لەگەڵ شــڤان پەروەر دایکیان خوشــک نییە. دووریش نییە بەیەکەوە لە رۆژانی زانکۆ، لە یەک بەشی ناوخۆ ژیابێت و زۆریش هاوڕێی یەکتریش بووبــن، بەیەکەوەش کاری سیاســییان کردبێت! هەژاری و داماوی زۆریان لە رۆژانی زانکۆش بەیەکەوە بەڕێ نەکردبێت!
❊❊❊
دەنگی گۆرانی و ســۆزەکە نەکوژاوەتەوە، دەنگ و سۆزی شڤان چۆن دەکوژێتەوە!؟ چۆن و کەی تەواو بووە! لەوەتی گۆرانییەکانی ئەو پەخش بوون، بەردەوام سەدایان هەبووە، رووبار بوون و نەوەستاون! بۆیە لەکاتی قسەکردنیان، گۆرانییەکە باڵەفڕەی بوو، دەنووکی لە زام و شیرینییەکان دەدا، نەرم نەرم دەچووە ناو دڵی هەردووکیان، بەڵام دڕ و تیژیش دەچووە ناو کتێب و نەخشــەکانی ناو کلاســەکە.
- ئاشــتی، کۆشــش و ئیشکردنی تۆ سەنگین سەیر دەکەم، هەست دەکەم باش ئیش دەکەیــت و دەتــەوێ نامەکــەت زوو و باش تەواو بکەیت! «مامۆســتاکە بە ســۆزی گۆرانییەکە نەرم و نیان قســە لەگەڵ کیژە کوردەکە دەکات».
- مامۆســتا ئــەو ستایشــە بــۆ من و ماڵــەوە و مامۆســتا و گۆڕی باوکم شــانازییە، سوپاس، بە هەموو جۆریک هاوکار و پشتیوانی من دەکەیت. «دەفتەر و کتێبەکانی دەســتی لەسەر تەختەکەی بەرامبەر مامۆستاکە دادەنێت».
- کیژم ئەوە ئەرک و پیشەی منە. تۆ لەناو خێزانێکی هەژار، لە زانکۆیەک مێژوویەکی دوورودرێژی لە زانســت و خوێندن هەیە، هاتوویت. ئەوان رەوانەت دەکەن، موچەت

بۆ دەدەن، ئاسانکاریت بۆ دەکەن، مۆڵەتت دەدەنێ، دەبێ منیش ریز لەو پرۆسەیە بگـرم! تۆ لـە زانکۆکەم وەردەگیرێت، دەبیتە قوتابی ماسـتەر لـە زانکۆکەمان، من دڵسۆز و خەمخۆری ئەو زانکۆیەم. شانازم فەرمانبەر و کارمەندی دەوڵەتم. دەوڵەت پشـتیوانی زانکۆکەی کردوە و منـی دامەزراندوە، رێزی تۆ گرتووە، تۆی وەرگرتوە. دەبێ منیش هاوکاریت بکەم، فێرت بکەم، نووسـینی ماسـتەر لە سـەدەکانی هەژدە و نۆزدەهەمی زاینی، واتە سـەردەمی عوسـمانییەکان، کە من زۆر پەرۆشـم، زۆریش خەمخۆر و دڵسـۆزی ئەو سـەردەمەم! لەمێژە چاوەڕوانم، قوتابی وڵاتانی سەردەمی عوسمانی، نەوەی نەتەوەکانی ناوچەکە، شوینە دوورەکان، پەرۆش، لە ئەرشیف و ناو و رابردوومان بکۆڵنەوە، بپرسـن! بزانن، عوسـمانییەکان چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خاک و وڵات و مێژوو و کیژ و کوڕ و داهاتیان کردوە! حەزم دەکرد، مەبەستم بووە، توێژینەوەیەک لەو بابەتە بکەم، دەمەوێ بزانم میللەتانی ناوچەکە ـبێجگە لە تورکـ هەڵوێست و بۆچوونیان چۆن بووە، چییان بیستووە، چییان بۆ گێڕاونەتەوە، چییان زانیوە، دەیانەوێ چیتر بزانن! سـەرکردە و بەرپرسـی حکومەتـەکان، دەوڵەتەکان، زانکۆکان، مۆزەکان، ئەرشـیفخانەکان، کتێبخانەکان، توێژەرەکان نەهاتن، کەسـیان بیر لەوە ناکەنەوە، لەناو ئەرشـیفی عوسـمانییەکان چ نووسراوە! هاوکاریت دەکەم، بۆیە وا باشـە تۆ سـەردانی ئەرشیفی عوسمانی لە ئەستنبۆل بکەیت!

- بچمە ئەستنبۆل «کیژەکە بەو قسەیە، یەکسەر دەگاتە ناو شارەکە، سەر دەریاکە، دیار مزگەوتە کۆنە گەورەکانی زۆریان زووتر کڵێسـای دێرین و کۆن بوون».

- ئا دەچیتە ئەسـتنبۆل، لەوێ دەچیتە ئەرشیفی عوسمانی، دەتوانێت هەموو ویست و داواکانت وەربگریت!

- زۆر پێویستە «کیژەکە دانیشتوە، جانتا بچووکەکەی و باوەشە کتێبەکەشی لەسەر مێزی نزیک مامۆسـتاکەی داناوە، سەرسام سەیری دەکات».

- زۆریـش پێویسـتە، دەتوانـم بڵێم یەکێکە لـە مەرجەکانـی تەواوکردنی خوێندن و نووسـین و توێژینەوەکەت! تۆش شـەرەفی ئەوەت دەبێت، یەکەم کەسـی لە هەموو عێراق لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لەناو ئەرشـیفە کۆنەکەی عوسـمانییەکان بکەیت.

- بە چاوان مامۆستا، لە ئێستاوە ئیش لەوە دەکەم بە زووترین کات بچم، دەرفەتێکی گونجاو بسازێنم.

- پێـش ئـەوەی بڕۆیت ئاگادارم بکەرەوە، ناونیشـان و رێنماییەکانی ئەرشـیفەکەت

بدەمێ!

ـ مامۆستا تۆ زۆر سەرت لەو ئەرشیفە داوە!

«وەڵامی ناداتەوە، بەڵام سەری بۆ دەلەقێنێت، وەک ئەوەی بڵێت، زۆر سەردانم کردوە، باشیش شارەزام».

***

شەش حەوت مانگە دوو کیژەکە لە شاری مەراش ماونەتەوە، دەخوێنن، دەوام دەکەن، ئاوێتەی جڤاتەکە بوون، زمانەکەیان زۆر باش بووە، لە کەشوهەوای ناو تورکیا و کولتوورەکەیان راهاتوون. دوو کیژە هەولێری یەکێکیان موحەجەبەیە، ئەوی تریان قژی بەرداوەتەوە و جاروباریش قەمیسی قۆل کورتیش لەبەردەکات، بوار بە هەوا و کزە بایەکیش دەدات، بچێتە ناو سینگی، کیژێکی زۆر بەپارێز و زۆریش وریایە.

ئەوان بۆ خوێندن هاتوون، بەیانییان بەیەکەوە لە شوقەکەیان دەردەچن و ئێوارانیش بەیەکەوە دەگەڕێنەوە. پێویستییەکانیان لەناو بازاڕە میللییەکان دەکڕن. لە سوپەرمارکێتی نزیک ماڵەکەیان، نان و زەیتون و سەوزە و شەربەت و شتە قورسەکان دەبەنەوە. زوو زوو بە تەلەفۆن قسە لەگەڵ ماڵەوەیان دەکەن. لە دایکیان دەپرسن، لەگەڵ برا و خوشکەکانیان قسە دەکەن. لە سەروبەندی سەرە مانگ و موچەکانیشیان تەلەفۆنێک دەکەن، دەیانەوێ بزانن موچە و پارەکانیان گەیشتووە، برادەران بۆیان وەردەگرن و دەگاتە ماڵەوەیان!

***

ئاشتی لە ژووری مامۆستای پرۆفیسۆر فاروق سویلەماز دەچێتە دەرەوە، بەڵام نازانێت دوای ئەو، دووبارە کابرا گوێ لە گۆرانییەکی تری شڤان پەروەر رادەگرێت، یان تەواو. ئەو جارەش بەرێکەوت بووە، ئەگەرنا ئەو پیاوە سۆزی کوردەواری هەر نەبوو! دووریش نییە زووتریش کابرا زۆر گوێی لەو راز و سۆزانە گرتووە. بەڵام خۆی دەرنەخستووە، باسی نەکردوە. راستییەکەی ئەو کەسێکی پسپۆرە لە بواری خۆی، بۆیەش لەو بابەتە دەرنەچووە، دریغیشی نەکردوە.

پاش ئەو جارەش، چەندان جاری تریش، بۆ چەندان پرسیار و داوا و نووسینەوە سەردانی مامۆستاکەی لە هەمان ژوور و لە ژوورەکانی تری ناو بەشەکانی کردوە. هەرگیز گوێی لەوە نەبووە، مامۆستاکە سترانێکی کوردی لە لاپتۆپەکەی بکاتەوە،

پەنجەکانــی لەگەڵ ریتمی ئاواز و ســۆزی گۆرانییەکی کوردی، یان تورکیش خەیاڵ ببووێــت، دووریش بڕوات و بگەڕێتەوە کن دایکی و گوندەکەی!

***

کیژەکە زوو دەســتە خوشــکەکەی دەدۆزێتەوە، دەیزانی لە بن کام دار، لەســەر کام کورســی، بەدیار کام نافوورە ئاوی ناو زانکۆکە دادەنیشێت، ئەویش دەیزانی ئاشتی لەکوێ بەدوای دەگەڕێت، چۆن یەکتری دەدۆزنەوە! دەفتەر و کتێبەکان لە باوەشــی پەیمــان دادەنێــت و هەر بەپێــوە، بەڵام بەڕووێکی شــیرین و ئاکارێکی نەشــمیل و کەیفساز دەوەستێت؛

ـ ها چییە ئاشــتی، قســەیەکت پێیە! «لەبەر ئەوەی کتێبەکانی لە باوەش دادەنێت، نیگەران و تووڕەش نابێت، دەیزانی قسەیەکی خۆشی پێیە، ئاسان، ئەوە لە ئاکاری دەســتە خوشــکەکەی دەخوێنێتەوە، چۆن ناخوێنێتەوە، ئەوان شەش حەوت ساڵە، بــەردەوام بەیەکــەوەن، راز و هیوا و دیتنیان زۆر نزیکە، لە خوشــک زۆرتر، لە خزم گەرمتر، لە هاوڕێیەکی ئاسایی دەوام و زانکۆ و خوێندن و کتێب و نووسین هاودەم و هاوڕێن».

ـ دەچینە ئەســتنبۆل! «ئاشتی شادمان پێی دەڵێت».

ـ کــەی و چــۆن؟ «ئەویش بەو قســەیە دەگەشــێتەوە، دەزانێــت بەیەکەوە دەچن، بەیەکەوە ســەفەرەکە دەکەن، ئەگەر ئیش و کاریشــی نەبێت، هەر بەیەکەوە دەچن، چونکــە هاوڕێــی نزیکــن، بەیەکەوە ماســتەر لەســەر مێــژوو دەکــەن. هەردووکیان زەوقیان لەیەک نزیکە، بۆیە بەیەکەوە دەبێ بڕۆن. یان هەرگیز لەیەکتری دانەبڕاون، مەعقوڵیش نییە بۆ ســەفەرێکی ناو ئەستنبۆل بەیەکەوە نەڕۆن».

ـ مامۆســتا فــاروق گوتــی دۆکومێنــت واتە مێــژوو. مێژوو، بێ دۆکومێنــت ناکرێت، نابێــت، دەبــێ بچیتە ناو ئەرشــیفی عوســمانی. لەوێ بــەدوای بەڵگەنامە کۆنەکانی عوســمانییەکاندا بگەڕێت! شــارەکە، ناوەکان، کەســایەتییەکانی ســەردەمەکەی تۆ ئیشــی لەنــاو دەکەیــت، بدۆزیتــەوە. وەرە بەو بۆنەیە، بەو ســەفەرەی لــە داهاتوو دەیکەین، شــۆربایەکی یایلەی تورکیت بۆ دروست بکەم.

ـ ســوپاس و زۆریشــم پێ خۆشە، بە دەستی تۆ شۆرباکە بخۆم، جەژنە!

ـ دەیکــەم، بەڵام جوان بەردەســتیم بکە و ددان بــەوە دابنێ کابانی یەکەمم! «دەم نــادەم سەرپۆشــەکەی ســەری، ئەوەی چەنــدان گوڵی بە چەندان رەنــگ تێدا بوو،

توندتر دەکاتەوە، حیجابەکەی زۆریش توند بوو، بەڵام ئەو دەستی لەوە راهاتووە، هەر رایدەکێشا و گوایە توندی دەکاتەوە».
- بەردەستیت دەکەم و کابانی یەکەمی و بەیەکەوەش دەچینە ئەستنبۆل. «زۆر جار بە ئاشتی گوتووە، دەزانی سەردەمی نوێی تورکیا زۆر سەخت بووە. شەڕەکان، ململانێیەکان، بوونی هاوکێشەکانی ئینگلیز و فەرەنسا لە ناوچەکە، دەرچەی کۆتایی و دەرهاویشتەکانی جەنگی یەکەمی جیهان و مانەوەی بەشێکی زۆری یۆنانی و ئەرمەن و شۆرشەکانی کوردستان، کۆچبارییەکان، ئەدی هەنگاوی گۆڕینی سیستەمی ئیسلامی و عەرەبی و گۆڕینی نووسین و ئەتەکێت و جلوبەرگ و رۆژەڤە سیاسییەکەی ناوچەکە. ئەویش وەڵامی دەداتەوە، راستە، قسەکانت تەواوە، بەڵام بابەتەکەی تۆ زیندووە، نووسینی زۆرە، رۆژنامەکان ماون، سەرچاوەکان بەئاسانی دەست دەکەون! ژیاننامە و یادنووس زۆرن، خۆیان تورکەکان ئیشی زۆریان لەسەر ئەو سەردەمە کردوە، یۆنانییەکان، کوردەکان، عەرەبیش زۆریان نووسیوە».
- دەزانی چیم دەوێ، شۆرباکە چی پێویستە، دەزانی!؟ «کیژە کابانەکە دەڵێت».
- هەموو شتمان هەیە، بڵێ و تەواو، خەمی ئەوەت نەبێت. برنج و ئارد و هێلکە و ماست و پوونگی تەڕ و کەرە و ئاو و لیمۆ و خوێ دەوێت! هەموو ئەو شتانەمان هەیە، بەس پوونگمان نییە!
- باشە لەسەر رێگای چوونەوەمان ئەوەش دەبەینەوە، بەڵام دەزانی پوونگ چل و دوو جۆری هەیە، کامیان گونجاوە، تۆ کام جۆرە پوونگ لەو شۆربایە بەکاردێنیت!
- کچێ ئەوەندە بە ئۆین مەبە. پوونگ هەر پوونگە. گیایەکی بۆندارە، چونکە لە زۆربەی گیای تر، حەز بە مەلەوانی ناو ئاو و خوناو دەکات. تەڕە، ئەوەش بۆنی خۆشکردوە.
شۆرباکە دروست دەکەن، بەیەکەوە بەدیار مەنجەڵە تیڤاڵە بچووکەکە دادەنیشن، ئاشتی دوو سی کەوچک بۆ پەیمان تێدەکات، ئەویش دەڵێت:
با سەرتووەکەی بەر تۆش بکەوێت، دوو کەوچک بۆ خۆت تێکە.

***

# زانکۆی جیهان ئەرشیفی کوردستان دادەمەزرێنێت

ئاشــتی رەحمان بەڕێکەوت نا، بە بەرنامە دەگاتە بەشــی مێژووی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکــۆی ســەلاحەدین. ئەو وادەزانێــت بەوەیان خەون و ئارەزووەکــەی باوکی بەدی دێــت. لەو بەشــەدا، پــەرۆش و زیرەکانە چوار ســاڵی خوێندنەکەی تــەواو دەکات، تێــدا لــە قوتابییــە یەکەمەکان بووە. زیــرەک بــووە، چونکە منداڵ بــووە، قوتابی مێــژوو بــووە، گەورەتــر بووە، هــەر وەک قوتابییەکــی مێژوو دەمینێتــەوە، دەگاتە ئامادەییــش هــەر قوتابی مێژوو بووە، لە کۆلێژیش بە حەقی خۆی وەک مامۆســتای مێــژوو دادەمەزرێــت. بــۆ فێربوون و زانیاری ســەیری مامۆســتاکان دەکات، چاو بە کتێبــە گەورەکان دادەخشــێنێت و زۆرتــر دەیانخوێنێتــەوە. وادەزانێت و باش لەوە تێگەیشــتووە مێژوو و خوێندنی مێژوو دەریایەکی زۆر قوڵە.
بابەتــی مێــژوو وەک چەمک و بابەتی جوگرافیا نییە. مێژوو، وەک ئەدەبی کلاســیک نییە. مێژوو، قۆناخ و سەردەم و دەسەڵات و ناوچەی زۆر پانوبەرین و شین و سووری هەیــە. مێــژوو، تۆماری هەموو بەســەرهاتەکانی مرۆڤە. دەفتەر و ســینگی خەڵک و دەســەڵاتدار و رەشــوڕووت و برســی و دەوڵەمەندەکانیشــە. ئەوانەی بۆ مان و ژیان کۆششــیانکردوە، مێژوو سەرکەشــانە ناویان دەبات. ئەوانەی بۆ مان و زەبروزەنگی خوێناوی کۆشک و شوورە و قەڵاتیان بەرزکردیتەوە، باسی ئەوانەش دەکات. مێژوو خوێندنەوە و زانینی نووســراوەکان و هەڵهێنانی نەنووسراوەکانیشە. مێژوو کتێبێکی زۆر گــەورەی چەنــد بەرگە. هەر بەرگ و بەشــێکی، باس لە دەســتە و ژمارەیەک و رەنگ و رووداوێک دەکات. مێژوو بەقەد دەریا کۆن و بەرین و قوڵ و ترسناکیشــە.

ئەوەی مەلەوانی نەزانێت، ئەوەی کەشـتی و سـەوڵ و بەلەم و دوو باسـکی گەورە و بەهێـزی نەبێـت، ناتوانیت لەو دەریایە دەربازی ببێت! رووڕەشـن ئەوانەی مێژوو بە درۆ و چەواشـەکاری دەنووسـنەوە و بڕوای پێدەکەن! کتێبەکانیان دەسـووتێنن، دۆکومێنتەکانتان شـەرمەزارییە، ئەگەر بەدحاڵ و بەدمەسـت بنووسـرێتەوە! مێژوو بـە کەسـانی بەسـتەزمان و پـاک و شـیرینی وەک ئاشـتی، لەسـەر داوای باوکـە بەسـتەزمانەکەی دروسـت دەنووسـرێتەوە. قەڵەم و کۆششـێکی پاکی دوور لە هیچ مەبەسـتێک، بێجگە لە خۆشەویستی مێژوو هیچ مەرامێکی تری نەبووە.

***

پاش کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان و نەمان و شکان و دۆڕاندنی سەلتەنەتی عوسـمانییەکان. شـاری مەراشـی تورکیا، دەکەوێتە ژێر دەسـەڵات و فەرمانڕەوایی فەرەنسـییەکان. ئەو بەشـە کێکە، دەکەوێتە سەر خوانی ئەوان «فەرەنسییەکان»، شـارەکە دوایـی لـە ڕۆژانـی داگیرکردنەکە، لە ئەنجامـی لایەنگیرییان بـۆ ئەرمەن، هەڵچوون و یاخیبوون و پرۆسـەی بەکۆمەڵکوژیی ئەرمەنەکان. ناوی شارەکە دەبێتە قارەمان مەراش.

تورکەکان، سـوپای کۆماری چۆک نادەن و شـارەکە لە داگیرکەرە فەرەنسـییەکان وەردەگرنـەوە. فەرەنسـییەکان ملکەچ، یان بە پەیمانێکـی نێودەوڵەتی لە ئەنجامی دووبـارە دابەشـکردنەوەی کێکەکە، ویلایەتی حەلەب، کە شـارەکە سـنجقێکی ئەو ویلایەتە بووە، وا دابەشـدەبێت، بەشـێکی دەکەوێتە ناو سـنووری دەوڵەتە تورکییە نوێیەکـە، بـەڵام بەشـە زۆرەکەی دەکەوێتەوە نـاو تورکیای نوێ. لەو دابەشـبوونە نوێیەدا، شـاری حەلەب دەدرێتە سـوریا و لوبنان، دوایی دەبێتە شـارێکی سـوریا. شـارەکە لەو سـنوورە و لەو دەسەڵاتەدا، چەند کەڤنار و شاناز و هەڵکەوتووە بووە، لە ڕۆژگاری هاوچەرخ ئەوەندە و زۆریش؛ تەڵخ و زامدار و بەسـۆ بووە!

لەو هێرش و ململانێیەدا، تورکەکان دەگەنەوە سـەر میرات و نووسـین و ئەرشـیفی عوسـمانی و دەیپارێزن. ئەرشـیفی نزیکەی پێنج سەد ساڵی حوکمرانی دەسەڵاتەکە زۆربـەی زۆری دەمینێتەوە، بۆیەش لە هەموو جیهـان، خەڵکی ناوچەکە، میللەتانی عوسمانییەکانی حوکمیان دەکەن، بەدوای ئەرشیفەکە وێڵ و پەریشان دەگەنە مۆزە و ئەرشیفخانە و زانکۆکانیان.

ئەسـپانییەکان لە سـاڵی ١٥٤٥ی زاینی یەکەم دەوڵەتن، بەڵگەنامە حکومییەکانیان

لەناو یەک بارەگا و سەنتەر هەڵدەگرن و دەپارێزن. لە ساڵی ١٥٧٨ی زایینی ئینگلیز بنکەی پاراستنی ئەرشیف دادەمەزرێنن. ئیتاڵییەکانیش لە ساڵی ١٦١١ی زایینی ئەوە چالاکییە دەکەن. بەڵام تورکەکان دوایی و زۆر درەنگ گەورەترین مەڵبەند و ئەرشیفخانە لەسەر سیستەمی نوێ دادەمەزرێنن. لەو ئەرشیفەدا، کیژێکی هەولێری زمانزان و دڵسۆز، لەسەر داوا و پێشنیاری زانکۆی جیهان بەدوای دۆکومێنتەکانی تایبەت بە کوردستان پەرۆش و زانستانە دەگەڕێت.

***

خاوەنی زانکۆکانی جیهان لە هەولێر سێ کەس ئەکادیمی رەوانەی ئەستنبۆل دەکات. پارەی رۆژانە و فڕین و مانەوەیان بۆ دابین دەکات. خاوەنی زانکۆکە بەنەرمی و برایانە پێیان دەڵێت:

ئێوە دەچنە ئەستنبۆل، لە باشترین هوتێل دابەزن، لە باشترین بوفیە خواردن بخۆن، دەتوانن کە گەڕانەوە دیارییش لەگەڵ خۆتان بۆ ئەزیزانتان بێننەوە. من خزمەتتان دەکەم. ئامادەم هەموو پێویستییەکانت بۆ ئاسان و مەیسەر بکەم. بڕۆن لەناو ئەرشیفەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەدوای ناوی کورد و کوردستان و هەولێر و هەموو شارەکانی تری کوردستان بگەڕێن. ئەوانە بدۆزنەوە، کۆیانبکەنەوە، بیانکڕن. دەمەوێ لەو زانکۆیە، بەشێکی گرنگ بۆ ئەرشیفی کوردستان دامەزرێنم. کەسانی لێزان و بەئەزموون ئیش لەناو ئەرشیفەکە بکەن، وەک هەنگ لەناو شانە جوانەکانی ئەو گوڵزار ئیش بکرێت، چالاکییەک رۆژانە بەرهەمی هەبێت، وەستانی نەبێت! چونکە دڵنیام ئەرشیفەکە دەوڵەمەندە و بابەتی زۆری تێدایە، حوکم و دەسەڵات و نووسینی پێنج سەدە لە مێژوویەکی گەرم و هەستیار، باڵکێشە و کەم نییە!

«ئەوان، لەسەر دەریا سەیری باڵندە و ئاو و کەشتی و جوانییەکانی ئەو شارە دەکەن. ئەستنبۆل دەریای زۆرە، لەناو دەریاش هەڵقوڵاوە، بۆیە زوو بووە بە پایتەخت! دەچنە کۆڵان و دوورگەکانی؛ ژنە رۆماننووس «ئەلیف شەفەق» و هەڵگری خەڵاتی نۆبلی ئەدەبیات «ئورهان پامۆک»یش پێیان جوان بووە. سەیری منارەی مزگەوتە کۆنەکانی دەکەن، باڵەخانە باریکە بچووکەکانی؛ بە رەنگ و بە پەنجەرە و بە باڵ و پاسەوانی نەورەسەکان بوون بە تابلۆ، سەرسامیان دەکەن! کۆڵانەکانی کارەکتەری رۆمانەکانی ئەوان؛ تێدا کەساس و عاشق و ماندووش ژیاون، دەدۆزنەوە!»

سێ ئەفەندییەکە، لەناو شەقام و کۆڵانە کۆنەکانی شارەکە پیاسە دەکەن. دوو لەوانە جانتای بچووکی چەرمیان لە شانە. دەڕۆن و یەکتری جێدەهێڵن و دەگەنەوە یەکتری. یەکێکیان سەیری باڵەخانەیەکی سێ نهۆم، دوو نهۆم، دوو باڵەخانەی رەنگ نارەنجی، یەکێکی خەنەیی پەنجەرەکانیان دارە، بۆیەی دەرەوە و سەر پەنجەرەکانی کاڵ ببونەوە، هەڵوەستەیان پێ دەکەن و دادەمینێن! هیچیان یادگارییان لەناو ئەو باڵەخانانەدا نییە! هەر چەند لەناو کۆڵانەکانا ئاودیو دەبن، دووردەکەونەوە و دەچنە ناوچەی جەنجاڵتر بە رێبواران، بەڵام کشومات و بێ جووڵەن لە سەرنشین، هەموویان نهۆمی خوارەوەیان بووە بە کافتریا و شیرنەمەنی و جوانکاری و نمایشگا، بەو کەشە پەرۆش و گەنجیش دەبنەوە. دەبینن، لە کافتریاکان، دوو دوو کیژ و کوڕانی لاواز، دوو پیرەژنی ئەوروپایی، گرووپێکی ژاپۆنی، ژن و پیاوی کورتەباڵا لەسەر کورسی داری ناسکی تەسک، بەدیار فنجانی قاوە و پارچەیەکی ناسکی شیرینی دانیشتوون! ئەوانیش دادەنیشن، پشوودەدەن، بەرنامەش بۆ رۆژانی سەردانی ئەرشیفەکە دادەنێن.

ئەوانیش، هەموو رێبوارەکانی ناو ئەو شەقامانە، بەر دەرگای باڵەخانەکان، ناو ژوورەکان، یادگاری ئەو شارەیان نەپۆشیوە، نەدیوە، بەڵام سەربردەی رۆژی یەکەمی هاتنی عوسمانییەکان و وێرانکردنی مێژوو و شارستانی دێرینی سەرنشینە دێرینەکانی دەزانن. ئەوانە و زۆربەی گەشتیاران، ئەوە دەزانن، چۆن پاش رووداوی کشانەوەی ئینگلیزەکان لە قوبرس و وروژاندنی دۆخە سیاسییەکە، ئاڵۆزییەکانی نێوان یۆنان و تورکیا، یۆنانی و ئەوانەی بەرەچەڵەک یۆنانی مابوونەوە فەرهود دەکرێن. ئەوانە ریسوا دەکرێن. ئەوە کەم بیستراوە، نووسراوە. بەڵام ئورهان پامۆک، لە رۆمانەکانی، دوایی لە کتێبەکەی «ئەستنبۆل» ئاماژە بەو رۆژە تاڵانە دەکات و وەک مێژوو لە کتێبێکی ئاماژەی پێداوە.

کەسەکانی ناو رۆمانەکە، نووسینەکان؛ کز و شەرمەزار ئەوە دەگێڕنەوە و دەڵێن: رۆژانێکی شووم بوو، کە تاڵانی بازاڕە گەورەکان و ماڵە جوانەکانیان لە ئەستنبۆل دەکرد. چییان بۆ گێراوەتەوە ئەو باسی دەکات!

سێ ئەفەندییەکەش هاتوون لەناو ئەرشیفی عوسمانییەکان، زۆر بابەت و رووداو بدۆزنەوە! لەناو کافتریایەک بەدیار قاوەی ناو فنجانێکی ناسک، ژێرەوەی وێنەی نەورەسی بچووکی دوو رەنگی لەسەرە، دادەنیشن، دەیانەوی بەیانی و رۆژانی دوایی

بچنە عوسـمانلی ئەرشیفی! گەنجینەکە بدۆزنەوە.

***

هـەر لەورۆژانـە، لەودەمانەی ئەو سـێ مامۆسـتایە بۆ دۆزینـەوەی دۆکومێنتەکانی کوردستان لە ئەستنبۆل بوون، سێ کەسی تر، هەرسێکیان لە ئەوروپا، بەڵام خاوەن بیرۆکەکە، «ئاسۆ»، پیاوەکەی تازە ماستەری لە بیناسازی لە ئەمریکا وەرگرتبوو، ئـەوەی لەپـاش رۆژەڤـی ٣١ ئابی ١٩٩٦ لەگەڵ سـەدان کارمەند و کاربەدەسـت و کارکەری کورد بەرەو ئەمریکا دەڕۆن. ئاسـۆ هاتووتە ئەسـتنبۆل، بە پارە و داوا و راسـپاردەی خۆی دوو کوڕە هەولێری؛ یەکێکیان دانیشتووی شاری هامبۆرگە، ئەوی تریـان لە شـارێکی هۆلەندی دەدۆزێتەوە. ئەوانەی بەیەکـەوە لەگەڵ برازاکەی لەناو شـوقەیەکی ناڕێک و هەرزان و شـڕی ئەو گەڕەکەی ئەسـتنبۆل دەژین. بەر لەوەی بەرەو سـنوورەکانی یۆنان بەڕێبکەون. لە ژوورەوە دەبن و ناچنە دەرەوە، یەکێکیان شـەوانە، درەنگیش، وەک شەمشـەکوێرە، وەک گەڵایەکی وەریوی پایز، ترساو بەڵام ئازاش بەبێ خشـپە و دەنگ و کۆبوونەوە، بە دزی و نەرم بۆ کڕینی؛ نان و خەیار و تەماتـە و پەنیـر و ئـاوی خواردنەوە و تەلەفۆنکـردن، دادەبەزێتە خوارەوە و ناو کۆڵان و سـەر دەریاکەش! لە شـوقەیەکی کۆنی رزیوی ئەو شـارە، کەساس و داماو و ترسـاویش دەژین، تا بوار دەدۆزنەوە، دەربازیان بێت و بەرەو یۆنان بەڕێبکەون.
ئەو ـئاسۆـ پاش کۆشـش و پرسـیار و سـەفەری کەمپەکانی ناو ئەڵمانیا. ئەو دوو کـوڕە دەدۆزێتـەوە، ئەوانەی لەکاتی مردنی برازاکەی لەنـاو خاکی یۆنان، بەیەکەوە دەبن، ئەوانیش تەرمەکەی دەنێژن! بەیەکەوە هاتوونەتە ناو ئەسـتنبۆل، ئاسـۆ دوو کوڕەکـەی هێنـاوە. ژیانی رۆژانەی ناو ئەسـتنبۆل و شـوێن و چۆنیەتـی مردنی بۆ بگێڕنـەوە، چـۆن مرد و چۆن دەینێژن، بەیەکەوەش دەچنە سـەر گۆڕە بێنازەکەی، ئەویش وردەکارییەکە ریکۆرد دەکات، فیلمەکەش لەناو کاسێتێکی رەشی گەورە، بۆ برا گەورەکەی دەنێرێتەوە. ئەوەش مێژوو و ئەرشـیفە!
بڕۆن ـدکتۆر نەوزاد بەناوی زانکۆ جیهان دەڵێتـ دڵنیام ئێوەش، زۆرتان بە ترانزێت و مانـەوەش لـەوێ ژیاون. هەمووتان شـارەزای ناوی شـەقام و کۆڵانەکانن. دەزانن لـەکام شـەقام و ناوچـە هوتێلی خاوێن هەیە! من دەمەوێ لە ئەرشـیفی عوسـمانی «عوسـمانلی ئەرشیف» ئیشـم بۆ بکەن، خۆتان بە بەڕێوەبەرەکانی ئەرشیفخانەکە بناسـێنن، لێـی نزیـک ببنـەوە، خۆتان شـیرین و زانسـتخواز نیشـان بـدەن! هەر

دۆکومێنت و بەڵگەنامەیەک، هەر پەڕە کاغەزێکی کۆن، مۆرێکی شـین، پەراوێزێکی تەنیشت گەچراو، هەموو نووسینەکان، کامیان ناوی کورد و کوردستان و شارەکانی کوردستانیان بە سەرەوەیە، ناوی خەڵکی ویلایەتی موسڵ و زووتر ویلایەتی شارەزوور و بەغداش هەیە، ئەوەی وشەی هەولێری تێدایە، ناوی شارەکانی تێدا تۆمارە! ئینجا گرنگ نییە! ناوەکە چۆن هاتووە، باسـی چییان کردوە! ئەوانەم دەوێ.

مـن نەوزادم خاوەنی زانکۆکانی جیهان، دەمەوێ هەموو دۆکومێنتەکانی عوسـمانی، ئەوانەی ناوی ئەربل و شـارەکانی تێدایە بۆم بکڕن، کۆپی بکەن، سـەیریان بکەن، بیانخوێنەوە. دکتۆر وریا بڕۆن، خەمی هیچتان نەبێت، دەمەوێ لە ئەرشـیفخانەکەی عوسـمانی لە ئەسـتنبۆل، بزانن چ لەسەر کورد و کوردستان هەیە، بۆم سەیر بکەن، بەوردی پشکنینم بۆ بکەن.

- دکتۆر سـوپاس ئەو ئەرک و راسـپاردەت بە ئێمە سـپاردووە، خەمت نەبێت، ئەوە بۆ هەموومانە، بۆ هەموو شـارەکانە. «جەمال خەزنەداری وەڵامی دەداتەوە».

***

ئـەوان لە سـاڵۆنە سـپییە گـەورە رووناکەکانی ناوەندەکەی ئەرشـیفی عوسـمانی سەرسام، بەدوای بەڵگەنامەکان دەخولێنەوە، دەپرسن، بە زمانە شرە تورکییەکەیان، دەیانەوێ زەخیرەیەک لەسەر مێژووی کورد و هەولێر و هەموو کوردستان بدۆزنەوە. لەو سـەیران و پەریشـانییەدا، لەو سۆراخ و پرسیارە زۆرەدا تێدەگەن، مەڵبەندەکە، دۆکومێنتەکان زۆر بابەتی شـیاو و شایسـتەی تێدایە. باش دەزانن سـەفەرەکەیان بەخۆڕایـی نەبـووە، هاتـن و داواکەیـان مایەپـوچ نەبـووە، وەک هەنـگاوی یەکەم سـەرەداوێکیان دەسـتدەکەوێت. سـێ کەسـە شـارەزاکە دەزانن، مەڵبەندەکە باش پارێـزراوە، هەمـوو؛ دەق و نامە و نەخشـە و وردە حیسـابات و رەچەڵەکناسـی و دەفتەرە کۆنەکانی سـوڵتانەکان ماوە. نامەکان پارێزراون.

ئەوان لەو سـەفەرە ناپرسـن، بەڵام دوایی دەزانن لەو مەڵبەندە لە ئەرشـیفخانەکەی ئەستنبۆل، کە چوار سەد کارمەند بەردەوام، چوار سەد کەسی شارەزا لە پۆلینکردن و ئـاگاداری و چاودێری و رێنماییەکان ئامادە و ئیش دەکەن!

دەزانن سەدان کەس، دەیان توێژەر و خوێندکاری ماستەر و دکتۆرا و مێژوونووس روو لەو مەڵبەندە دەکەن! ئەوەش باش دەزانن، تورکەکان، بەڕێوەبەرایەتی ئەرشیفخانەکە شـانازن و بەگەرمی پێشـوازی میوانـەکان دەکەن، حەز دەکەن زۆرتـر رووناکبیر و

مێژوونووســان روویان تێبکەن و ســەیری دۆکومێنتەکان بکەن. تورکەکان پەرۆشــن و دەیانەوێ بە جیهان بڵێن شارســتانیەتی عوســمانییەکان، تورکەکان، ســەردەمی ســەڵتەنەتی عوســمانی ئەرشیفی دەوڵەمەندیان هەبووە. ئەوان تا رادەیەکی زۆرباش بایەخیــان بە سیســتەمی نووســین و پۆســت و بەڕێوەبــردن داوە! قەڵەم و حوبر و کاغــەز و پۆســتەچی و تەتەرەکانیان، ســنووری وڵاتانی زۆریان بڕیــوە، نامەکانیان کاریگــەری و پیــرۆزی هەبــووە. تورکــەکان دەیانــەوێ؛ بۆچوون و ئامــاژەی بوونی دڕندەیــی و تــەلان و کەنیزەی کچان لە مێژووەکەیان بڕەوێننەوە. غەزا و داگیرکردن و فتوحاتەکانیان بگۆڕن، بە هەڵمەت و کۆششــی ئیرشاد و بەئیسلامکردنی ناوچەکە و پاککردنــەوەی کۆمەڵگەکــە لە کوفر و زەندەقە و لووتبەرزی بیزنتینییەکان.

***

**دەچێتە ناو دۆکومێنتەکان**

**٢٦ی زیلحیجە ١٢٦٣**

لەلایــەن والــی بەغدا نووســراوە لەگــەڵ دوو پارچــە داواکاری بــۆ ئەنجومەنی والی نێردراوە، لە یەکێک لە بەڵگەکانی دادوەری بەغدا دانیشــتووی قەزای هەولێر، پێش ئەوەی شەمسی خاتوون بە کوشتن مردووە، هاوسەرەکەی و کوڕە بچووکەکەی لەگەڵ براکەی مەحمود و حوســێن لەکاتی دانیشــتن، ئەنجومەنی شەرعی شەریف، مەحمود بــە گۆچانــی گەورە بەبێ حــەق کوشــتوویەتی، بەپێی بڕیاری دادگا لــە فەتواخانە بڕیاری لەســەر دراوە، لەســەر مەحمود ساخ بۆتەوە، کە خوشکەکەی کوشتوە. بۆیە بکوژ دەبێ لە پێنج ســاڵ تا ١٥ ســاڵ زیندان بکرێت، بەپێی فەرمانی سزای ئاسایی دەبــێ بکوژ بچێتە دەرســەعادەت و بە فەرمانی پاشــا لە مێــژووی زیندانییەکەی بۆ ماوەی پێنج ســاڵ لەناو کەشــتی بە سەوڵ لێدان سزاکەی تەواو بکات.

***

ئای لەو تاوانە گەورەیە، لەو کۆمەڵکوژییە گەورەیە، چ لەو شارە روویداوە، چەندان خەڵــک لەناوچــوون. لەو شــارە، لــەو قەڵاتە چ زیانێــک بە ئاوەدانی و ســەرژمێری شــارەکە گەیشــتووە! «ئاشــتی بە دەنگێکی نەرم و دوایی دەنگی بەرز دەکاتەوە، رەنگیشی سوور هەڵدەگەرێت».

- کوا کیژم ئێمە بەدیار تەلەڤزیۆنەوە دانیشتووین، وا سەیری هەواڵەکانیش دەکەین، برات دانیشــتوە، چ باس لەو کارەســاتە نەکراوە، ئەوە تۆ قسە لەسەر کام کارەسات

دەکەیت!؟
- ئـای لـەو کۆمەڵکوژییـە! «کیژەکـە، بەدیـار دۆکومێنتەکـەی لەسـەر شاشـەی کۆمپیوتەرەکەی گەورەی کردبووەوە، پیتەکان، هێڵکارییە سەیرەکەی تەنیا بەخۆی، هەر ئەو لەو شـارە دەیتوانی بیخوێنێتەوە، سەرسام ببوو».
تەنیـا ئـەو دەیزانی، نـە براکەی و نە دایکیشـی دەیانزانی چ لەو نووسـینە کۆنەی زۆرتر لە نەخشە و هێڵکارییەک دەچوو، نووسراوە! نەک ئەوان، هەموو مامۆستاکانی مێژوو، پسـپۆرەکانی مێژووی کۆن، نەخشەسازان، کەلەپوورناسان، تورکیزانان، مەلا و نووسـەری ناو تەکیە و مزگەوتەکانی هەموو کوردسـتان بە تەوێڵەو بیارەشـەوە، ناتوانـن ئـەو دۆکومێنتانە بخوێنەوە، تێناگەن! نەک ئەوانە ناکەن، کەسـیان ئامادە نییـە؛ چـاو و کات و رۆژانـەی خۆیان بەوە تەرخـان بکەن، تەنیا ئاشـتی رەحمان نەبێت.
دایـک و براکەی بە لاچاوێک سـەیرێکی لاپەڕەکە دەکەن، بـەڵام زۆر نزیک نابنەوە، نایانەوێ خۆیان بە بابەتێک سەرقاڵ بکەن، بۆ کیژەکە زۆر باڵکێشە، بەڵام بۆ ئەوان نـەک بایەخـی نییە، هەر نایانـەوێ هیچی لێ بزانن. بەڵام کیژەکـە لەبەر خۆییەوە، بەو شـەوە، لەسـەر پارچە مافورێک شـوێنی دانیشـتنی خۆی کردۆتەوە، پشتی بە کەرەوێتە دارە درێژەکەی ناو هۆلەکە داوە. ئەوان، هەموو نانی ئێوارەیان خواردوە و دایکی دوو جاریش بانگی دەکات واز لە نووسین و خوێندنەوە بێنێت، بێت بەیەکەوە پـارووە نانێک بخۆن، ئەویش بە منگەمنگێک وەڵامی دەداتەوە:
دایە دێم، با ئەوەش تەواو بکەم.
ئەو چ تەواو بکات!؟ بە چ تەواو دەبێت!؟ کەی کۆتایی دێت؟ خۆ تورکەکان خۆیان پێیان تەواو نەبووە! یان نەیانویسـتووە هەموو بەڵگەنامەکان بکەنە تورکی. ئەوەی ویسـتوویانە کردوویانە. ئەوەی ماوە ئیشـیان پێی نەبووە. لەوانە ئەوان، تورکەکان، دەوڵەتەکەی ئەندامی ناتۆیە، دەیان سـاڵە بە حەق و بە هەموو پرنسـیپەکان خۆی بـە ئەندامـی یەکێتی ئەورپاش دەزانێـت، ئەوان تەواویان نەکردوە. ئەرشـیفەکەیان نەکـردوە بـە تورکـی. بەشـێک لەوانـەی نەکراون بـە تورکی، بەڵام جـوان و باش ئەرشیفەکەیان پاراستوە.

***

خاوەنی زانکۆکانی جیهان، ئەو دکتۆرەی لەبەر ئەو زانکۆیە واز لە نەشتەرگەری دڵ

دێنێـت. لە نەشـتەرگەرێکی دڵ، دەبێتە خاوەن چەنـدان زانکۆ! ئەو دەیەوێ لاپەڕە بە لاپەڕە دۆکومێنتەکان، ئەوانەی ناوی کورد و کوردسـتان و ئەربیل و سولێمانی و زاخۆ و بارزان و سـیدەکان و رانیە و چەمچەماڵ و کەرکوکی تێدایە، ئەوانەی ناوی عەشیرەت و هۆزەکانی؛ جاف و خۆشناو و هەرکی و مزوری و بارزان و هەمەوەند و زێباری تێدایە. ئەوانەی ناوی شـێخەکانی بەرزنجی و نەقشـبەندی و قادری و تەکیە و مزگەوت و قوتابخانەکانی کوردسـتانی تێدایە! کۆبکاتەوە و توێژینەوەیان لەسـەر بکرێت.

ئـەو دکتـۆرە دەیـەوێ؛ بـە پـارە و دبلۆماسـیەت و قسـەی خۆش و دەسـەڵات و بانکەکانـی بنەماڵەکەیـان، دەسـتنووس و ئەرشـیفەکان بدۆزێتـەوە، بکڕێتـەوە، هەموویان کۆبکاتەوە لەناو قاسـەیەکی گەورە، لەناو دڵ و چاوی هەولێر شـوێنێکیان بۆ بکاتەوە، کلیلی یەکەمی بداتە دەست هەولێرییەکان، زمانزان و شارەزایان. کلیلی دووەم، کـۆدی دووەم، دانـەی دووەمیـش لەنـاو بانکەکەی خۆیان، بە شـێوەیەکی زانسـتی و تەندروسـت هەڵبگرێت. ئەو قاسـەیەی ئەو شـانازی پێـوە دەکات، ئەو سەرمایەی دەیپارێزێت، شیرین و بەهادارە.

ئەو چەندان سـاڵ وەک نوژدار و دکتۆر، لەناو دڵە برینـدارەکانی شـەڕە گەرمەکان، شـەڕە دژوارەکان وەک نەشـتەرگەر ئیش دەکات. دەسـت و پەنجەی دەباتە ناو ئەو دڵانەی، بەداخەوە ساچمە و ئاگر و زۆرداریییەکان قەدری ناسکیان ناگرن و بەدژواری زامداریان دەکەن. خوێنبەرەکان، خوێنهێنەرەکان، گوێچکەڵەی چەپ و راسـتەکەی، سـکۆڵە چـەپ و راسـتەکەی، دەمارەکانـی! لەو ئەندامـە هەسـتیارانە کار دەکات.

سەیری دەست و پەنجەکانی دەکات؛

ئای لەو پەنجانەی بە منداڵی چۆن رەنگم پێیان دەکرد، وێنەی زۆرم پێیان دەکێشا، دەموچاوی باوکم، رەوە باڵندەی سەر کێوەکانی بەرەو باکوور دەفڕین! گەورە بووم، دەستم ئاشنای نەشتەرگەری دڵ دەبێت! زۆر ماندوو بووم، پەرۆش بووم، بگەڕێمەوە نـاو رەنگ و هێڵکارییـەکان. بەڵام بەڕێکەوت، یان وەک دیاردەیەکی شارسـتانیەتی و پێویسـتییەکی هاوچـەرخ لەنـاو رەنگ و نووسـیندا بیر لە ئەرشـیف دەکەمەوە. ئارەزوومەندانـە دەمـەوێ پەنجەکانم بۆ بابەتێکی تر، ئەویش ناسـک و هەسـتیارە، ئەویـش پەیوەسـتە بە بوون و ژیان، ئەرشـیف و دۆکومێنت! دەمـەوێ گەورەترین ئەرشـیف، زۆرترین لاپـەڕە کۆنەکانی وڵاتەکەم لەنزیک خۆم و لەپەنا و دەسـەڵاتی

خۆم کۆبکەمەوە!

***

لــە ماڵەوەیە، قژە ڕەشــەکەی کردۆتەوە، ئەو زوو کە دەگەیشــتەوە دەرگای ماڵەوە حیجابــە ڕەنگاوڕەنگەکــەی دەکاتەوە، دەیەوێ کەمێک با و هەتاو لە بســک و کەزی و قــژی بــدات! بەر لــەوەی بچێتەوە دەرەوە، بــە دەرزیلەکان دووبــارە حیجابەکەی دەبەستێتەوە و جانتاکەی لە شانە، چاوەڕوان دەکات، لە دیار ئۆتۆمبێلە سپییەکەیان، ئەوەی براکەی لێیدەخورێت و ئەو دەگەیەنێتە دەوام، خۆشی دەچێتە دەوامی خۆی! دوو کتێبــی تورکــی لە دەســتە، زۆر کەس لێی دەپرســن، بــەڵام وەڵامەکانی لەبیر نەماوە، نازانی کێ یەکەم کەس بوو دەپرســێت. دایکی کێ بوو، ژنەکەی هاوســێیان لە دایکی دەپرســێت، کیژەکەت چ دەخوێنێت و چی خوێندوە!
پرســیارەکان هەمەڕەنگن، پەیوەســتن بەوەی کێ و کەی و لەکوێ دەکرێت! جۆری پرســیارەکان، ســادە و قوڵەکان، پرســیارە بە سوودەکان، پێویســتەکان بەردەوام کــراون و وەڵام دراونەتــەوە، بە بەڵێ یان بە نا. پرســیارێک کە گەورەیەک دەیکات. پرسیارێک منداڵانە و سادەیە، خوێندکارێک بەسۆز و گەرم دەیپرسێت، وەک ئەوەی بیەوێ بڵێت خۆزگەم بە تۆ دەچیتە دەرەوە و بابەتێکی هەســتیار هەڵدەبژێریت!
ئەو پاســپۆرتێک زووتر بە ســێ ســەد دۆلار دەردەهێنێت. سەرکەشانە، پارە و وێنە و نفووس و ئیمزایەکت لەســەر پســوولەیەک دەدەیتە ناسیارێک، بەڵام زۆری پارەکە وەک ئەمانەت دەمینێتەوە، تا پاســپۆرتەکەت لە بەغدا بۆ دەگەڕێتەوە.
ئای لەو میللەتە چەندان ســاڵە، لەوەتی هەیە، لەوەتی زمان و دەنگ و خاک و ئاو و کەلەپووری هەیە، لە هەموو شــتەکان بێبەشــە! ناتوانیت بەئاســانی بچێتە بەغدا، باشــە بۆ بچێتە بەغدا لەوێ پاسپۆرت دەربهێنێت!؟
کابــرا پێــی دەڵێــت کەمتــر لە هەفتەیــەک، بەڵام ئــەو زۆرتر لــە دە ڕۆژ چاوەڕوان دەکات. ڕەنگــە چاوەڕوانــی نەکردبێــت و زۆریش پەرۆش نەبووە، ئەودەمانە ئیشــی پێــی نەبــووە. دووریــش نییە لەو چەنــد ڕۆژەی لە کاتــی هاتنــەوەی دواکەوتووە، چەنــد جاریــش تەلەفۆنی کردوە. ئەوەندەی کابرا لــە هەولێر بووە وەڵامی داوەتەوە و بیانــووی ماقوڵی بۆ بدۆزێتەوە، یان لەگەڵ دوو ســوێندەکە، درۆی گەورەشــی بۆ کردووە. بەڵام دەرئەنجام شــەوێکیان کابرا تەلەفۆن دەکات، بۆ پارەکەی بەپەلەیە، شــەوە، لە ئەدریســی ماڵەکەیان دەپرســێت. ئەویش پەرۆشــە زوو پاســپۆرتەکەی

ببینێت، بزانیت ئیمزاکەی چۆن دەرچووە، وشەی ئەربیلەکە، ناوی خۆی نازناوەکەی چۆن دەرچووە، پێی دەڵێت:
- ماڵەکەی خۆمانت پێ بناسێنم! «کیژەکە لە تەلەفۆنەکەی بە کابرا دەڵێت».
- بەڵێ، پاسپۆرتەکەت هاتووتەوە، بێم و بیهێنم! «کابرا دەڵێت».
- ئێستا دەتەوێ بێیت، درەنگ نییە! ئێستا وەرە. دەتوانی!؟
- بەڵێ، دەتوانم، ئێستا دێم!
- باشە، منیش حەز دەکەم، وەرە لەسەر شەقامە سەرەکییەکە، لە باڵەخانە کۆنەکەی ئامادەییەکەی دیواری دەرەوەی لە دیواری زیندانێک بەرزترە، دیوارەکە بەردە، پانە بەرینە، سەرەوەی تێلە. وەرە لەوێ نزیکین.
«دیوارە کۆنەکە ئەوەندە بەرزە، تا رادەی ئەوەی باڵەخانەکە نهۆمی یەکەمی نقوومی ناو دیوار و شوورەکە بووە، خنکاوە، شەقامەکە نابینێت، قەدەغەیە کەس بیبینێت! پەنجەرەکانی نهۆمی سەرەوەش تەسکە، تەماوییە، تۆز و غوبار بەرچاوی گرتووە. ئامادەییەکە، هەزارەها ئەندازیاری لێ دەرچووە، سەدان بیناسازی لێ دەرچووە، ئینجا باڵەخانەکە، لە رەشماڵێک، لە ئۆردوگایەک، لە کۆگایەکی گەورەی بازرگانیکی چاوچنۆک و وریا دەچوو!»
وەرە لەوێ لەگەڵ تەواوبوونی دیوارە درێژەکە، لە گۆشەکەی تری شەقامە باریکەکەی تەنیشتی، مارکێتێک لەبەر زۆری کاڵاو تەنەکە و کارتۆن و دەروازە و رووبەندەکەی دیار نییە. لەو شەقامە باریکە وەرە ژوورەوە، لەسەر کۆڵانی سێیەمی دەستە چەپت، براکەم کوڕێکی باڵابەرزە، کاوبۆیەکی لەبەرە بەتەنیایە، سەد دۆلارت وەرگرتوە و دوو سەد دۆلارەکە و بیست هەزاریشم بەخشیش بۆت داناوە، وەرە چاوەڕوانت دەکەم.
- باشە، سوپاس، بە براکەت بڵێ بە ئۆپلێکی شین دێم!
- ئەو باش لە مارکە و مۆدیلی ئۆتۆمبێلان شارەزایە، دەزانێت!
کیژەکە بە براکەی دەڵێت:
برۆ لە سەری کۆڵانەکە چاوەڕوان بکە، ئێستا پاسپۆرتەکەم بۆ دێتەوە، تەواو بووە. نا نا منیش دێم، بەیەکەوە دەچین. براکەی پێی دەڵێت، چۆن بەو شەوە دێتە سەری کۆڵان و بە جلی ماڵەوە. ئەویش بەر لە براکەی دەگاتە دەرگای حەوشەکە و لەبەر خۆییەوە دەڵێت:
«کاکە من دەمەوێ بەو پاسپۆرتە دوور برۆم، بچمە وڵاتان، شارە دوورەکان،

زانکـۆکان، بخوێنـم، تۆ باسـی چ دەکەیت، دەڕۆم و چەندان مانگیـش ناگەڕێمەوە! سـەدان شـەویش بەتەنیاش دەمینێمەوە. ئەدی پاسـپۆرت بۆ چییە؟ بۆ سـەفەری دوورە، بۆ ئاودیوبوونە لە سـنوور، بۆ مانەوەیە لە دەرەوەی وڵات».

***

لـە سـیڤییەکەی بـۆ ئیشـکردن و دەوامکردنی زانکـۆی جیهان لە هەولێـر، کیژەکە دەنووسێت؛

من ماستەرم لەسەر هەولێر لە سەردەمی عوسمانییەکان لە زانکۆی سوتچو ئیمام لە شاری مەراشی تورکیا وەرگرتوە. دوو ساڵ و نیو لەوێ دەخوێنم. مامۆستاکەم فاروق سـویلەماز دڵسـۆزانە سەرپەرشـتی نامەکەی دەکردم. منیش زۆر بەدڵسـۆزی ئیشم کـردوە، خەمخۆری بابەتەکە و خوێندنەکەم بووم. لەگەڵ تەواوکردنی ماسـتەرەکەم فێـری زمانـی عوسـمانی دەبـم، تورکییەکەم باشـتر دەبێت. دەمەوێ لـەو زانکۆیە کار لـەو لقـە بکەم، ئیشـێک بکەم، لە ئارەزوو و ویسـتم نزیک بێـت. بەداخەوە لە کۆلێژەکانـی زانکـۆی سـەلاحەدین، بایـەخ بەو لقە نـادەن، نایانەوێ، یـان کاریان بەو شـێوازە زمان و نووسـینە نییـە. دەمەوێ بێمە ئەو زانکۆیـە بەڵکو دەرگایەک، پەنجەرەیەک، چالاکییەک سـاز دەکەم، نزیک بێت لە زانیارییەکانم.

ئەو نامەیە دەنووسێت، دەزانێت سەرۆکەکەی، ئەوەی دکتۆری دڵ بووە، نەشتەرگەری زۆری دڵـی زامـداری کردوە. ماوەیەکـی زۆر لە نەخۆشـخانە گەورەکانی ناو بەغدا، موسـڵ، لـە کلینکەکـەی ناو شـاری هەولێر، خەریکی دڵی نەخـۆش و ترپەی دڵ و هەناسەی سوار و دەماری گیراو و فشار و پاڵەپەستۆی خوێن بووە! ئێستا، بۆ ئەو سەردەم و بازاڕ و ناسین و بوارێکی ترە، هەموو ئاراستە و هەڵکەوت و پێشهاتەکان زۆر گـۆڕاون! دەیـەوێ ئیـش لـە دڵی کۆن و مانـدوو و بریندار و هەناسـەی جاران بکات! سـتافێک، دەزگایەک بۆ ئەو مەبەسـتە لەناو دڵی هەولێر و خۆی و زانکۆکەی بکاتەوە!

لـە چەنـدان بوار و شـوێن ئـەو داوا و هیوایە پێشـنیار دەکات. هەنـگاوی یەکەمی کردوە، سێ مامۆستاکە گەڕاونەتەوە، گوتوویانە ئەرشیفەکەی عوسمانییەکان بابەتی زۆری لەسـەر وڵات و میللەتەکەمانی تێدایە، بەڵام کەسـانی پسپۆری دەوێ، زمانزان و شـارەزای دەوێ! سـتافێکی دەوێ شـارەزای هەموو بوار و لایەنەکانی ئاو و دەریا و زمان و ژیانی تورکیا بن! سـتافێکی دەوێ، وەک رووبار بن، وەک رۆژ بن، ببن بە

ڕۆژ و زووش ببنەوە شەو!

***

ســەرۆک دەپرســێت، داوا دەکات، تەلەفۆنیش دەکات، پرس بە مامۆســتای مێژووی زانکۆکان دەکات! تا ڕۆژێکیان، دەنگێکی شــەرمن، کچێکی ســەرپۆش، هەولێرییەکی شــیرین وەک گەنــم، نەرم وەک وشــەی هەتــاو و خوناو، بۆ ئەو مەبەســتە داوایەک پێشــکەش بە زانکۆکە دەکات. داواکە دەگاتە بەر دەســتی دکتۆرەکەی لە دکتۆرێک دەگــەڕا، لەناو دڵی ئەرشــیفی عوســمانییەکان شــارەزا بێت. نەشــتەرگەری بکات، خوێنبەرەکان بکاتەوە، فشــارەکە کەم بکاتەوە، دەمارەکان بناســێتەوە، بەشەکانی دڵی دۆکومێنتەکان بناســێت و چارەسەری وشە سڕاوەکان، ناوە نەناسراوەکان، داوا کۆن و ســەربردە سەیرەکانی مێژوو بکات!

خوێندنــەوەی داواکــە و تەلەفۆنکردن و هاتن و فەرمان و دەســتبەکاربوونی ئاشــتی لەســەر ئیشــکردن لەناو ئەرشیفی عوســمانی زۆر بەپەلە دەبێت! هەردووالا مەرجیان نەبــووە، بێجگە لەوەی دەیانــەوێ، دۆکومێنتە کۆنەکان نوێ بکەنەوە. هەردووالا بەر لەوەی باســی موچە و پارە بکەن، قســە لەسەر ئەرشیف و هەولێر دەکەن.

***

بەڵگەنامــە و فەرمانــەکان زۆرن، هێشــتا گەنجم و بواری ژیانی ترم نییە. خشــتە و بەرنامــەی تــرم بۆ شــەو و ڕۆژ و جیرانەکان دانەناوە. تەنیا ســەردانی گۆڕی باوکم نەبێت. ئێواران دەچمەوە لای دایکم و بەشێکی ماڵەکەی بۆ پاک دەکەمەوە. ئەویش زوو گێســکەکەم لە دەستی وەردەگرێت و دەڵێت:

کیژم بدەمە من، ماندوو و مردوو هاتوویتەوە، دەتەوێ ماڵ و بەرهەیوانم بۆ گێســک بدەیــت! دانیشــە، چــاوت کەمێک گــەرم بکە، پــارووە نانێک بخــۆ، وەرە بەیەکەوە ســەیری ئەو زنجیرە تەلەڤزیۆنییە بکەین، تۆش تورکییەکە، قســەکانمان بۆ بکە بە کوردی! ژنەکانی کۆڵان هەموو حەســوودی بە من دەبەن دەڵێن، کیژت دوو ســاڵ بە تورکــی خوێندوە و زمانەکەی تەواوە، چیت دەوێ!

دایکە ئەدی تۆ باوکت و دایکت قەڵاتی نەبوون، بە زمانی تورکی قســەیان نەکردوە!

ئــەوان بــا، کیژم بــەڵام من لەوەتــی هاتوومەتە کــن باوکت، لەوەتی شــووم کردوە لــە ماڵەوە یەک وشــەی تورکییــم لە دەم دەرنەچووە. بزانە چــۆن ئێوەش هیچ فێر نەبوون.

ـ دایکــە، وایە باوکت نەیدەهیشــت ئێوە لەماڵەوە یەک وشــەی کــوردی بەکاربێنن، لەگەڵ دایکت بە کوردی و لەگەڵ ئێوەش بە تورکی قســەی کردوە.
ـ ئــا کیــژم باوکــم وا بوو! لەگــەڵ دایکم بە کوردی قســەی دەکــرد، چونکە زمانی تورکمانی نەدەزانی، لەگەڵ ئێمەش بە تورکمانی قســەی دەکرد.

***

نووسینەکان ورد و خەتەکەش ناخۆش، ساڵەکانی ناو مێژووەکە پیر و کۆنن! هەولێر چەندان ساڵ سەر بە شارەزوو و موسڵ و بەغداش بووە. والی و حاکم و فەرماندەی زۆری بۆ هاتووە، ســەدان کۆنە نامە، هەزارەها دێری ســڕاوەی سەر دەستنووسەکان و ناوی ســەیر بونەتە ئەرشــیف، هەموویان لەبەر دەستی ئاشتی رەحمانە.
هەموویــان، دۆکومێنتــەکان یەک لەدوای یەک لەبــەردەم لاپتۆپەکەی بەیەک کلیک، بــە پەنجەیەک نمایش دەکرێــن. پیتەکانی دەجووڵێن. ئیمزاکان شــاناز بە گەورەیی و زەخرەفــەی شــکۆوە دەردەکــەون. فەرمانێکی والــی و دادگا و فەتواخانە و بابی عالــی و هومایــۆن و نەزەراتــی ناوخــۆ و دەرەوە و فەرمانگــەی شــورای دەوڵــەت دەڕۆن، یەکێکی تر دێنە شــوێنی. ئەوەی دەڕوات فەرمانێکە، داوایەکە، نامەیەکە بۆ چاککردنــەوەی دیــوار و بنمیچی خانەقایەک. ئەوەی دێتە بەر شاشــەکە، فەرمان و هەواڵی یاخیبوونی هەمەوەندەکانە، دوورخستنەوەیان، گەڕانەوەیان و دامەزراندنیانە وەک پۆلیــس! دانانــی مەئمورێکە، قائیمقامێکــە، بەرزکردنەوەی پلەی یەکێکی ترە! بایەخدانــی بە نۆژەنکردنەوەی تەکیەیەک، مزگەوتێک.

***

پێــش ســەعاتێک، بەر لــەوەی کیژەکە نوێژەکــەی بکات و پــاروەوە نانێکی گەرم بە ماســت و پەنیرەوە بخوات. دۆکومێنتێکی تری خوێندبووەوە، دابەشــکردنی موچەی خانەنشــینی مردووێکــی موچەخۆر، تێدا دیــارە کە پارەکە دەکەنە دوو بەش بۆ دوو کوڕەکەی، هەندێکیش لە پارەکە دەکەنە مەســرەفی حوجرەکەی!
ئەوانــە لەودەمانــە موچەخــۆر بوون، مانگانە بــە قورش و پارە داهاتیــان هەبووە. گوندیــان هەبــووە. ئاویان هەبووە. ئەو پارە و موچەیە بــوون بە داهاتی بەردەوام. بوون بە موڵک و خانوو و بەرهەمی زۆر! حەســار و خانیان دروســتکردوە، گەرماو و بازاڕیان داناوە. چوونەتە حەج و ســەردانی بەغدا و حەلەبیان کردوە. هەر ئەوانەش بوون، ســواری ترێنەکەی خۆرهەڵات دەبوون، لە ئەســتنبۆلەوە چوونەتە شــارەکانی

دووری ئەوروپا!
هەموو ناوەکان ئاسـاییە، بڕیارەکان زۆرن، هەموو کەوتوونەتە سـەر ئەسـتۆی ئەو کیـژە. ئەویـش نەرم و ئارام، یەک بە دوای یەک، شـەوگاریان لەگـەڵ بەڕێدەکات، ڕۆژگار دەژمێرێـت. کیژەکـە بەدیـار یـەک نـاو و دۆکومێنت دادەمینێـت، بیری لێ دەکاتـەوە. بەتەنیایـە، کەسـیش نییـە دەسـتی بگریت. لـەو شـارە گەورەیە، لەو زانکۆیەی هەزارەها فێرخوازی بەڕێکردوە، هەزارەها زانا و ئەزموون و کتێبی تێدایە، کەسـیان ناتوانن بزانن و تێبگەن. دەقـەکان ماندووی دەکەن، ئازاری دەدەن، بەڵام ناتوانێـت دەسـتکاری هیچیـان بکات. ئـەو مێژوویێک دەنووسـێتەوە وەک لە نامە و ڕاسـپاردە عوسمانییەکاندا هاتووە، بەڵام لە دڵەوە خەم دەخوات بۆ ئەوەی؛
سـزای سـەوڵی بەلەمی بەسەر دانراوە. کوڕێک تاوانێک لەناو قەڵاتی هەولێر دەکات، سـزای ئەوەی دەدەن ماوەی پێنج سـاڵ، سـەوڵ لێ بدات. پێنج سـاڵ لەناو دەریا بمینێتەوە. دەریاکەش، دەریای ڕەش یان مەڕمەڕە و ئیجە و سپی و سووریش بێت، گرنـگ نییە، هەموو ئاوەکان، دەریاکان موڵکی عوسـمانییەکان بوون. ماسـییەکان، مەرجانـەکان، نەورەسـەکان و مەچەک و دەسـتەکانی سـەوڵیان لێـداوە! موڵک و عەبدی عوسمانییەکان بووە.
بە کاروانێکی درێژی چەندان مانگ، بەگەڵ کاروانێک دەکەوێت، لە موسڵەوە دەگاتە بۆتـان. لـەوێ ژەندرمەکان دەگۆڕێن، ئەسـپەکان شـەکەت دەبن، ناڵیـان دەڕوات، زینیـان دەڕزێـت. لەوێ بەرەو دیاربەکر، نایەوێ بگاتە ئەسـتنبۆل. نایانەوێ شـارە مەزنەکە، مزگەوتە گەورەکان، بازاڕە کۆنەکە، شوێنەواری ڕۆمانەکان ببینێت، دوایی خەمی دوورکەوتنەوە و سـۆزەکەی زۆرتر بیسوتێنێت!
نایانـەوێ درەنـگ بگاتە دەریـا و ناو بەلەم. دەیانەوێ زوو بچێتـە ناو دەریا. ئەدی ئەوان دەوڵەت نەبوون. سـوپا و نووسین و ئەرشیفیان نەبووە. حوبریان بۆ نووسین و ئیمزاکـردن و مۆرکردن هەبووە، بیناسـازیان هەبـووە، دکتۆریان هەبووە، زیرەک بـوون! دەزانـن زیندانییـەک چـۆن زوو ببەنە سـەر کار. چۆن زوو دوو سـەوڵی لە دەسـتی بنێن. دوو سـەوڵ، گەورەتر و ئەستوورتر و گرانتر لەو گۆچانەی تاوانەکەی پێ کردوە!
«کیژەکەی لە هەولێرەوە سـەرقاڵی مێژوو و ئەرشـیفی منە. من ئەو کەسـەم نەرم گۆچانەکەم لەسـەری خوشکەکەم داوە. دەستی من نەبوو، دەستی شەیتانی لەگەڵدا

بوو، زەبری من نەبوو، زەبری کەساسـییەکەمان بوو».
« کوشـتت و لەسەر تۆ ساخ بۆتەوە!».
«هەموو شاهیدیان دژم داوە! دایکم دوو جار جەرگی دەسووتێت، نەیدەزانی ئەوەندە دوورم دەبـەن، ئەوەندە دوور دەڕۆم و کەس نامدۆزێتەوە!».
«مـن وامدەزانی لەناو دەرگاکە، لەنزیک دزدارەکە، نزیک بەدەنەکەی قەڵات زیندانی دەکرێم. بەردەوام و زوو زوو ناز و بەزەیی دایکم بە بوخچەیەکەوە سەردانم دەکات. وامدەزانی سـزاکەم لەو زیندانە، بە پەشیمانییەکی زۆرەوە بەرێدەکەم. نەمزانی وەک ماسـی دەکەومە ناو ئاو. خۆ من تەنیا چەند جارێکیش، وردە ماسـییم لە جۆگە و گۆمەکانی خۆمان دیوە».
بـە گۆچانێـک زووتـر لەبن دەرگاکـە فڕێ درابـوو. گۆچانێک ماوەیـەک بوو، کەس دەسـتی لێ نەدابوو. مارێکی ڕەشـی سـڕ لە بەدبەختی گەرمایی، هەستی تووڕەیی قیتی دەکاتەوە و دەکەوێتە دەسـت کوڕەکە. لەسـەر پارە و موڵک خوشکێکی خۆی کوشتوە، بۆیە سزاکەی ئەوەیە، دەبێ ماوەی پێنج ساڵ لەناو دەریا سەوڵ لێ بدات! مەحمود، کوڕە ڕەشـتاڵە باریکەکەی هەرگیز زەیتونی نەخواردوە، زۆر کەم خورمای خـواردوە، لاواز و مەلەوانـی نازانێت، بە کاروانێکی درێـژ و ماندووبوونێکی زۆرەوە، باریان پێی هەڵگرتووە، نانیان پێی نەداوە، بۆ خەوتن بواریان نەداوە، وڵاخیان پێی بەستاوەتەوە، بەڵام سواریان نەکردوە، تەنگاو بووە بۆی نەوەستاون! تا دەگاتە ناو بەلـەم و نـاو دەریـاکان، ئیتر ملکەچ دەڕوات، یان لەنـاو ئاوەکە ئاو دەیبات، بەرەو کوێ؟ لە ئەرشـیفەکە هیچی لەسەر نەدۆزراوەتەوە!

❊❊❊

«ئەو داماوە نەورەس نییە. ماسـیگرێکی باریکە و ڕەشـتاڵەش نییە. ئەو مەحمودە لەسـەر کێشـەیەکی کۆمەڵایەتـی، لە ئەنجامی چاوچنۆکـی هەموویان. خۆی و برا و خوشـکەکانی، سەری گۆچانەکەی توند لە سەری خوشکی دەدات. ئەو تووڕە بووە، هـەردوو چاوەکانـی کوێر بووە. ئەوەی لەبیر نەبووە ئەو خوشـکی گەورە بووە. ئەو بەخێوی کردوە، ئەوی لە ئامێز کردوە، شـەوانی سـارد داپۆشیوە. ئەوەندە سپڵە و حەرامزادە بووە، ئەوانەی لەبیر نەمابوو، کە گۆچانەکە رادەوەشێنێت و خوشکەکەی دەکوژێـت. خوشـکی لەو گەورەتر بوو، تـا ئەو نانی خواردوە، تا ئەو ماسـتی داوا کردوە، تا ئەو چاوەڕوانی جەژنی کردوە، تا ئەو شـەوی پێ خۆش و سـازگار بووە،

ئەو خوشــکەی هیچی نەدەویســت، داوای هیچی نەدەکرد. ئینجا بە لێدانی گۆچانێک لەسەر مولّک و چاوچنۆکی دەیکوژێت!».

من ئەو پیاوە بم، بەکەڵک ئەوە دێم ســەوڵ لێ بدەم. بەلەم لە دەریا بپەڕێنمەوە. شــەپۆڵ ببەزێنم، خوێ وشــک بکەمەوە؟ «دوایی ئەوانە دەگێڕێتەوە کە لە قەڵاتی هەولێر بووە و رۆژەکەی خوشــکەکەی کوشــتوە دەریای نەدیبوو، بەلەمی نەدیبوو، نەیدەزانــی شــەپۆلی دەریــاش دوو رووی هەیە، مرۆڤە، ئاژەڵــە، رۆژەڤە دوو رووی هەیە، دوو ئاراســتەی هەیە، ترسناک و دڵۆڤان.

من ئەگەر برسیەتی هیلاکم نەکات، زوو لە یەکەم دوورگەدا، لەناو شینایییەکی زەیتون بەدیار رەوە بزنێکی یۆنانییەکان جوان و باش دەبینم چۆن برسی، گیانی برسی، چ مرۆڤ بێت یان ئاژەڵ، لەناو بەردی رەق خواردن پەیدا دەکاتـ خۆم دەشارمەوە! ون دەبم، ئەوان دەڵین مرد، ون بوو، خۆی شــاردەوە، برســیەتی کوشتی، زیندەوەرێک با بەقەد پشــیلەیەکیش بێت خواردی! بەڵام من نەمردم، نەخنکام، رەق نەبوومەوە، ســڕ نەبــووم، من مــاوم، دەژیم! خۆم بۆر و تۆزاویم، لەنــاو بەژن و قەد و چڕی دار زەیتونەکان، دەوەنە دڕکاوییەکان، بەر تەمی شــەپۆڵەکان بەئاســانی ون دەبم. خۆم دەشــارمەوە، دەمــرم! زیندوو دەبمــەوە، لەناو بەلەمەکە دەربازم بێت. ســەوڵەکەی چەند شــەو و رۆژە لەناو دەســتمە، ئیتر زوو زیندوو دەبمەوە. ئەوە ســەوڵ نەبوو، خاچەکەی مەســیح بوو! دڕکاوی بوو، رەقتر بوو لە ئازارەکانی بەر هەتاوەکە!

لەو دارســتانە، لەو دەوەنە ون دەبم. خۆم دەشــارمەوە، دەبمە ســێبەر و هەتاویش نامدۆزنــەوە! بمدۆزنــەوەش کــەس لە زمانم نــاگات. کەس نازانێت و خۆشــم نازانم چــۆن هاتــووم، لەکوێیەوە هاتووم، زوو قەڵاتەکەم لــێ ون بوو. من تەنیا قەڵاتەکەم دەناســی، ئەوێم دیبوو! ســەولێکیان دەبەم و دەیکەمە گۆپاڵ. چی بکەم نەدەبوایە بیکەمە گۆچان بەڵام هیلاکم. شەوەکانم بە سامە، رۆژم درێژە، گەرما دەمسوتێنێت، ئەو ســەوڵەی بووە بە گۆچانم دەیکەمە ســێبەر. چ زۆرە لقی دار زۆرە، ناوێرم چیتر ناوێرم هیچ بشــکێنم، ترســاوم، هەر سەوڵەکە چارەنووســی منە! چەندی تریش لەو دارستانە بژیم، ناوێرم لقێک بشکێنم، بە شکاندنی سەرێک رۆحێکم کوشت، ئەزیزێکم لەناوبرد!

***

مەحمــود، پاش ســزاکە، پاش ســەوڵ و بارە گرانەکە ون دەبێــت، دادەبڕێت، بەڵام

پاش ئەوەندە ساڵە وا کیژێکی هەولێری لەناو دۆکومێنتەکانی ئەرشیفی عوسمانی بە زمانی کۆن و پیت و نووسینی کۆن دەیدۆزێتەوە. بەڵام ئەویش نازانێت، کوڕەکە بەرەو کام وڵات و دەریا و ڕۆیشتوە! لەو کاروانە ترسناکە دوورەدا ناوێ دەبێت بە چی، ڕەنگی دەگۆڕێت، مەچەک و بازووەکانی دەبن بە مس، یان دەبن بە ئاسن! کیژەکە دەرەقەتی مێژووە دوورو درێژەکەی عوسمانییەکان نایەت. ئەو بەتەنیایە، لەو شارەی تورکیا خەریکی ماستەرە، دەیەوێ ورد ورد فێری خوێندنەوە و نووسینەوەی پیتەکان بێت. نایەوێ دوور بکەویتەوە. نایەوێ زۆر لە دایکی و زانکۆی سەلاحەدین دووربکەوێتەوە. دەیەوێ سەربردەی مەحمود بگێڕێتەوە، بیکاتە پاڵەوانێکی پەشیمان. تۆمەتبارێکی ساویلکە، بکوژێکی بەزیو! یەکێک بدۆزێتەوە بەدوای ڕەچەڵەکی مەحمود دابچێتەوە. بزانیت کەی دەگاتە سەر یەکەم بەلەم و کەشتی. کەشتییەکە، گەورە بوو یان بەلەمێکی بچووکی نێوان دوورگە بچووکەکانی دەریای ئیجە بووە!

یەک مەحمود سزا دەدرێت و دەگاتە ناو بەلەم و دەریاوانی عوسمانی، دەڕوات و ناگەڕێتەوە، بەڵام دوای سەد ساڵ و زۆرتریش لەناو دەقێکی کۆن دەدۆزرێتەوە. بەدوای مەحمودەکانی، پاش مەحمودەکەی سەوڵ و مەحمودەکەی قەڵاتی هەولێر، هەزارەها مەحمود، بەرەو دەریای ئیجە دەڕۆن. دەچنە ناو ئەو بەلەمانەی کە بە ماتۆری شەکەت و کۆن و جەستە و بەدەنی شکاوی دار و بورغی ژەنگاوی دەریاکە دەبڕن! هەزارەها مەحمود ئاودیو دەبن، زۆریان دەگەنە ئەوروپا، زۆریش لەناو دەریا و دارستان و هوتێلەکانی ناو تورکیا و یۆنان و بولگارستان شەکەت و سەرگەردان دەبن! ئای لەو بەلەمە شڕانەی لە کۆنەوە، دڵ و چاو و هیواکانمان دەخنکێنن، دەبەزێنن. بەلەم بۆ دەربازبوون بووە، نەک بۆ خنکان و مردن.

***

لە ڕۆژی ١٦ی جەمادەی کۆتایی ساڵی ١٢٦٣ی کۆچی نامەیەک بۆ والی بەغدا نووسراوە، باس لە یەکبوونی کوردان دەکات، بەپەلە کیژەکە نامەکە بە تورکی عوسمانی دەخوێنێتەوە، زووش بۆ کڕینی نیشانەیەکی لەسەر دادەنێت.

«کوردەکان هەر لە کۆنەوە لەنێوان خۆیان یەکگرتوو و بە سروشت لەگەڵ یەک ئامادەن، هەروەها لە دەوروبەری بەغدا بەهۆی کوردبوونیان نەبادا لەگەڵ بەدرخانەکان نزیک ببنەوە و بۆنە لەنێوانیان دروست بێت و یەک بگرن، بۆیە پێویست دەکات

هێرشــی ســەربازی ڕەوانەی چواردەورەی هەولێر بکرێت و لەوێ دابمەزرێت، تاوەکو کــوردەکان نەتوانن یاخی بن و ڕێگریان لێ بکرێت».
کیژەکە جوان پەیامەکە دەخوێنێتەوە، لە مەبەستەکەی تێدەگات. پەریشانە لەنێوان ئەوەی کۆپی نامەکە بکرێت و نەترسێت، یان ئەوانە ئەو نامانە نافرۆشن، دووریش نییە قەدەغەیان لەسەر بێت. ئەو ڕادەچڵەکێت! دەبێ ئەوە باسی ئەو ڕۆژە نەبێت، باسی ئەو هەفتەیە نەبێت. ڕاپۆرتی ئەو دوو سێ مانگەی ناوچەکە و کوردستان نەبێت! من کە هاتم هەولێر ئاســایی بوو. ســەدان، بڵێ هەزاران کۆمپانیای تورکی لەناو شارەکە ئیــش دەکەن. هاتوچۆیان گەرمە، ڕۆژانــە فڕۆکەی تورکی لەناو فڕۆکەخانەی هەولێر دەنیشــێت. دووبارە بە سەرنشــینی زۆرەوە دەفڕێت و لەناو فڕۆکەخانەی ئەتاتورک دەنیشــێتەوە. هەولێــر زۆر ئاســاییە و پردەکەی ئیبراهیم خەلیــل، گومرگەکە، ڕێگا نێودەوڵەتییەکە بازاڕی ئەوەندە گەرمە، شەو و ڕۆژی نییە! ئاودیوبوونی سەر سنوور بۆ هەردوولا زۆر ئاســاییە! تورکیا هەڵســوکەوت و پەیوەندییەکانی بە هەرێم لەسەر ئاستی دەولییە، وەک دەوڵەتێک پەیوەندی و کۆنتاکت لەگەڵ هەرێمەکەمان دەکات!
کیژەکە حەیرانە و دووبارە داواکەی والی بەغدا دەخوێنێتەوە. دڵنیایە زۆرتر لە سەد ســاڵە نووســراوە. دروست سەد و حەڤدە ساڵە نووســراوە. بەڵام کیژەکە وادەزانێت نوێیــە و بابەتەکــە بەکەڵکی نووســینەکەی ئــەو نایەت. بابەتەکەی ئــەو هەولێر لە ســەردەمی عوسمانییەکانە، ئەگەرچی ئەو دەقە کۆنە، بەڵام باس لەوڕۆژانە دەکات، پێویستە بکرێتە کوردی، بڵاوبکرێتەوە!
دوودڵ مەبــە، تــۆ دۆکۆمێنــت دەکڕیــت و کۆپــی دەکەیــت. پارەی خــۆت دەدەیت «پــارەی زانکــۆی جیهــان و نەوزاد باجگــر». چیتدەوێ هەڵبژێرە، ئــەوان زۆریان، دەستخەتەکەیان وەک تۆ هەر پێ ناخوێندرێتەوە! دووریش نییە گاڵتەش بە کۆشش و ماندووبوونەکــەت بکــەن. ئەوەی باســی یەکبوونی کوردەکان دەکات ئاســاییە، وا دیارە کوردان وەک جاران نەماون، هەر چوار پارچە پێشــکەوتنی زۆریان لێوە بەدی دەکرێت!
کیژەکــە کلیکێــک دەکات و دۆکومێنتەکــە دەهاوێتــە ناو ســەبەتەی داواکراو. لەبەر ئــەوەی قەڵەمــی پێ نییــە، «بەپەلــە دەیــەوێ زوو بینووســێتەوە» هەموو جۆرە نووســین و قەڵەم و ســڕینەوەیەک ناکرێ ببیتە ژوورەوە، ئەوەندە توند گرتوویانە، قەڵــەم قەدەغەیە، لاســتیکی ســڕینەوە قەدەغەیە، ئەگەرچی تۆ ئیش لەســەر فیلم

و وێنــەی فیلمــەکان دەکەیت، ئینجا بواری قەڵەم و ســڕینەوەیان نەهێشــتووتەوە.
لەنــاو لاپتۆپەکــەی ژمــارەی دۆکومێنتەکــەش دەنووســێتەوە، بەرامبــەر ناوەکــەی دەستەواژەیەک بۆ ناسینەوەی تۆمار دەکات؛
دۆکومێنتێکی تایبەت بە یەکگرتووی کوردان لە ســاڵی ١٢٦٣ی کۆچی نووســراوە.

***

کیژەکە بەدیار شاشــەکە دانیشــتوە، ڕۆژی دووەمە، دیســان هاتووتەوە ئەرشیفەکە.
دیســان دەزانــن ئەو کیــژە کوێتی نییە. ئەو کیژە نییە، ئــەوەی لە یۆنانەوە هاتووە دەیــەوێ باری کشــتوکاڵ و چانــدن و بەرهەمەکانی ناوچــە یۆنانییەکانی «یۆنان و هەموو قەڵەمڕەوە کۆنەکانی» ژێر دەســەڵاتی عوسمانییەکان چۆن بووە، چییان لەو وڵاتــەی رووبەر و رووێکی زۆری لەســەر دوو دەریایە چانــدوە، بزانێت و بدۆزێتەوە.
ئــەو نەهاتــووە بزانێت یۆنانییــەکان بەرهەمیان چۆن بووە، لە دۆخە سیاســییەکانی ئــەو ســەردەمە دارســتانی زەیتون و دارســتانەکانیان چۆن پــەروەردە کراوە، چۆن دابەشــکراوە و بەرهەم و داهات و سێبەریان چەند بووە.
کیــژە هەولێرییەکە دەگاتەوە ســەر شاشــەکە، جانتا بچووکەکەی لەتەنیشــت خۆی داناوە. ســەیری یەکە یەکەی دۆکومێنتەکان دەکاتەوە، مەند و لەسەرخۆ، وادەزانێت ســالۆنەکە کەســی تێدا نییە، هەســت بە خشــپەی کەس ناکات، دەرگا دەکرێتەوە، پانکەکــە دەخولێتــەوە، چراکان داگیرســاون، پەردەیەک لەگــەڵ بایەکە دەلەنگێت، کامیراکانــی ســەرەوە چاویــان گەش دەبریســکێنەوە، ئــەو ئاگای لەو کەشــە نییە!
تەنیایــە، وەک خــۆی و جانتاکەی. بەتەنیایی گەڕاوەتەوە ناو بۆن و حوبر و قەڵەمی قامیش و نەخشــی نازداری ناو نووسینەکان.

***

ئەو بەیانییەکەی نانێکی باشــی لە ڕێســتورانتی سەر نهۆمی پێنجەمی هوتێلە باریکە تەســکەکەی خواردوە. زۆر خۆی نەخافڵاندوە. بەڵام زوو لە خەو هەڵســاوە و بەدیار دەریا و چەندان منارەی مزگەوتەوە، بەدیار ئەو هەموو باڵەخانە باریکە تەســکانەی سەر شەقامەکە. ئەوانەی قوڵاییان چوار پێنج مەتر زۆرتر نییە. لە دیار ئەو باڵەخانە رەنگینانە دانیشــتوە. ئەوانەی وەک مێرووله، میوانەکانی تێدا هاتوچۆ دەکەن، قاوە دەخۆنەوە. ژنەکان، باســکیان رووتە، روویان شــیرین، شــەوەکەی باش خەوتوون، تەلەفۆنەکانیان داخستووە و ئاگایان لە کار و شار و خێزان و بەرنامەکانیان نەماوە.

ئەوانــە هاتــوون پشــوو بدەن، مێشــک و چــاو و گوێیان بەرووی زێــد و کارەکانیان دادەخــەن. ئەویش دانیشــتوە، زۆر خۆی بە خواردنەکــە ناخافڵێنێت، زوو هێلکەکە سپی دەکات. دوو پارچە نانی سپی گەرم دەکاتەوە. جامێکی بچووکی ماست و دوو پارچە خەیار و تەماتە و چەند دانەیەک زەیتونی رەش و کەسـک لەناو بەرقاپەکەی نــاو دەســتی دادەنێت. کوپێک ئاو و شــیریش تێدەکات. کەوچــک و چەنگاڵ و دوو سێ پارچە کلینکسی زەرد هەڵدەگریت و سەیرێکی سەماوەرەکەش دەکات، دەیەوێ زۆرترین خواردن هەڵبژێرێت و بخوات. ئەو بۆ مانەوەی شەوێک و نانی بەیانی پارەی خۆی داوە.

***

**٥ رەبیعی یەکەم ١٢٧٣**

**بۆ نەزارەتی خەزینەی تایبەتی**

لە بەگزادەی فەرەنســی بەتایبەتی لەلای کوردســتان و هەولێر کانزای دۆزیوەتەوە، لەســەر قســەی خۆی دیاری کردوە، بە پارەیەکی کەم ئــەو کانزایە دەردەهێندرێت، ئــەو نووســراوەی نێــردراوە لە وەڵامەکەی والی شــارەزوور لەگەڵ داواکاری ســەروو بەیەکەوە نێردراوە.

ئاشتی ئەو رۆژەی ئەو بەڵگەیە دەدۆزێتەوە و کۆپی دەکات و دەیخاتە ناو سەبەتەی کرپینــی بەڵگەنامــەکان. ئەو زووتر لە ئەرشــیفخانەکە دەردەچێت، دەســکەوتی باش بــووە، بۆیــە دەڕوات، پەلەی نییە، بەرنامەیەکی نییــە زوو بگەڕێتەوە. بۆیەش بڕیار نادات بە تاکسییەک بچێتەوە ناوچەی سوڵتان ئەحمەد و هوتێلەکەی. دیسان سواری پاســەکە دەبێت. لە دوا خاڵی وەســتانی پاسەکان، سواری قەتارە دوو فارگۆنەکەی ســەر شــەقامەکە دەبێت. لــە بایەزید دادەبەزێــت. کۆڵانێک دەگرێتەبــەر، تا بگاتە بــەردەوام دوکانی سەوزەفرۆشــەکە. ئەوەی پەنیری جوانی هەبــوو، میوەکانی نوێ بــوو، نانەکەشــی گەرم بــوو. دەڕوات و دەگاتە هوتێلەکە، بەر دەرگا تەســکە رەنگ شــینەکەی دوو پایە لەســەر شۆستە زۆر تەسکەکە بەرزتر بوو، لەوێ ئەو کوڕەی کە لە پێشــوازییەکە دەوامی هەبوو، یەکەم رۆژ بوو دەوامی نیوەڕۆی کردبوو، یەکتریان نەدیبــوو، بــەڵام ئاشــتی داوای کلیلی ژوورەکەی لێ دەکات و بە سوپاســەوە بەرەو ئەسانسۆرە باریکە چوار نەفەرییەکە دەڕوات.

دڵی خۆشــە و لەبەر خۆیەوە دەڵێت:

ئیمڕۆ تەواو بووم، ئیشـــەکەش زۆرە بە زۆری وەک منیش تەواو نابێت. ئەســـتنبۆل، بەشی هەموومانی تێدایە! شارێکە بە دەسکەوت و داهات و ئارەقە و خوێنی خەڵکی هەموو رۆژهەڵات و وڵات و نەتەوەکانی بەلقان، بە موسڵمان و مەسیحییەکانی جیهان و جووش ساز بووە، خزمەتکراوە، جوان بووە! هەموو جیهان دەتوانن بەشی خۆیان لەو شارە، لەو ئەرشیفە بدۆزنەوە.

***

باوکـــم، لەگـــەڵ پیاوێـــک لـــە دوکانەکەی شـــەریک و هـــاوڕێ و هاوبازاڕێکـــی دێرینی هەبـــوو. ئەو بەڕەچەڵەک هەمەوەند بوو. ســـمێڵە رەشـــەکەی، رەنگـــە گەنمییەکەی، چوارشـــانییەکەی، نمونـــەی کەســـێکی هەمەوەنـــدی جەربـــەزە بوو. خۆی بـــە نازناو هەمەوەنـــد بوو. باوکیشـــی هەر لەو شـــارە لـــە هەولێر لەدایکبووە، بـــەڵام ئەو زۆرتر قســـەکانی باب و باپیرانی، خزمەکانی لەبیر مابوو، دەیگوت:

باپیرانمان لە ناوچە گەرمەکەی خۆیان، دژایەتی سوپا و دەسەڵاتی عوسمانییەکانیان کردوە. شـــەڕی ژەندرمە و مەئمورەکانیان کردوە. رێگایان گرتووە، تاڵانیان کردون، والـــی و دەســـەڵاتداریان هەراســـانکردوە و رایانکـــردوە، دوورکەوتوونەتەوە، گیراون. دەرئەنجام دوورخراونەتەوە. لەوێش لە تاراوگە و هەوارەکانیان نەماونەتەوە، دووبارە گەڕاونەتەوە. بەشـــێکیان هاتوونەتە ئەو دەڤەرە، هەولێر و گوندەکانی.

ئەوان، هەمەوەندەکانی سەردەمی عوسمانییەکان، بە گۆڕینی چەندان والی و قائیمقام و ســـەرکردەی ژەندرمەش، دژایەتی هەمەوەند و عوسمانییەکان، لەسەر خاک و پارە و دەســـەڵات و موچە و زمان و حەقیش بەردەوام بووە. عوســـمانییەکانیش سوپایان هەبـــووە، ســـەربازگا و گـــرد و مۆڵگە و خەڵکیـــان هەبووە، رووبەڕوویـــان دەبنەوە. ماوەیەک دەستەوەســـتان بوون، شـــکاون، زەبریان پێ کەوتووە، دوایی گەڕاونەتەوە. ســـوپای زۆرتریـــان هێناوە، گەمارۆیـــان داون، دەیانگـــرن، دووریاندەخەوە، دەکەونە ئاوارەیـــی، زۆر دووریـــان دەبـــەن، یان پەلاماریان دەدەن و رادەکـــەن، دەرباز دەبن. خۆیـــان و ســـەریان، خۆیـــان هۆبـــە و مـــەڕ و ماڵاتیـــان دەگەنـــە ناو ئێـــران. ئەوان، هەمەوەنـــدەکان، بـــۆ دوورتریش دوور دەخرێنەوە، دەیانبەنە نـــاو وڵاتانی گەرم، ناو ســـەحەرای ئەفریقیاش. ئـــەوان، هەمەوەندەکان لە ســـەردەمی جیاوازی دەســـەڵاتی ســـوڵتانەکانی عوسمانی و والیەکانی ناوچەکە دوورخراونەتەوە.

ئەوان یەکەم گرووپی کوردن بوون بە دیاسپۆرا. ئەوانەی دروست، ئەو دەستەواژەیان

لەسەر دەبێتە ماڵ.

دیاسـپۆرا، ئاوارەیـی و مانـەوە و سـوتانە بـۆ زێدی جـاران. هەوارێکـە دڵت تێدا ناحەوێتەوە، ناتەوێت لەوێ نیشـتەجێ بیت، ناکرێ ئاوێتە بیت. لەوێ دڵت سـوارە، ڕوو و ئاراستەی ڕۆژانەت، بەرەو هەوار و ماڵی جارانە. بەردەوام خەم لە کەلاوەیی و وێرانییەکانی کۆنە هەوار دەخۆیت. لە دیاسپۆرا چاوت لە گەڕانەوەیە، ئومێدت زۆرە! ئەوە دیاسـپۆرایە، ئەوەش لەسـەر هەمەوەندییەکانی دەربەدەر دەبن، دەچەسـپێت. ئـەوان بـەردەوام و بـە دزی گەڕاونەتـەوە، هاتوونەتەوە ناوچەکانـی نزیک خۆیان، زۆریان لە هەولێر گیرساونەتەوە.

***

# لە ترابزۆنەوە بۆ هەولێر

لەنـاو سـەد و پەنجـا ملیۆن دۆکومێنتی عوسـمانی کیـژە هەولێرییەکـە، هەزارەها دۆکومێنـت لەسـەر کوردسـتان، لەسـەر شـارەکان، کەسـایەتییەکان، رۆژەڤ و رووداوەکان، بەناوی مەلا و شێخ و گوند و مزگەوتەکان دەدۆزێتەوە. ئەوانە، زۆریان بەو دەسـەڵاتەی خاوەنی زانکۆکە پێی دابوو، لەسـەر ئەرکی زانکۆی جیهان بە پارە دەکرێت. پارەکەیان بە بانک بۆ دەنێرێت، ئەرشـیفەکە دێنێتەوە هەولێر.
بەپێی دەقی زۆری نووسـین و فەرمانەکان، هەواڵی زۆری تێدایە، ناوی زۆر هاتووە. دوو سـێ مانگ لە هاتنی مانگی رەمەزانی سـاڵی ١٢٧٦ی کۆچی لەودەمانەی شـێخ و مـەلا و نوێژکەرانـی خانەقاکـە، فەقێیـەکان، زاناکانـی خانەقـای شـێخ خالیدی نەقشـبەندی قسـە لەسـەر ئەوە دەکەن، داواش دەکەن. خانەقاکە نۆژەنکردنەوەی دەوێت. سـەحنەکەی گەورەتـر بکرێت. کاریتەکانی بنمیچەکـەی بگۆڕن. بۆ ئەوەش بنێرن لە هەورامان دار گوێزیان بۆ بێنن، لە خۆشـناوەتی داری باش و ئەسـتووریان بـۆ بدۆزنـەوە و بکڕن و ببڕنەوە. حـەز دەکەن و پێیان باشـە، پەنجەرەکانی چەند شووشـەیەکی شـین و سـووری تێبگرن! کولانکە و کلاورۆژنەی بۆ رووناکی زۆرتری دەوێت! حەوزەکەی پاک بکرێتەوە، سـێبەر و سـاباتەکەی بڵندتر و پتەوتر بکرێت، دەرگا گەورەکەی بە دەرگایەکی تری نوێ بگۆڕن. حەز دەکەن لە پیرۆزی خانەقاکە، وا باشـە دەرگا نوێیەکـە لـە دەرەوە هەولێریـش بهێنـن، بیگۆڕن، ئـەوەش پارەی دەوێ! پارەکە لەکوێ بێت، دەبێ پارەکە پەیدا بکرێت. قسـەکانی ئەوان، مەجلیسە گەورەکەی بەدیار دەستنووسـەکان، قورئانەکانی لە ئەسـتنبۆل چاپکراون، هەر ئەو

رۆژە، ئـەو داوایە لەو رۆژە بـۆ نۆژەنکردنەوەی خانەقای نەقشـبەندییەکانی هەولێر پارە تەرخانکراوە؛

### ١٢ی رەجەب ١٢٧٦

شـێخ خالید کە لەسـەر تەریقەتی نەقشـبەندییە لە قەسـەبەی هەولێر خانەقاکەی پێویسـتی بە تەواوکردنی خانەقاکەیەتی، بۆ تەواوکردنی خانەقاکەشـی داوای پارەی کردوە، بۆ ئەم مەبەسـتە ١٢٥٠٠ قوورش لە داهاتی ئەوقافی بەغدا دابینکراوە.

ئەو نامە و داوایە، ئەوە دەسـەلمێنێت پێش سـەد و حەفتا سـاڵ و زووتریش، ئەو خانەقایـە لە خوارەوەی قەڵات هەبـووە. خانەقایەکی ئاوەدان بووە، کۆن بووە. لەو خانەقایە، پیاوە ماقوڵان، زانایانی ئایینی کۆدەبنەوە، تاعەت و خوداپەرستی دەکەن. ئـەو چەنـد کتێبە ئایینییەی لەوێ بوونی هەبووە، بەردەوام لەسـەر کۆشـی مەلا و فەقێیـەکان بـووە، دەیخوێنەوە، خەڵکی تری فێر دەکەن! بـە پیرۆزی هەڵیدەگرن، بەرگی دەکەن، لە پەڕۆی کەسـکی لوولدەدەن و بەرز رایدەگرن.

لـەوێ، هەمیشـە نوێژی بـە جەماعەت کـراوە. قورئان بە دەنگی خۆش و سـازگار خوێندراوە. داوا لە کورە دەنگخۆشەکە دەکەن، سورەتێک لە قورئانیان بۆ بخوێنێت. هەموو بە دەنگەکەی سەرسامی دەردەبڕن. دەنگەکە بۆ قودرەت و گەورەیی قورئان و ئایەتـەکان دەزانـن. زۆریان هیچیش لە ماناکەی تێنەدەگەیشـتن، بەڵام دەیانزانی پیرۆزە و شایستەی کڕنوشە.

سـێ فەقێ و پیاوێکی بەتەمەنیش، خەریکی هەڵتەکاندن و داوەشـاندنی حەسـیر و دووگرد و مافوورەکانی ناوەوەی خانەقاکە بوون. گەنجێک کوپەی بن دارەکەی پڕ ئاو دەکات. یەک دەڕوات و دوو دێنە ژوورەوە. خانەقاکە لەناو بازاڕ و شوێنەکەش بۆندار و پیرۆزە، ناسراویشـە. ئەوەی سەردانیشـی نەکردبێت بۆی باس دەکەن و نیشـانی دەدەن. خانەقاکە نزیک بازاڕە، نزیک دەرگای قەڵاتە، بەردەوام ئاوەدانە! ئەوەی لەو رێگاوبانە هاموشۆی هەبووە. ئەوانەی سەرسامی شارەکە بوون، تینوو و حەپەساوی خانەقاکـە بـوون. ئەوانـە لەو خانەقا پیـرۆزەدا هەناویان فێنـک دەکەنەوە. ئەوەی لێکدانەوە و شـەرعێکی کۆمەڵایەتی ویسـتووە، لەبەر سێبەر و لەسەر حەسیری ئەو خانەقایە وەڵام و شـرۆڤەیەکی دروسـت و پێویستی وەرگرتوە. رێبوار و نەخۆشێکی ناو سوپاکە، سەر بە کام نەتەوە و رەگەز و خەڵکی کام وڵاتیش بووبێت، چیانشین

یان سەحراویی، گەیشتۆتە ئەو خانەقایە، لەوێ پشووی داوە، نانی خواردوە، نوێژی کردوە، چۆتە ناو شارەکە. لەوێ لە حەسارێک، لەسەر باخچە و چاوی کارێزێک، نان و ژیان و هاوڕێی دەســکەوتووە، لەو شــارە ماوەتەوە، بۆیەش هەولێر بووە بە شار!

***

لــە گۆشــەیەکی خانەقاکە، دوو پیاو، هەردووکیان زۆر ســەردانی خانەقاکە دەکەن، زۆریــش دەمینێنــەوە، یەکێکیان کەمێک لاڕانێکی لەســەر حەسیرەکەی ژێرەوەیان کەوتووتە ســەر خۆڵەکە، قسە دەکەن. ســەریان لەبن گوێی یەکتری ناوە، یان بڵێن ســەبر ســەبر قسە دەکەن. باسی داهاتی کارێز و ئاوی گوندەکانی ناوچەی شەمامک دەکەن. ئاوەکە، پاش مردنی ئەفەندی، ئەوەی لەلایەن پاشاوە و بە فەرمانی تایبەت خێراتەکانی ئاوەکەی بەو بەخشــیوە. ئەویش لەبەر ئەوەی شــارەزای ئاو و کارێز و باخچە و ئاش نەبووە، ئاوەکەی دابووە دەست چەند پیاوێکی نزیکی خۆی. ئەوانیش لەو پیشــەیە شارەزا بوون، لەناو کارێزەکە دەمانەوە، لە سەرێکی دەچوونە ژوورە و پاکیان دەکردەوە، لە ســەرێکی تر و لە ئاقارێکی تر؛ دەســت بە فانووس و کورینگ دەهاتنــە دەرەوە! چەند ســاڵ بوو، ئاو و زەوی و کارێزەکــە لەلایەن عەبدولرەحمان ئەفەندی سەرپەرشتی و خاوەنداری کراوە، لەوەتی مردووە منداڵەکانی کەمتر دەزانن سەرپەرشتی بکەن.

کیسە تووتنەکە لەیەکتری وەردەگرن، جگەرە دەپێچنەوە، بە بەردە سپییە بەشەوق و تیشــکدارەکە، پروشــکە ئاگرێک بۆ داگیرساندنی جگەرەکە پەیدا دەکەن. تووتن و ئاگر و کزە بایە فێنکەکە، ئەوەندە بوار دەدات دوو سێ قووم لە جگەرەکانیان بدەن و بگەڕێنەوە باســی ئاش و کارێز و کوڕەکانی ئەفەندی؛

ـ تــا ئەفەنــدی مابوو، ئاشــەکە بەهەڕمێن بوو، کارێزەکە بەشــی ســێ چوار گوندی دەکرد!

ـ وایە، نازانم چۆن کوڕەکانی کرێی ســاڵانە دەدەن. ئاشــەوانەکە دەڵێت لە کوڕەکان تەنیا یەکێکیان دوو ســێ جار هاتووە، ئەویش ئەفەندییە، ســەری لە ئاش و قایش و ئاو دەرناچێت!

ـ ئەگەر وا بڕوات، پاش ئەو پێنج ساڵە، لەبن دەستیان دەردەهێنن، هەر دەبێ بڵێن بەو نان و بەو دۆشاوە!

ـ حەیف، سەد حەیفیش، ئەو کارێزە بە بەرەکەتە! ئەدی ئاشەکەیان، بەختی ئەوان

ئاشــەوانەکە وەســتایەکی جووی لەگەڵە دەســتی خەزێنەیە، ســەگ راوەستێت ئەو راوەســتانی نییە، ماشاڵا پیاوێکی لێزانە.

- ئەوە دوو ســاڵی بەسەر تێپەڕی، بزانین دەگەنە کوێ!

- نازانی کێ بەتەمایە بەکرێ بیگرێتەوە!؟ «پیاوەکە پەرۆش دەپرسێت، وەک ئەوەی بیەوێ بە هەر جۆر و ناو و باســێک بێت بەرژەوەندییەک لەو دۆخەدا وەرگرێت».

- هەر دزەییەکان، ئاغاکان دەســتیان دەڕوات!

- دەســتیان بــاش دەڕوات، پیاویــان زۆرە، چەکیــان هەیە. دەشــتەکە هەموو بۆتە موڵکــی ئــەوان. قائیمقام و ژەندرمەش خۆیان بەرامبەریان کەڕ و لال کردوە.

- حەقیانە دەترســێن، یان دەمیان چەورکردون!

لەگــەڵ دەنگــی بانگەکــە، بابەتەکە دەبڕێنەوە، دەچنە ســەر ئاو و ســەر دووگرد و ســەر حەســیرەکان و قامەتی نوێژ دەگرن! بواریش دەدەن ئاوی کارێزەکەش بڕوات، تەقەتەقی ئاشەکەش نەرم نەرم ئاردێکی سپی دەربکات، ئاشەوانەکەش ئاردە جوانە گەرمەکەش لە جواڵی گەورە گەورەی نوێی خەت ســوور بکات.

❊❊❊

مەلایــەک، لەگــەڵ بازرگانێــک، ئەوەی دوو رۆژە لە موســڵ هاتووتەوە، زووتریش لە حەلــەب بــووە، ئەوان لەوێ لە حەوشــەکە چاوەڕوانی بانــگ و نوێژیان دەکرد. دوو ئەفەنــدی مەدرســەی روشــدیە، بەڵام بــە جلی مەلایانــە، کەوا و ســەڵتە، مەندیلی ســپییان لەســەرە، لاواز و تەمەنیان بەشــی ئەوەی دەکرد، ســەردانی ئەســتنبۆل و حەلەبیــان کردبێت. یەکێکیان مامۆســتای قوتابخانەی «ســوبیان» و خۆشنووســی خانەقاکــە بــوو، باســی قائیمقامەکە دەکــەن، ئەدهەم ئەفەندی! ئــەو چەند جارێک هاتووتە خانەقاکە، نوێژی تێدا کردوە، بە زمانە عەرەبییە شڕەکەی باسی ئەستنبۆل و ســوڵتان و دەریا و کەشــتییە جەنگییە گەورەکانی هومایۆنی کردوە! بەڵام زۆرتر باســی شــاری ترابزۆنــی کــردوە. گوتوویەتی شــارەکە زۆر کۆنە، یەکێکە لە شــارە گەورەکان، تەمەنی بوون و هاموشــۆ و بازرگانییەکانی زۆر پێش زایین دەگەڕێتەوە. بەڵام ئەدهەم ئەفەندی زۆرتر لەناو خانەقاکە باســی دەسکەوتی عوسمانییەکانی لەو شارە کردوە. شانازیش دەیگوت:

سوڵتان سولێمان قانوونی لە ساڵی ١٤٩٥ی زاینی لەو شارە لەدایکبووە! شانازییەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، من لەوێ هاتووم و گەیشــتوومەتە هەولێر!

ئەدهەم ئەفەندی باس لەو ڕۆژە دەکات، کە فەرمانی بۆ دەرچووە و بووە بە قائیمقامی هەولێر. ئەو کە فەرمانەکەی بۆ دەردەچێت، ناوی شارەکەی کەم بیستبوو. ئەو یەکەمجار بووە لەسەر داوا و فەرمانی هومایۆن لە شارەکە، لەسەر دەریاکە فەرمانی دامەزراندنی بۆ دەردەچێت، فەرمانەکەی پێیە؛

«لە ٦ی موحەرەمی ساڵی ١٢٧٥ی کۆچی، ئەدهەم ئەفەندی، فەرمانی بۆ دەرچووە بووە بە قائیمقامی هەولێر، هاتووە و دەوامی کردوە، بۆ سەلامەتی دەرچوون و گەیشتن، لە ڕێگا دوورەکەوە نامە و ڕاسپاردەی چاودێری پێ بووە».

***

**٦ موحەرەم ١٢٧٥**

**بۆ موتەسەریفی شارەزوور**

لە قەزای هەولێر بە فەرمانی پاشا، قەپوچی باشی لە ریکابی هومایۆن ئەدهەم ئەفەندی ئەمجارەیان وەکو بەڕێوەبەری قەزا بۆ سەر کارەکەی بەڕێکەوتووە، ناوبراو پێویستە ڕێزی لێ بگیرێت.

**بۆ والی ترابزۆن**

فەرمانی پاشا لە قەزای هەولێر وەکو بەڕێوەبەری قەزا قەپوچی باشی لە ریکابی هومایۆن ئەدهەم ئەفەندی دامەزراوە، ئەمجارە کەوتۆتە ڕێگا بۆ شوێنی کارەکەی پێویستە یارمەتی بدرێت و ئاسانکاری بۆ بکرێت.

**نامەی ڕێگا**

لە ترابزۆنەوە تا دەگاتە شارەزوور ئەو قائیمقامیەت و بەڕیوەبەرایەتی قەزایانەی دەکەونە سەر ڕێگای دوای سەلام، لە ریکابی هومایۆن ئەدهەم ئەفەندی دامەزراوە، ئەمجارەیان بۆ ئەو شوێنە کەوتوتە ڕێگا، تا دەگاتە شوێنی مەبەست یارمەتی بدەن و کارەکانی بۆ ئاسان بکەن.

دیارە هەموو گوتوویانە بە سەرچاوان و ڕێزیان گرتووە و سەلامەتی کاروانەکەیان دابینکردوە، بۆیە گەیشتۆتە ناو قەڵاتی هەولێر و بووە بە قائیمقامی قەزاکە.

***

ئەدهەم، فەرمانەکەی لەناو دەستە، مۆرێکی دیاری لەسەرە. بڕیارەکە دەبێ

جێبەجــێ بکرێت. لەو وڵاتە دوورەوە بــەرەو هەولێر بەڕێدەکەوێت! دیارە بەر لەوەی بەڕێبکەوێت، زۆر دەپرســێت، لەو هەموو پرســیار و سۆراخانە، بێگومان یەکێک یان زۆرترین خەڵکی دیوە، ڕێبوار، بازرگان، ســوارەکانی ســوپا، تۆپچییەکان. ئەوانەی نــاوی هەولێریان بیســتووە، یان ســەردانیان کــردوە، رووبەڕوو و ســەرفرازانە پێی دەڵێن:

ئەفەندی بڕۆ و دەوام بکە، لەوێ پەشیمان نابیتەوە، زۆر کەس، بە فەرمان و داوای همایۆن چوون، لەوێ کارمەند بوون و لە ناوچەکە گیرســاونەتەوە.

ئەویش دەڵێت:

کەس دەناســن، پێش من، لە هەموو مەئمورەکان، ئەو شارەی دیبێت!

یەکێک پێی دەڵێت:

ئێمــە ئەوانەی لەو مەجلیســە دانیشــتووین کەس ناناســین، بــەڵام ئەوەندە دەزانین خەڵکەکــە کــوردن. زمــان و جلوبەرگ و هەڵســوکەوت و پەیوەنــدی ژن و پیاویان جیاوازە! ماوە ماوە عەشیرەتێکیان یاخی دەبن، ناوچەیەکیان لە دەسەڵاتی ویلایەتی شــارەزوور یان موســڵ و دیاربەکر هەڵدەگەڕێنەوە. شــێخێک، مەلایەک، ئاغایەکیان ســەدان پیاوی لێ کۆدەبێتەوە، دەچنە ناو قەڵاتێک، یان شــاریکی بەرزی بە دیوار و خەرەنــد، یاخــی دەبــن، چەکــدار دەبن، بــارود و چەک و تۆپیــش پەیدا دەکەن، وڵاخیان زۆرە، ئەســپ ســواریان هەیە، گوندەکانیان، شارەکانیان ئاوەدانە و باخیان میوەی زۆرە، زســتانان ڕێگا و بواریان ســەختە! ناوچەکەیــان بە پیت و بەرەکەتە، ســەر ســنووری ئێرانە! ئەوەش بۆتە کێشە و ناڕەزاییەکانی میللەت و همایۆنی قوڵ و ئاڵۆز کردوە.

***

ئــەو لــەو کاروانە دڵی لەنــاو دەســتە و فەرمانەکەشــی لەناو هەگبەی ســەفەرەکە هەڵگرتــووە، لــە شــوێنی پێویســت نــەرم نــەرم فەرمانەکە لەنــاو لولــە فافۆنەکە دەردەهێنێــت و نیشــانی دەدات. دەڕوات و پشــووێک دەدات، وڵاخەکــەی باشــتر دەبەستێتەوە، ئالیکی بۆ دابین دەکات و دەگەڕێتەوە لای ڕێبوارەکان و بە مەراقەوە لێیان دەچێتە پێش؛

ئەوانەی ئەو شارەیان دیوە، ئەوانەی زووتر لەوێ مەئمور بوون. دەپرسێت و هەست لە راز و قسەکانیان رادەگرێت و دەڕوات، پشوو دەدات، پشتی وڵاخەکەی دەکاتەوە،

زوو دەچێتە مزگەوت و سـەر سەکۆکان!
ئەوانیش دەڵێن:
بـۆ ئەوەنـدە دەپرسـیت، دیارە لـەو وەزیفەیە دوودڵـی، ئەوانیش لـە ژێر حکومی سوڵتانن و زمانی تورکیش دەزانن!
ئەدهەمـە ئەفەندی چاوێکی لەسـەر وڵاخەکەیەتی، خەمی بار و کەرەسـتەکانیەتی، دووبارە لێیان نزیک دەبێتەوە؛
«نازانم دڵم دەترسـێ، بەڕاسـتی تا ئەودەمانەش کوردم نەدیـوە، وڵاتەکەی ئەوانم نەدیوە، نازانم!».
بەڵام کەسیان پێی ناڵێت، ئەوانەی نەگەڕانەوە، زۆر دەچن و ناگەڕێنەوە، لەبەر ڕێگا و شەڕ و نەخۆشی و کوشتن و راوڕووت نەبووە نەهاتوونەتەوە. ئەوانە نەگەڕاونەتەوە لەبەر ئەوە بووە لەوێ گیرساونەتەوە.
ئـەو بەڕێدەکەوێـت، چەندان شـاری گەورە و بچـووک دەبڕێت و دەگاتـە دیاربەکر. لەوێـش دەپرسـێت شـارەکە چەنـد دوورە، ڕێگاکـە چۆنە، خواردن و پاسـەوانی و ئاسـایش لەوێ چۆنە. چەنـد نزیک دەبێتەوە، زۆرتر خەڵـک دەدۆزێتەوە، زووتر بە سەفەر و بازرگانی و بۆ خوێندن هاتبوونە هەولێر! زۆر لە خانەکان، لە دیوەخانەکان، لـە خزمەتی والیـەکان دەمینێتەوە. دەیەوێ بزانێت زۆر ماوە، چەند ڕۆژ و کاروان و شـەوی دەوێت، تا دەگاتـە هەولێر. هەندێک دڵنیای دەکەنەوە، جاروباریش سـەری بۆ بادەدەن و هیچی دەسـتناکەوێت، بەڵام لە کتێبەکەی ئەولیا چەلەبی، لە هەندێ نووسـینەکانی تری عەرەبی، باشـتر دەزانێت شارەکە زۆر کۆن و ئاوەدانە. قەزایەکە سەر بە شارەزوور! یەکێک لە مزگەوتێکی دیاربەکر، دەروێشێکی بەتەمەن، ریشێکی سـپی درێژ، ناوقەدێکی چەماوە، کوردێکی بۆتان، پێی دەڵێت:
هەولێر کوردستانە، خەڵکەکە کوردن، زۆریان زمانی تورکی قسە دەکەن. بەشانازییەوە شـارەکە، هەولێر شـاری مەولـوودە. من بـە مەولوودەکەی لەبـەر پیرۆزیی بوونی فەخری کائینات موحمەد «درودی خودای لەسـەر بێت»، دەیناسـم. لەبەر گەورەیی مەولوودەکە ناوم بیسـتووە، دەزانم قەڵاتێکی گەورەی تێدایە، قەڵاتێکە گەورەتر لە قەڵاتی حەلەب، بەرزتر، ئاوەدانترە! قەڵاتێکە ساڵانە لە موسڵ و بەغدا و ئەستنبۆل تـۆپ و بارودی بۆ دەنێرن، تۆپخانەی تێدایە.
ئیتـر ئـەو چەند ڕۆژ دەڕوات، ناوچەیەکی شـاخاوی، بەفر و شـەختە و زسـتانێکی

سەخت دەبڕێت، بەڵام ناوچەیەکی ئاوەدان. لەو کاروانەدا چەندان گوند دەبڕێت، شەوانە میوانی ئاغاکان دەبێت، لە تەکیەکان دەمینێتەوە، لە مزگەوتەکان نوێژ دەکات! بەڵام هیچ لە زمانەکەیان تێناگات.
هەر لەو کاروانەدا، شەوانە لە ماڵی خاوێنی کریستیانەکانی مێردین و روها دەبێت.
لەو کاروانە، کەلاوەی گەورەی بەردینی کڵێسا کۆنەکان دەبینێت، دیوارەکانی زۆر بەرزن، بەردەکانی لووس و بە شەوقن! دەیەوێ بزانێت کڵێسایەک دەدۆزێتەوە وەک کڵێسا گەورە و نازدارەکانی ترابزۆن! بنمیچیان بەرز و ستوونەکانی مەڕمەڕ و دەروازە و پەنجەرەکانی رەنگاورەنگ بن! لەوێ مەریم تیشک و بەخشندەیی بدرەوشێتەوە. لەوێ مەسیح ئازاری کەمتر بێت، خاچەکەی سوک و ژانەکەی بێ ناڵە بێت!
ئەو باپیرە گەورەی یۆنانی بووە، سۆزی کریستیانی و یۆنانی هەر مابوو. گەرم و بەسۆز و راستگۆیانە بۆی دەسووتا. چۆن سوتانێک! بەس خۆی لە ناخەوە هەستی بە؛ کڵپە و گەرمایی و کەساسیەکەی دەکرد. بەڵام دەسەڵاتی چییە، چی بکات! خۆ هەر ئەو نییە، هەر شار و بنەماڵە و وڵاتی ئەو نییە، وا زەلیل و داماوە. بەشێکی زۆری ئەو دونیایە، بەو دەردە دەناڵێنن و دەسەڵات و هێز و شیر و چەک و قوربانیدانیان نییە!
شاخ و گوندە گەورەکان، رووبارە بە تەوژم و کانیە بێگەردەکان تەواو دەکات. دەگاتە دەشتێکی بەرین، زۆر بەرین هەر دەڕوات و رێگا و ئاوەدانی تەواو نابێت، پەرۆشە و دەیەوێ بزانێت دەسەڵات چۆنە! کەی یەکەم موچە وەردەگرێت، میللەتەکە چۆن بەڕێوە ببات، راستە ئاسان نییە عەشیرەتەکان داوەرێنێتەوە، دابنیشن و باجیش بدەن! ئەو یەکەمجارە فەرمانی بۆ دەرچووە، بووە بە قائیمقامی شارێک، قەزایەکی شارەزوور، نزیک ویلایەتی موسڵ و بەغدا و حەلەب!
شەوێک لە قەڵاتی ئامێدی سەردەکەوێت، لە دەروازەکە دەچێتە ناو شارەکە، شەوێک یان زۆرتر لەبەر باران، دوایی لەبەر بەفر و بەستەڵەک دەمینێتەوە. رۆژێک لە دەشتی نەینەوا، لەنزیک مار متی و قەرەقوش ئاسوودە دەمینێتەوە. بە کەلەکێکی عەشیرەتی گۆران، رۆژبەیانییەکان، ئەوانەی لە هەوارێکی دوورەوە دەگوازرێنەوە ئەو دەشتە بەرینەی نێوان گوندەکانی کریستیانەکان دەپەڕێتەوە. بە کەلەک لە ئاوەکەی دیجلە دەپەڕێتەوە. لەناو رەشماڵی عەرەبان خزمەت دەکرێت، قاوەی تاڵ

دەخواتەوە، بەرخی بۆ سەردەبڕن، بەڵام لەوێ هیچ ژنێک، دوو چاوی رەش، تەشی دەستی ژنێک، خانمێک لەبەر تەون و دار و ریس و خوری نابینێت. لەبەر خۆییەوە دەپرسێت، ئەو میللەتە ژنیان نییە، ئەوانە کیژیان نییە! بەدرێژایی کاروانەکە، لە گوند و باخەکان ژنی زۆری دیوە! بەڵام لەو دەڤەرە تەنیا پیاوەکان دەبینێت، کوڕەکان سڵاوی لێ وەردەگرنەوە و بارەکانی بۆ هەڵدەگرن و ئاسانکاری بۆ دەکەن!
دەپرسێت و بیریش دەکاتەوە؛
چۆن ئەو پیاوانە لەدایکبوون، چۆن منداڵیان بووە و منداڵیان چۆن شیری خواردوە، کێ دووگیان بووە!؟ کوا ژنەکانیان؟ بەڵام هەست بەوە دەکات ناکرێ بپرسێت! بۆن دەکات، سەرهەڵدەبڕێت و مەند رادەمینێت، کەم لەو هەوار و رەشماڵانە، هەست بە هەناسە و دەنگی ژنان دەکات.
دەگاتە ناو عەشیرەتە کوردەکان، باش دەزانێت و هەست بەوە دەکات زمانیان وەک کوردەکانی دیاربەکر و بۆتان نییە. هەموو تفەنگیان پێیە. ئەسپ و مەڕ و ماڵاتی زۆریان هەیە. زۆریان رەشماڵ و خانووشیان هەیە! گوندی گەورە گەورە، لەناو گوندەکان کریستیانیش دەژین! ئەوانیش خزمەتی دەکەن، رێنماییەکانی هومایۆن جێبەجێ دەکەن. بەپێی فەرمانەکە هەڵسوکەوت دەکەن، تا لەوان دوور دەکەوێتەوە هاوڕێیەتی دەکەن! تا دەگاتە ناو گەردییەکان، ناو دیانەکانی عەنکاوە، ئینجا دەگاتە ناو قەڵات، مزگەوتەکەی، خانەقای نەقشبەندییەکان، بە هاوکاری ئەوان، لەسەر داوای ئەوانیش، داوا دەکەن بۆ نۆژەنکردنەوەی خانەقا پارە لە ئەوقافی بەغداوە تەرخان بکرێت.

***

ئەدهەمە ئەفەندی قائیمقامەکەی هەولێر لەناو قەڵات، نزیک دەرگا گەورەکەی لە خانووێکی گەورە سەر بە دەوڵەت دادەمەزرێت. بەتەنیایە، ژنی نییە، منداڵی نییە، کەس لەو شارە و لەو دەڤەرە ناناسێت. زووتریش لە ترابزۆن کەسی نەبووە، منداڵێکی بەجێماوی بنەماڵەیەکی ئەرمەنی یان یۆنانی بووە. مێردمنداڵ بووە هاتووتە ئەو شارە. دەستخەتی خۆش بووە. ئەو بێجگە لە زمانی عوسمانی زمانی تری زانیوە. لەناو چەندان دیوەخان بووە بە مامۆستای منداڵانی بچووک، نووسەری ناو بازاڕ و خانەکان! حەزی کردوە لە شارەکانی ناو یۆنانییەکان، یان شارەکانی سرب و ئەلبانەکان کارێکی بۆ بدۆزنەوە. هەموو شاهیدی ئەوە دەدەن قەڵەم و زمان

و خوێندەوارییەکەی شایستەی زۆرترە و بگاتە کۆشکی سوڵتان و شازادەکانیش!
بەڵام قەدەر دەیهێنێتە ناو هەولێر، بەختی ئەو لەو سەردەمانە کێشە و ئاشوبەی زۆریش لە دەڤەرەکە روو دەدەن، ئاگری گەورەش لە پاوانی دەسەڵاتەکە بەردەبێت!
کۆنە قائیمقامەکە خەڵکی هەولێر بووە. ئاغایەکی دەستڕۆیشتووی ناوچەکە بووە. ئەو چەند مانگێک بە منداڵی لە مزگەوتێکی شارەکە، کەمێک خوێندن و نووسین فێر بووە. بۆ رازیکردنی تفەنگ و سوار و ناڕەزاییەکان، ماوەیەک، سەلیم ئاغا دەکەنە قائیمقام. ئەو بە هەر جۆرێک بێت، کۆنترۆڵی شارەکە، قەڵاتەکە، هەردوو ناحیەکەی گوندەکانی دەیان گردی بەرز کە پاسەوانیان هەیە، دەکات! بەڵام لەودەمانەی ئەو قائیمقام بووە، والی موسڵ و بەغداش هەست بەوە دەکەن، باج کەمتر دەنێرن.
هەولێر پەیوەندییەکانی لاوازە.
قەڵاتەکە وەک هەڵۆیەک بەرزتر دەردەکەوێت! هومایۆن موچە دەدات، خانەنشینی دەدات، مەلا و فێرکەری مزگەوتەکان پارە وەردەگرن! ژەندرمەکان پارە وەردەگرن، قوتابخانەی روشدیەش پارەی لێ سەرف دەکرێت. بەرامبەر ئەوەش، یەک قورش ناگاتە خەزینەی ویلایەت. بۆیە بەپەلە و تووڕە سەلیم ئاغا دەگۆڕن. ئەو ئەدهەمە ئەفەندییە دادەنێن. نامەی بۆ هەموو ناوچەکە دەدەنێ، تا هەیبەتی بۆ دروست بکەن. ئاغا و بەگ و مەلاکان قەدری بزانن. بەڵام ئەدهەمە ئەفەندی ئەوەی پێ ناکرێت، ئاژاوە و رێگری و نائارامی زۆرتر دەبێت، نەک باجەکانی پێ وەرناگیرێت، پارەی زۆریش داوا دەکات! تا بتوانێت دەڤەرەکە کۆنترۆڵ بکات، بۆیە ئەفەندییەکە دەگۆڕن!

❊❊❊

**٢١ی موحەرەم ١٢٧٥**

- لە قەزای هەولێر سەر بە ئەیالەتی شارەزوور پڕە لە هۆز و عەشیرەت، ئەدهەم ئەفەندی لە بەڕێوەبەرایەتی لابدرێت و لە شوێن ئەو بەرێوەبەرەی پێشوو سەلیم ئاغا دابنرێت.
- لە قەزای هەولێر سەر بە ئەیالەتی شارەزوور خەڵکەکە لە هۆز و عەشیرەت پێکهاتووە، پێویستیان بە چاودێرییە، ئەو بەڕێوەبەرە لەوێ دەستبەکار بووە ئیبراهیم ئەدهەم ئەفەندی لەبارەی پلانی عێراق هیچ زانیارییەکی نییە، لە قەزای

ناوبــراو کوشــتن و شــەڕ و دزیکردن زۆر بووە، لــە زیندان راکردن هەیــە و ناتوانێ کۆنترۆڵــی بــکات، هەروەها ناتوانێ کارەکانی بەڕێوە ببات، بۆیە پێویســتە لەســەر کارەکەی لاببرێت و پێویســتە یەکێک لە شوێنی ئەو دابمەزرێت، کە زانیاری هەبێت، لەوانــەش ســەلیم ئاغا یەکێــک بووە لە کارگێری کارەکانی بە باشــی راپەڕاندوە، لە قەزای ناوبراو بۆ ماوەی ســی ســاڵ کاریکردوە، بۆیە ئیبراهیم لاببرێت و لە شــوێنی ئەو سەلیم ئاغا دابنرێت.

**٢١ ی موحەرەم ١٢٧٥.**

***

ســەلیم پاشــا دەکرێتــەوە قائیمقــام و دەچێتەوە ســەر قــەڵات! دووبــارە ئەرک و فەرمانــەکان وەردەگرێتــەوە، لەگــەڵ دزدارەکەی قەڵات کۆدەبێتەوە، مامۆســتاکانی روشدیە دەبینێت، نامە و سڵاو و راسپاردە بۆ بەگ و ئاغا و پاشاکانی دوور و نزیک دەنێرێت، پێیان دەڵێت:

لەنزیکتریــن دەرفەت ســەردانتان دەکــەم، نامەی پشــتیوانی و موچەتان لە بەغدا و هومایۆنیش بۆ داوا دەکەم.

ئــەو دڵیــان دەداتەوە، داواش دەکات ژمارەیەک کەســایەتی هەولێر کۆببنەوە، بچنە موسڵ و سەردانی بەغداش بکەن، بەیەکەوە داوا بکەین شارەوانی بۆ شارەکە دیاری بکەن. ئاغایەکی ناوداری شــارەکە بکەنە ســەرۆک و ژمارەیەک کەســایەتی قەڵات و بــازاڕ و گوندەکانیش بکەنــە ئەندامی ئەنجومەنەکە! بەڵام بەداخەوە داوا و هیواکەی ئەویش ســەرناگرێت و دانانی ئەنجومەنەکە دوا دەکەوێت.

***

بــەڵام، ئەدهەمــە فەندییــش زۆر دەپاڕێتەوە، لە هەولێــر دووری نەخەنەوە، تازە لە شــارەکە راهاتووە، لەگەڵ خەڵکەکە بووە بە خزم و دۆســت، بەزمەکانی مەولوودی پــێ جوانە، شــارەکە مزگەوتی زۆرە، بازاڕەکەی گەرمە، بــەڵام کە دەزانێت وەڵامی نادەنــەوە، زۆریــش چــاوەڕوان نــاکات، زوو داوا دەکات بینێرنە رەوانــدوز، یان هەر شــوێنێکی تر، بەڵام ئەوان بەو فەرمانە دەینێرنەوە ترابزۆن، دیارە پێی دەڵێن:

تۆ نەورەســێکی باڵ ســپی و دەنووکی تیژی ســەر دەریای رەشــی. تۆ فێرە ماسی و کەشــتی نــاو دەریــای و لەوانیش تیژتــر دەڕۆیت. ئەوان ماندوو دەبن، دەشــکێن، پیــاوەکان، ســەوڵەکان پەکیان دەکەوێت، تۆ ناکەویــت! تۆمان ناردە ئەو گەرمیانە،

ئــەو دەشــتە بــە پیت و بەرەکەتە، تۆ زیرەک بوویت لە ژمــاردن، گوتمان باجی زۆر کۆدەکەیتەوە! تۆ وەک نەوەرس ئاوی شــیرین و ســوێریش دەخوێتەوە. تۆش وەک نــەورەس بەپێــی وەرز و گەرما و ســاردی دەتوانیت ریش و ئــاکارت بگۆڕیت! بەڵام هیچت پێ نەکرا، ناتوانی ئارامی ناوچەکە بپارێزیت، باجت نەنارد، ســەربازت بۆمان نەنارد!

***

**٢٣ی رەبیعی کۆتایی ١٢٧٦**

**بۆ والی ترابزۆن**

لە قەڵاتی هەولێر بەڕێوەبەری پێشــوو قەپوچی باشــی لــە ریکابی همایۆن تۆزچی زادە ئیبراهیم ئەدهەم ئەفەندی دوای جیابوونەوەی لە کارەکەی خۆی، لەگەڵ ئەوەی گەڕاوەتــەوە ترابــزۆن، لە ئەنجومەنــی واڵا نێردراو، کە لە ترابــزۆن وەک بەڕێوەبەر دەستبەکار بێت.

***

**٣ رەبیعی الاخر ١٢٧٦**

لــە قــەزای هەولێر وەک بەڕێوەبەری قــەزای هەولێر لە کارەکــە دوورخراوەتەوە، لە هەمــان کاتدا بە پێویســتیان نەزانیوە ماوەی کارەکەم درێژ بکەنەوە، من دڵســۆزی خــۆم بۆ دەوڵــەت راگەیاندوە و بۆ رازیکردنی پایەدارانــی دەوڵەت لە قەزای ناوبراو وەکو بەڕێوەبەری خەرجی زۆر کەمم کردوە تەنانەت هیچ گەشتێکم بۆ هیچ شوێنێک نەکــردوە، لــە کۆتاییدا چوومەتە بەغدا، کەچی تا ئێســتا لــە موچەکەم یەک ئاقچە زیــادی نەکردوە، لــەم دوورخرانەوە، لەگەڵ ئەوەش دژی دەوڵەت قســەم نەکردوە، پارەیەکــی زۆرم خەرجکــردوە و گەڕاومەتــەوە ترابزۆن، ئەمــەش بۆتە هۆی ئەوەی دووچــاری پەریشــانی ببمەوە، بۆیە ئەگەر بکرێت دەوڵــەت بەرامبەر بە من میهربان بێــت و لــە قائیمقامیــەت یاخود لــە بەڕێوەبەرایەتییەکم دابنێت، ئەمــر و فەرمان و میهربان و بەزەیی بۆ ئەو کەســەیە کە بەخشندەیە.

**٣ رەبیعی الاخر ١٢٧٦**

**تۆزچی زادە ئیبراهیم ئەدهەم ئەمین.**

***

**٥ رەبیعی الاخر ١٢٧٦**

لەسەر ئەرکی بەڕێوەبەری لە قەزای هەولێر دوورخراوەتەوە و ئیتر پێویستیان پێم نییە، ئەگەر بکرێت بمنێرنە بەڕێوەبەرایەتی قەزایەک یان لە قائیمقامیەت کارم پێ بدەن.

**٥ رەبیعی الاخر ١٢٧٦**

**توزجی زادە ئیبراهیم ئەدهەم ئەمین.**

***

**دەچێتە عەنکاوە**

ئەدهەم ئەفەندی لە رۆژانەی ژیانی زووتر خەم دایدەگرێت، خەمگینیشە لەناو قەڵات دوور دەکەوێتەوە و دوور دەڕوات، بەڵام دەیزانی لە عەنکاوە شەراب هەیە، دەیزانی لەوێ کریستیانەکان لە خورما و جۆ و ترێ شەراب دروست دەکەن. لەوێ ئاشنایەتیان دەکات، چەند جار سەردانیان دەکات، بە زمانی قەشەکان قسەیان لەگەڵ دەکات. بەشێک لە سەربردەی مێژوویان بۆ دەگێڕێتەوە، باسی قوبرس و ئەنتالیا و دێرە کۆنەکانیان بۆ دەکات! دەچێتە گوندی عەنکاوە و سەیری دەشتە زێڕینەکەیان دەکات، دەچێتە سەر گردە پیرۆزەکەیان، کڵێسا کۆنەکەیان، قەسرە کۆنەکەیان، دێرەکەی هەموو باش نازانن کەی و لە چ زەمانێک دروستکراوە!

لەوێ شەراب دەخواتەوە، ئەوانیش قسەی دڵی خۆیانی بۆ دەکەن، پێی دەڵێن قەشەیەکمان هەبوو، زانایەکمان هەبوو، لە عەنکاوە دەچێتە موسڵ. منداڵی خۆمان بوو، لەو کڵێسایە دەخوێنێت و زمان فێر دەبێت، باوکی موڵکی زۆری لەو دەشتە هەیە، دەیان سەپان و پاڵە و شوانی هەیە. پیاوێکە زۆر سەفەری کردوە، ناسیاری لەگەڵ کریستیانەکانی بەرتلە و قوش و موسڵ و کرملیس زۆرە. زۆر خوێندەوار بوو، کتێبی زۆری نووسراوی دەرەوە و ئەوروپاشی خوێندوتەوە، دەخوێنێتەوە، شەیدایان دەبیت. لەوێ تووشی کێشە بووە، والی و کڵێساکانیشی سەرقاڵکردوە، کریستیانەکانی موسڵ و زاخۆ و ئامیدی و مێردینیش بەوە دەزانن ئەو بۆتە پرۆتستانت! لە ریز و فەرمانی ڤاتیکان دەرچووە! ئەوان، گەورەیی و شکۆ زۆرتر بۆ حەزرەتی مەسیح دەگێڕنەوە نەک قەشەکان، نەک کڵێساکان. ئەو گوتوویەتی چیتر بڕوا بە پاپا نەکەن، چیتر بڕوا بە بەڵێنەکانی غوفران و پەیوەندییەکانی چوونە بەهەشت بە راسپاردەکانی پاپا نەکەن!

ئەدهەمــە فەنــدی ئەو قســانە بۆ مەلا و شــێخەکانی نــاو تەکیــە و مزگەوتەکانیش دەگێڕێتــەوە. شــێخەکان، ئــەو مەلایانەی کە تەنیا بە زمانی عەرەبــی کتێبی ئایینی ئیســلامی دەخوێنــەوە. ئــەوان ئاگایــان لە هیچ نییــە، باش و دروســت هەواڵەکانی ئەســتنبۆلیش نازانــن، نازانــن چ لــە موســڵ و بەغــدا و دیمەشــق روودەدات. لەناو قوتابخانەکانی بەغدا چی دەگوزەرێت. ئەوانە چۆن بزانن لە ئەورووپا چ دەگوزەرێت، کڵێســاکان هەســت بە چ مەترسییەک دەکەن. پاپا و ڤاتیکان چۆن لەناو کڵێساکەی رۆمــا قەتیــس بووە، لــە ئەڵمانیا، دانیمــارک و هۆڵەندا و ســوید و هەموو باکووری ئەورووپا پاپا نەفرەت دەکرێت. پاپا بە دەســت و زەبری ئەو پاشــایانەی پشــتیوانی دەکەن، دەیەوێ رێبازە نوێیەکە ریســوا بکات و شەڕیان دەکات.

دیانەکانی عەنکاوە داوا لە ئەدهەم ئەفەندی قائیمقامەکەیان دەکەن، لەلای والی، لە بەغدا کە دەچێتەوە ترابزۆن و ئەســتنبۆل داوای شــەفاعەت لە قەشە عەنکاوەییەکە بکات! کە فەرمانەکەش بۆ موتەســەریفی موســڵ لەســەر ئەو قەشــەیە دەردەچێت، دوور نییــە داوا و راســپاردەی ئــەو قائیمقامەی تێدا بێت. ئاســاییە با بگەڕێتەوە و کەس ســزای نادات، کریســتیانە تووڕەکان ســارد دەکاتەوە. بەڵام ئەویش قســە و پڕۆپاگەندەکەی گوایە لە ئەمریکاوە پارەی وەرگرتوە، گران لەسەری ناکەوێت، چۆن لە ئەمریکاوە پارە و پاداشــت دەگاتە ئەو قەشــەیەی داوای کردنەوەی کڵێســایەکی پڕۆتستانتی کردوە!

**١٦ موحەرەم ١٢٧٥**

**بۆ موتەسەریفی موسڵ**

لەبــەر ئــەوەی ئەنجومەنی موســڵ نوێنــەری پڕۆتســتانی نییە، لە موســڵ نوێنەری پڕۆتســتان قۆچە باشــی شــەماس ئارامی بۆ دامەزراندنی بە نوێنەری پڕۆتستانەکان لەلایــەن وەکیلەکانــی داواکراوە، لە داواکاری ئەنجومەنی موســڵ، وەڵامی نووســراو نێردراوە، لە نووســراوەکەدا هاتووە لە راســتیدا قۆچە باشــی لە ئەیالەتی شارەزوور قەزای هەولێر دانیشــتووی عەنکاوە بووە. لەو دواییەدا لە موســڵ نیشــتەجێ بووە و مەزهەبــی پڕۆتســتانی هەڵگرتــووە و بە هاوبەشــی ئەمریکاوە لەگەڵ کەســانێکی کەم نامەی بە کریســتیانەکان فرۆشــتووە، هەروەها لەلایەن ئەمریکاوە مانگانە ٢٥٠ قوورشــی بۆ بڕاوەتەوە، لە موســڵ داوای لە ســریانی و یەعقوبییەکان کردوە، بێنە

سـەر ئەو مەزهەبە، کە وای لێهاتووە لەڕووی ئاسایشـەوە خەڵک توشی کێشە بێت، بۆیـە وا پێویسـت دەکات لـە شـوێنێک کارێکی پـێ بدرێت، یاخود لـە ئەنجومەنی موسـڵ وەک ئەندامی میللەتی پرۆتسـتان دەسـتبەکار بێت، ئەمەش لە ئەنجومەنی والآ ئاماژەی پێ کراوە، بەڵام هەر چەندە قۆچە باشـی مەزهەبی پرۆتسـتانە گونجاو نییە لەلای بێگانە فەرمانبەر بێت، بۆیە پێویسـتە زۆر بەوردی لێکۆڵینەوەی لەسـەر بکرێت.

❋❋❋

ئەدهـەم ئەفەنـدی زۆر خەم لەوە ناخوات سـەلیم ئاغا پلانی ئـەوەی بۆ دادەرێژێت بیگـۆڕن. یان خۆی هەسـت و سـۆزی هەر بـۆ ئایینی باپیرانی گەرمـە! ئەو نامەیە دەبینێت، زۆرتریشـی لەسـەر ئەو پیاوەی بۆتە موسڵمان، پیاوە عەنکاوەییەکە بۆتە موسـڵمان نـاوی لـە خۆی ناو شـێخ مەسـتەفا! پارەیان بـۆ بڕیوەتە، بـە نامەکە پێدەکەنێـت، لەبـەر خۆی نەرم نەرم بە زمانێک کەس تێیناگات، دەڵێت:

مـن منـداڵ بووم، دووریش نییە باوکیشـم بۆتە موسـڵمان، لە دەوڵەتی عوسـمانی باوکـم و دوایـی من و براکانیشـم چەندان پۆسـتمان هەبووە. چەنـد بڕیارەکان، لە بازاڕ و هاموشـۆیە دەولییەکانیان نزیک دەبن، ئینجا سـۆزمان هەر ماوە! وادەزانین بزمارەکەی لە دەست و مەچەک و قاچەکانی مەسیح دراوە، لە من دراوە. کە دەستم ماندوو دەبێت، کە لە کاروانەکان ماندووم! وادەزانم ژانی ئەوە گەیشتووتە جەستەی منیش! ژانی ئەو، ئەوەندە گران و سـامناک بووە بەشـی هەموومان دەکات! چەندان ساڵە ژانەکان دەڕوات و دێتەوە، گەرم و سارد دەبێتەوە، ساردە و گەرم دەبێتەوە، تـازە بە تازە پیاوێک لە عەنـکاوە، بۆ موچەیەکی کەم دڵنیاش نییە بەردەوام بێت، دەبێتە موسڵمان!

❋❋❋

## ئەرشیفخانەکە

ئاشتی دەچێتە ناو ئەرشیفخانەکە، لەوێ زمانەکە باش دەزانێت، دەستخەتی عوسمانی باش دەخوێنێتەوە، هەر بۆنی حوبرەکە بکات، سەیری مۆرە شینە بازنەییەکان بکات، یەکسەر دۆکومێنتەکە دەخوێنێتەوە. ئەوەندەی خوێندیتەوە، باش شارەزا بووە. سەدان شەو بەدیار وشەیەک، ناوێک، ناوی شوێنێک سەرسام و پەریشان بووە، تا کۆد و وشە و رستەکانی هەڵهێناوە. بۆ ئەو ئاساییە، زوو دۆکومێنتەکانی پێویست و دڵخوازن، بەئاسانی دەدۆزێتەوە.

بەر لەوەی ئاشتی، لەسەر ئەرک و داوای زانکۆی جیهانی هەولێر، بچێتە ئەرشیفی عوسمانی، دەیزانی مێژوو بێ دۆکومێنت و بەڵگەنامە و دەستنووس مێژوو نییە. مێژوو دەنووسرێتەوە و دەبێتە راستییەک، ئەگەر نووسین و دەستخەت پشتیوانی راستی رووداو و ناو و مێژووەکان بکات. ئەگەر بە نووسین بنووسرێت، کەی کەسێک بووە بە سوڵتان، یان وەک حاکم بە فەرمانی سوڵتان دامەزراوە! ئینجا دەکرێ رۆژی دانانی تاجەکەی بنووسنەوە. دۆکومێنت، رووداوەکان دەکاتە راستی، دەکرێ لە لاپەڕەکانی مێژوو ریز بکرێن و بنووسرێنەوە!

ئەوەش ئاشکرایە زووتر پاشاکان، دەسەڵاتداران بەڵگەنامە و دەستنووسەکانیان، لەکن وەزیر و برا و خزم و ژن و منداڵەکانیان جێنەهێشتووە، کە سەفەریان کردوە، کە دوور رۆیشتوون، کە لە مەیدانەکانی جەنگا بە مانگ و ساڵ ماونەتەوە، یان بۆ سەرکەوتن و شکانی سوپای نەیار و دوژمنەکانیان زۆر دوور رۆیشتوون. هەموویان وەک چەک و نان و پارە و ئازووخە لەگەڵ سوپا و بەرنامە و پلان و خوێن و

کەللەسەریان بردوە، هەڵیانگرتووە، بار و گالیسکەیان بۆیان داناوە. سەدان پیاو و سەربازی دڵسۆزیان کردوە بە پاسەوانی باری دەستنووسەکانیان، سەندوقی قەڵەم و حوبر و دەفتەرەکانیان باش پاراستوە.
ئەوە نەریت و باو و پیرۆزیی بووە، زۆریش بەردەوام بووە، تا لە شەڕێکی سەختا پاشای فەرەنسی لویی فیلیپ لە ساڵی ١١٩٤ی زاینی دەشکێت، پاش ئەو نسکۆیە، دوای راکردن و سەرهەڵگرتنەکە، ئەرشیف و دەستنووسەکان دەفەوتێت. خۆ کاغەز و حوبر لە خوێنی سەرکردە و سەربازەکان گرنگتر نییە. بۆیە ئیتر پاشاکانی فەرەنسا بڕیار دەدەن لەناو پاریس، لەناو کۆشکەکانیان، لەنزیک هەست و چاوی پاشاکان، ئەرشیفخانە دامەزرێنن و دۆکومێنتەکان باش و دڵسۆزانە بپارێزن. کارمەند و لێزانی بۆ دامەزرێنن.
بەڵام، ئەو زووتر دەیزانی وشەی ئەرشیف، لە زاراوەی ئەرشیفومی لاتینی وەرگیراوە. ئەوەش لە وشەی ئارخیای یۆنانی وەرگیراوە، واتە کەڤنارە زوو زوو هەبووە. زووتریش بنەماڵە و کەسایەتییە ناودارەکان، بەڵگەنامە تایبەتییەکانی خۆیان هەڵگرتووە، لەبەر دەستی کەسانی دوور و نزیکی خۆیان دووریان خستووتەوە.

***

توێژەران، قوتابییانی بەشی مێژوو، مامۆستایانی زانکۆ و نووسەران، کە دەزانن کیژێکی هەولێری خەریکە دەستنووسە عوسمانییەکان دەدۆزێتەوە، پۆلینیان دەکات و وەریاندەگێڕێتە سەر زمانی کوردی، پەیوەندی پێوە دەکەن، داوا دەکەن، پرسیاری زۆری بۆ ریز دەکەن، بەڵام ئەو زوو پێیان دەڵێت:
من بۆ زانکۆی جیهان، لەسەر داوای دکتۆر نەوزاد ئەو کارە دەکەم. دۆکومێنتەکان ئەو دەیانکرێت، ئەو مەسرەفیان لێ دەکات. من وەک لێزان و وەرگێڕێک ئیشیان لەناو دەکەم. ئەو متمانەی بە من هەیە، دەزانێت وەرگێڕانەکانم دروستە.
بۆ خزمەتی ئەو پڕۆژەیە، لەو رۆژەوە دەست و چاو و تەمەن و رۆژگارەکەی دەبێتە ئەرشیف. ئەوانە داوا دەکەن، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە. هەموو دەستنووس و بەڵگەنامە عوسمانییەکانی سەبارەت بە کوردستان وەک کتێب، بە چاپی ناوازە چاپ دەبن و بڵاودەبنەوە. لەوێ چیتان دەوێ ئاسان دەستدەکەوێت، بە کوردییەکی روون و وەرگێڕانێکی جوانی بەئەمانەتەوە دەدۆزنەوە، ئاشتی بە توێژەران دەڵێت: بڕۆن دۆکومێنتەکان، بەڵگەنامەکان بخوێنەوە، لاپەڕە بە لاپەڕە، رووداو و ناو و

ڕۆژانە و مێژوو دەدۆزنەوە. ئەوەی لە سەدەکانی رابردوو روویان داوە، لە سەدەی بیستەمیش دووبارە بۆتەوە و بەردەوام بووە!
فەرموون ئەو دەقە بخوێنەوە، بزانن چۆن رووداوەکانی دوێنێ ڕەنگدانەوەی ڕۆژانەی ئەو سەردەمەیە.

**نووسراوی سەدری ئەعزەم**
چەتەکانی شەمەرولجەبها عەرەبان لە دەوروبەری کەرکوک گوندی تۆبزاوە و قەزای هەولێر گوندەکانی دوغان و تۆبزاوە و ماستاوە کاری بەدیانکردوە، خەڵکی ئەو گوندانە ئەزیەت دەدەن و زیانیان پێگەیاندون، بۆ پارێزگارکردن سەربازیان ناردۆتە ئەو شوێنانە ئەو پارە و کەلوپەلانەی کە بردویانە دراونەتەوە خاوەنەکانیان، بۆ ئەو مەبەستە نووسراوی والی شارەزوور هاتووە، لە سەروو ئاگادار کراونەتەوە و رەزامەندی دراوە، بۆیە پێشکەشکراوە.

***

هەر ئەو دەقە لە بەرواری ١ی مانگی زیلحیجەی ساڵی ١٢٧١ی کۆچی واتە پێش سەد و حەفتا ساڵ، نامەکە بۆ هەمان مەبەست و ئاگادارکردنەوە بۆ والی شارەزوور نووسراوە. ئاگادارکردنەوە و زانیارییەکە لەناو سنووری دەسەڵاتی عوسمانییەکان درێژەی هەبووە، ئەوەش بێ پاساو نەبووە. دیارە رووداوەکان زۆر بووە، خەڵکی ئەو گوندانە هەراسان بووبوون و گازاندەیان زۆر بووە.
ئەو دەقە، ئەگەرچی مێژووی لەسەر نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی قەزای هەولێر بەپێی ئەو بەڵگەنامەیە سەر بە ویلایەتی شارەزوور بووە، نەک سەر بە ویلایەتی موسڵ دیارە کۆنە و لەمێژە نووسراوە. رووداوەکەش ئەودەمانە روویداوە، بەردەوامیش بووە. لە چەند بەڵگەنامەی تریش ئاماژە بە رێگری و چەتەیی و تاڵانی عەرەب بۆ گوندەکانی نزیک خۆیان کراوە. دیارە ئەو گوندانەی دەشتی هەولێر کە ناویان هاتووە لە گوندە عەرەبەکان نزیکە.
ئەو راوڕووتە بەردەوام لەو ناوچانە هەر ماوە و درێژەی هەبووە، تا دەگاتە ڕۆژانی شۆڕشی ئەیلول، لە ساڵانی ١٩٦٣ی زاینی وەک دوو سەد ساڵ و زۆرتریش عەرەبەکانی ناوچەکە، گوندە کوردییەکانیان تاڵانکردوە. بە سزا و لێپێچینەوەی سەدری ئەعزەم

وەک لــە بەڵگەنامەکە دیارە، کۆتایی نەهاتووە، تاڵانکردنی هەر هەبووە.

❊❊❊

نیو کوپ برنج بە ئاوی سارد دەشۆنەوە، کەوچکێک و نیو لە ئارد و یەک زەردێنەی هێلکە و دوو جامی بچووکی ماســت و دەســتێک پوونگی تەڕ و ٥٠ گرام کەرە و لیتر و نیوێــک ئــاو و ئاوی ترشــاوی لیمۆ و خوێ، ســاز دەکات. برنجەکــە دەکوڵێنێت. زەردێنــەی هێلکەکــە لەگــەڵ ئــارد و کەرەکە تێکــەڵ دەکات و ئاوێتــەی یەکتریان دەکات. بەشــێک لە ئاوی برنجەکە، لەگەڵ ماستەکە تێکەڵ دەکات. تێکەڵەی ماست و خوێ و لیمۆکە لەگەڵ ئاوی برنجەکە باش تێکەڵ دەکات. کەرەکە لەسەر ئاگرەکە دەتوێنێتەوە و پوونگە تەڕەکەی لەگەڵ تێکەڵ دەکات و باش تێکیان دەدات. لەگەڵ کوڵانی شــۆرباکە، ئــاوی پوونگەکەی تێــدەکات و باش تێکەڵیــان دەکات. بەوەیان شــۆربای ماســت بە پوونگی تورکی ساز دەکەن. دوو کیژەکەی قوتابی زانکۆ بوون، شۆربایەکی دەشتەکی و جووتیارانە ساز دەکەن و دەیخۆن. پێدەکەنن و خواردنەکە بەتامەوە دەخۆن و دەڵێن:

تا ژەمی خواردنی تورکی دروســت نەکەین و نەخۆین، باش فێری زمانەکەیان نابین! زووش خوێندنەکەمان لەو وڵاتە تەواو نابێت، کچێ هەر دەرناچین! «بەپێکەنینەوە».

هەردووکیان خواردنی ناو مەنجەڵە بچووکەکە تەواو دەکەن. تامی پوونگە کوڵاوەکە، چەشەیان دەکاتەوە بگەڕێنەوە سەر کتێبە تورکییەکانیان، مێژووە کۆنەکەی تورکیا. هــەر بــەو بۆنەیە، بــۆ ئەوەی مێژووەکــە بە شــیرینی بخوێنن، تــام و چێژێکی پێ ببەخشن، مێژووەکە، کتێبەکانی لەناو دەستیان ببن بە حەڵوا، شەوەکەی حەڵوایەک لە گەنمی ســمیت دروســت دەکەن. گەنمەکە کەمێک لە برووش وردترە، بەڵام وەک ئارد نییە. لەناو روون سووری دەکەنەوە. یەک گڵاس شیر و گڵاسێک ئاوی تێدەکەن، گلاســێک شــەکریش دەتوێنەوە، دەبێتــە حەڵوایەک بۆ ئــەو قوتابییانەی لەماڵەوە دوورن، خواردنێکــی بەپەلــە و شــیرینە و حەزی لێ دەکەن و زوو زووش دروســتی دەکەن.

❊❊❊

ســەفەرەکەیان بــۆ ئەســتنبۆل و دیتــن و هێنانــی دۆکومێنتــی تایبەت بــە بابەتی ماســتەرەکەیان بەرنامــەی بــۆ دادەنێــن. لەگــەڵ مامۆســتاکەیان رێکدەکەون کەی ســەفەرەکە بکەن. کام بەشــی ئەرشیفەکە بەسەربکەنەوە و چەند دۆکومێنت بێنن!

بەر لە جەژنی رەمەزان لە مەراش دێنە غازی عینتاب. لەوێش دووبارە بە پاسە گەورەکان دەچنە سلۆپی و ئیبراهیم خەلیل و دەگەڕێنەوە هەولێر. ئاشتی حەز دەکات، چەند رۆژێکیش بەر لە جەژن لەگەڵ دایکی بەرۆژوو بێت، ئێوارەکەی جەژنیش، یان بەیانییەکەی زوو سەرێک لە قەبری باوکی بدات، دوو سورەتی قورئانیشی لەسەر بخوێنێت، بۆیە زووتر دەگەڕێتەوە، بەڵام چەند کتێبێکیش بۆ خوێندن لەناو جانتاکەی دادەنێت. ئەو لەجیاتی دیاری، بەردەوام جانتاکەی کتێبی تێدا بووە.

دەچێتەوە هەولێر، دەوامی زانکۆش هەبوو، دوو جاریش سەردانی کۆلێژەکەی دەکات، موچەیەکیش وەردەگرێت، بۆ هەندێ کاروباری بەڕێوەبردن و پێویستییەکانی مۆڵەتی خوێندنەکەی، دەچێتە وەزارەت. وەزارەتیش ئەوەندە لە کۆلێژەکەیان دوور نییە، بەڵام پەڕینەوەی شەقامە سەرەکییەکە، لە پڕینەوەی رووباری نیل زەحمەتتر دەبینێت.

لەو سەفەرەی بۆماڵەوە، دوو جار دایکی پێی دەڵێت:

کیژم، ئاشتی زۆرت ماوە، خوێندنی تۆ هەر تەواو نەبوو. ئەوە تۆ ئەوت راکێشایە تورکیا، یان پەیمان تۆی برد! بەس نییە! خوێندن و کتێب بوو بە چ؟! «نایەوێ پێی بڵێت هەموو شتەکان تەواو بێت، مێژوو تەواوبوونی نییە، مێژوو لەگەڵ هەناسەیە، لەگەڵ بوون و ژیانە».

ئەویش دەڵێت:

دایکە پەلەت چییە، چەند جارە دەڵێین؛ ماستەر دوو و نیو و سێ ساڵی دەوێت! تەواو دەبێت، بەس بزانم تۆ بۆ پەلەم لێ دەکەیت! هەر ناڵێم و ناڵێمەوە من کیژی خوێندن و مێژووم. کیژێکم بۆ باوکم دەخوێنم، بۆ هەولێر دەخوێنم، بۆ مێژوو دەژیم! مێرد ناکەم، منداڵم ناوێ، تاقەتی منداڵ و ماڵ و کراسی بووکینی و شەکراوم نییە! ئەوە لە مێشکت دەربێنە! چاوم لەوە نییە، کوڕێک، مامۆستایەکی کۆلێژەکەمان، لەو سەفەرانەی دەچمە تورکیا و دەگەڕێمەوە، لەو کاروانانە کوڕێک بدۆزمەوە، پیاوێک من نیشان بکات، داوای ژمارەی تەلەفۆنم لێ بکات، ناوم بپرسێت، بڵێت لە هەولێر ماڵتان لەکام گەڕەکە! ئەوەم ناوێ تاقەتی ئەو شتانەم نییە، بەتەمای من مەبە، ئەوە خوشکەکانم شوویان کردوە، لە منیش بچووکتر بوون، منداڵیان هەیە، براکەم منداڵی هەیە، نەوەی زۆرت لێ کۆدەبنەوە، بووکت هەیە، زاوات هەیە، وەک بزمار

قیت بۆت دەوەستن! ماڵێکی گەرم و ئاوەدان، یەک دەڕوات و دوو دوو دەگەڕێنەوە، چیت لە من دەوێت! با منیش بەو جۆرە بژیم و منیش بەو شـێوەیە لەو ماڵە هەبم. یان دیارە لێم بێزار بوویت و دەتەوێ دەرمپەڕێنیتە دەرەوە «دەستی لە ملی دەکات و ماچی دەکات».

***

**کیژەکە بە دایکی دەڵێت:**

دەنا دایە لەو ســەفەرە، پاش جەژن دەچینە ئەســتنبۆل، دووریش دەڕۆین، دەچمە شــوێنێک مێــژوو لەوێ هەڵگیــراوە. تەواوی مێــژووی ناوچەکە لەوێیــە. لەوێ ناوی خەڵک و ســوڵتان و والیەکان تۆمار کراوە. ئەو گەنجینەیە، ســەربردەی ئەو دونیایە گەورەیەی تێدایە. ســێ ســەد چوار ســەد ســاڵ، چ لەو دونیایە روویدا بێت، لەوێ نووسراوەتەوە! دانراوە. نووسینەکان ماون، ناوەکان دەناسرێنەوە، رووداوەکان وەک خــۆی، بەڵام دووریش نییە بەگوێری ویســتی خۆیان نووســرابێتەوە! دایە ئەو جارە دەچمە ئەســتنبۆل، بەسەر پردە هەڵواســراوەکەدا دەپەڕمەوە، شارێکە دوو جیهانی داگیر کردوە، پردێکە دوو جیهانی بەســتاوەتەوە! ئەســتنبۆلم نەدیوە، بەڵام زۆر بۆ من ناوی هاتووە، زۆر کەس رۆژانە ســەردانی دەکەن.

من دەچمە ئەســتنبۆل، بۆ ســەر دەریا ناچم. بۆ خواردنە هەرزانە خۆشەکانی ناچم، بەتەنیاش ناچم من و پەیمان بەیەکەوە دەچین. ئای ســەیرە هەر بەیەکەوە دەچینە هەمــوو شــوێنێک، هەموو شــارێک، باش بەیەکتریــەوە گرێ دراوین. مــن ئەوم بە خۆمەوە گرێداوە! یان ئەو منی بە بســکە شــیرینەکەی گرێداوە. هەردووکمان مێژوو بەیەکتری گرێی داوین، بەند و ئەســیر و دڵســۆز و قوتابی مێژووین!

ئەوان بە پرۆفیسۆر فاروق دەڵێن:

پــاش جەژن لــە هەولێــرەوە دەچینە ئەســتنبۆل. لــەوێ دەچینە ئەرشــیفخانەکە. ئەوەی دەمانەوێ، ئەو دەق و دەستنووســانەی ســوود بە بابەتەکەمان دەگەیەنێت، دەیکڕین! خۆ ناکرێ ئەوەندە لەناو ئەرشــیف و بۆن و مێژووی تورکیا بخولێینەوە و ئەســتنبۆل نەبینین، دوور بەدووریش بێت، منارە و مزگەوتەکانی نەبینین، باشــە بۆ دوور بە دووری، ئیشــمان چییە پاش دەوام ئێواران دەچینە ســوڵتان ئەحمەد، ناو مزگەوتــەکان، ناو باخچەکانی بەردەم مزگەوتەکان.

لــە هەولێریــش هــەردوو کیژەکە، پێش جەژن ســەرێک لە کۆلێژەکەیــان دەدەن. بە

دایکیــان دەڵێــن، بــە کوڕێک دەڵێــن زووتر قوتابی خۆیان بووە، لەســەر شــەقامی سەرەکی هیلالی لە ئۆفیسێکی فڕۆکەوانی ئیش دەکات، دوو بلیتی یەکسەری هەولێر ئەســتنبۆلیان بــۆ بدۆزێتــەوە. بە تەلەفۆنیش قســەی لەگەڵ دەکــەن، دەڵێن کاتی فڕینەکەمــان دوو ڕۆژ پــاش جــەژن بێت، ڕۆژانی هەینی و شــەممە نەبێت. نایانەوێ لە ڕۆژانی پشــوو ســەفەر بکەن، ئەگەرچی ئەوە یەکەمجاریان بوو، سواری فڕۆکەش دەبــن، یەکەمجاریــش بوو، بلیت دەبــڕن، بەڵام دەزانن، ڕۆژانی پشــوو بلیتی فڕۆکە گرانترە!

ئەوان دەپرسن هەموو لایەنێکی سەفەر و شار و گەشت و بەرنامەکەیان پاش شرۆڤە کردبــوو. دەپرســن و دەخوێنــەوە. زووتریش کە لە مەراش لــە دەوام بوون، زۆریان لەســەر شــارەکە بیستبوو. زانیاری باشــیان لە هاوڕێ و مامۆســتا و کارمەندەکانی وەرگرتبوو. هەموو وردەکارییەکان دەپرســن. دەپرسن لەکام دەروازەی فڕۆکەخانەکە بێنە دەرەوە. لە دەرەوە بە پاس، یان بە تاکســی بچینە ناو شــارەکە. فڕۆکەخانەکە چەنــد لەناو ســەنتەری شــارەکە دوورە. دەپرســن و دەزانن چەند زووتــر لەوێ بن باشــترە، بــەڵام باس لە گەڕانەوە ناکەن، قســە لەســەر بەرنامــەی هاتنەوە ناکەن، نازانــن چەنــد ڕۆژ لــەوێ دەمیننێــەوە، دەســکەوتیان چەند و چــۆن دەبێت، دوور نییــە «پێدەکەنــن» ئەگەر زانیاری زۆرمان دەســتکەوێت، پارەکەمان تەنیا بەشــی دۆکومێنتەکان بکات، هەموو دەقەکانمان پێ بفرۆشــن، بەپێیان دەگەڕێینەوە مەراش و بەردەم مامۆستا پسپۆرەکەمان.

***

کیژەکان بە دایکیان، بە خوشــکەکانیان دەڵێن:

بۆ ئەو ســەفەرە خواردن و زەخیرەمان ناوێ. ئەو جارە ناچینەوە شــوقەکەمان. لەو ســەفەرەی پــاش جەژن دەچینە هوتێل، لــەوێ تەباخ و مەنجەڵ و مەقلی تێدا نییە. لە دەرەوە نان دەخۆین. لەناو ئەســتنبۆل، لەسەر شۆستەکانیش خواردن هەیە، ئەو جارە بە پاس ناچنەوە تورکیا.

لەو گەشــتەدا لەســەر ســنوور، لە خاڵی ئیبراهیم خەلیل دواناکەون، نایانپشــکنن، ڕاناگیرێــن! جانتاکانیــان پێ ناکەنەوە، لێیان ناپرســن چەند کیلۆ تۆ چاتان هێناوە، جگەرەتــان پێیە! تورکەکان ســەیری کتێبە کوردییەکان ناکەن، ســیدییەکان نابەنە ژوورەکانــی کۆنترۆڵ و بەناوی گوێگرتن و بیســتن و زانین دوا ناکەون! یەکســەر لە

فڕۆکەخانـەی هەولێـر سـوار دەبن و لـە تورکیا دادەبەزن. لەوێـش دەچنە ناوچەی سوڵتان ئەحمەد نزیک مزگەوتەکانی شین و ئایا سۆفیا، جەرگەی ناوچە گەشتیارییە جەنجاڵەکە.

***

بەیانییەکـی زوو دوو کیژەکـەی دەیانەوێ مێژووی کوردسـتان لەناو دۆکومێنتەکانی عوسـمانی بدۆزنەوە، دەگەنە فڕۆکەخانەی سـەبیحە کوکجن «Sabiha Gukçen Havalimani». فڕۆکەخانەکـە بەنـاوی ئەو ژنە تورکە کراوە، ئـەوەی یەکەمجار فڕۆکەی جەنگی بەکارهێناوە. تورکەکان ئەو ژنەیان شاناز کردوە، دووەم فڕۆکەخانەی نـاو ئەسـتنبۆلی بەشـی ئەسـیاکەیان بەناوی ئەو کردوە. قسـەش هەیـە، ئەو ژنە بەڕەچەڵـەک ئەرمەنـی بـووە. منداڵێکی بەجێمـاوی ڕۆژە تاڵەکانی نـاو کۆمەڵگەی تورکیا بووە. بۆیەش ئەو و چەند منداڵی تر، دەڵێن هەشـت منداڵ دەبن، ئەتاتورک لە سـاڵی ١٩٢٥ دەیانگرێتەخۆ و نازناوەکەی خۆی پێوەیان دەلکێنێت.

سەبیحە بەر لە مردنی لە ساڵی ٢٠٠١ی زاینی دەزانێت لەناو ئەستنبۆل فڕۆکەخانەیەکی نـوێ، بـە دووری سـی و پێنـج کیلۆمەتر لەناو سـەنتەری شـارەکە، بە دوو سـاڵ ئیشکردنی بەردەوام کراوەتەوە بەناوی ئەو کراوە. بەڵام، ئەوەندە پیر بووە، تەمەن بواری نەداوە، لەو فڕۆکەخانەیەوە سەفەرێکی ئەرمینیا بکات. لەو سەفەرەدا بەدوای ڕەچەڵەکی خۆی بگەڕێت، یان لەناو ماڵی باوکی تورک و سـەرکردەی تورک کەمال ئەتاتورک گەورە ببووبێت، بیری لەوە نەکردۆتەوە، سەفەرێک وا شانازی بکات. ئەو منداڵێکـی بەجێمـاوی ئەرمەنە! منداڵـی بەجێماوی ئەرمەن لـەو جیهانە زۆر بوون، زۆرن و داوا دەکەن و قسەیان هەیە. ئەوان لەو ڕۆژگارە دەیانەوێ حکومەتی تورکیا قەرەبووی سـەر و ماڵ و خوێن و خاکیان بکاتەوە. دونیاش بڕوا بە دەنگ و داوا و نزاکانیان دەکات. زۆریش نووسـەرە گەورەکانی تورکیش، پشـتیوانیان دەکەن، بۆیە لە تورکیا بە خیانەت تومەتباریان دەکەن. بەڵام، ئەوانە لەبەر ئەوەی نووسەرەکان، لەسـەر ئاسـتی جیهان زۆر ناسـراون، دادگای تورکی ناتوانێت کەلەبچە و ریسوایان بکات.

هەردووکیـان، لە دوو گەڕەکی دوور لەیەکتری ناو شـاری هەولێر جانتا بچووکەکانی دەسـتیان هەڵدەگرن. لـە فڕۆکەخانەی ئەربیلی نێودەوڵەتی سـوار دەبن. بە کەمتر لـە دوو کاتژمێری فڕین و سـەیرکردنی بـەر پەنجەرەکە و خواردنی دوو پارچە کێک

و شـــیرینییەکە، دەگەنە ســـەر ئەســـتنبۆل. شـــارێک بەقەد وڵاتێک گەورە و ئاوەدان دەبینـــن. فڕۆکەکـــە هەر دەڕوات و شـــارەکە تـــەواو نابێت. ئاو و دارســـتان و چیا و باڵەخانـــەی بـــەرز و شـــەقام و ڕێگای بەرین تەواو نابێت! شـــارێکە بـــە ڕووداوەکانی هەموو مرۆڤایەتی، بە مێژوویێکی دوور و درێژی خوێناوی و شـــکۆ و شـــەرمەزارییش دروســـت بووە! پایتەختی گەورەترین دەسەڵات و خوێناویترین دەسەڵات ماوەتەوە.

لەنـــاو فڕۆکـــە بچووکەکەی هێڵی پیگســـوس ســـەیری یەکتری دەکەن. ئـــەوە ئەوانن وەک ئەســـپە باڵدارەکەی فڕۆکەخانەکەی بەناو کراوە، ئەســـپە ئەفسوناوییەکەی ناو کەلتووری یۆنانییەکان، دوو ئەســـپی باڵدارن و هاتوونەتە ئەستنبۆل. لەو سەفەرەدا دەیانەوێ بەیانی زوو ڕۆژ دەرکەوێت، تێشـــتی بەیانی لە ســـالۆنی هوتێلەکە بخۆن و ســـواری پاسی ژمارە ٤١ بن و بەرەو ئەرشـــیفی عوسمانی بڕۆن! بیریش لە خواردنی فراوینی نیوەڕۆش ناکەنەوە.

دەیانەوێ بڵێن لێرەش هەر بەیەکەوەین! ســـەبر ســـەبر نۆرەی دابەزین دەگرن، بەڵام ئەوان وەک زۆربەی گەشتیارانی ناو فڕۆکەکە نین، زمانی تورکی باش دەزانن، زۆرتر لـــە ســـاڵێکە قوتابین لـــە زانکۆیەکی تورکیـــا، زمانەکە بە نووســـینەوە دەزانن، پێی دەنووســـن. ئیمڕۆ وا هاتوونەتە ئەو شـــارە، شـــارەزای زمانی عوسمانی بن، ڕێنووسە کۆنەکە بخوێنەوە، لاپەڕە کۆنەکان بدۆزنەوە!

***

لە فڕۆکەخانە دێنە دەرەوە، دەگەنە ســـەر شۆســـتە ســـاردەکە. لەوێ ئاوەدانییەکی کەم دەبینن، لە شـــەقامەکە دەپەڕنەوە. تێدا هاتوچۆی کەمە، جانتاکانی دەســـتیان گەورە نییە، بەڵام ئاســـان لەســـەر شۆستە و شـــەقامەکە بۆ پەڕینەوەکە باش نەبوو، دەپەڕنەوە. پێدەکەنن، بەڵام سەبر و ژنانە، یەکێکیان زووتر دەگاتە سەر شۆستەکە نزیکـــە پاســـە گـــەورەکان، دەپرســـن کام پـــاس دەچێتە تەقســـیم. لە دووری ســـێ مەترێک پاســـێکی ســـپی گەورەیان نیشـــان دەدەن. هەردووکیان بـــە جووتە، ئەوان هـــەر بەیەکەوەن، بەڵام دوو جانتای دەســـتیان ڕادەکێشـــن، نـــا جانتاکانیان مۆدیلی کـــۆن بـــوون، ڕانەدەکێشـــران، دەبوایە هەڵگیرێن، لە شـــان بکرێن، بـــەڵام بچووک و سووک بوون! دەپرسن، تەقسیمە، شوفێرە لاوازەکە، پانتۆڵەکەی شل و قەمیسێکی زســـتانەی ئەستووری هێڵداری لەبەرە، ســـەندوقە گەورەکەیان بۆ دەکاتەوە، خۆیان جانتاکانیـــان لەنـــاو ســـەندوقەکە دادەنێـــن، فێربـــوون و ڕاهاتوون، زۆر بەو پاســـانە

سەفەریان کردوە. فێربوون، زۆر جانتاکانیان بەسەر نهۆمی سەرەوەی شوقەکەیان خستووە. ئەوان دەتوانن، چالاکانە، گەشتیاری سەفەر و گەڕانن، جلوبەرگ و پێڵاوی پێیان توند و شیاوە. لەگەڵ سەرکەوتن و بەر لە دانیشتن، یەکێکیان پارەی هەردووکیان دەدات، زۆر دوور ناکەونەوە، لەسەر کورسییەکانی پێشەوە دادەنیشن. دەیانەوێ بە چاوی توێژەرێکی سەدەی بیست و یەک، سەیری شارە کۆنەکە بکەن، سەیری باڵەخانە و تابلۆ و رووکاری شارەکە بکەن.

ئەوان ئەو دوو ساڵە هاموشۆیان لەگەڵ تورکیا گەرمە، لەگەڵ زمانەکە خۆشە. یەکەمجارە دەچنە ئەستنبۆل. لە بەشە ئاسیاییەکەی دادەبەزن. لەبەر ئەوەی بەیانییەکی زوو بوو، ترافیک زۆر نەبوو، بە سەر پردە هەڵواسراوەکە دەپەڕنەوە! پاسەکە خێرا لێدەخوڕێت و بە نیو سەعاتێک دەگاتە تەقسیم! لە تەقسیم هێشتا مزگەوتە گەورەکە بناخەی دانەنرابوو. بیریش لە دروستکردنی ئەو مزگەوتەش نەکرابووە، بەڵام پەیکەرەکەی کەمال ئەتاتورک لە دوورەوە دەبینرا. زووتر بڕیاریان داوە، چۆن بچنە هوتێلەکەیان، چۆن بیدۆزنەوە، بە تاکسی بڕۆن یان میترۆ، تاکسییەکە بۆ ئەوان ئاسانتر و باشترە!

بە کەمتر لە بیست دەقەیەک تاکسییەکە، بەناو چەندان کۆڵانی بەردی تەسکی زۆر باریکی یەک سایدیان دادەبات، بەیانییە و زووە، کۆڵانەکە ترافیکی نەبوو، لەبەر دەروازەی هوتێلەکە، دوو کیژە هەولێرییەکەی هاتوون ئەرشیفی عوسمانی ببینن و بخوێننەوە و بکرن، دادەبەزن.

یەکێکیان دەچێتە ژوورەوە، دوو دەقە دەمینێتەوە، لەگەڵ کوڕێک بە کرمانجی قسە دەکات دەگەڕێتەوە. ئەویش هەردوو جانتاکەیان لێ وەردەگرێت، ئیتر دەستیان بەتاڵ و سووک، دەچنەوە ناو سالۆنە بچووکەکەی هوتێلەکە، پاسپۆرتەکان دەدەنە ئەو کوڕەی کە بە تورکی قسەیان لەگەڵ دەکات ـپێی سەیرە ئەوانە چۆن وا زمانەکە دەزانن ـ ئەویش لاپەڕەی یەکەمیان کۆپی دەکات و بۆیان دەگێڕێتەوە. پاسپۆرتەکەی دەیان مۆری ئیبراهیم خەلیلی هەر دیوەکەی سنووری پێوەیە، ئینجا یەکەمجارە دێنە ئەستنبۆل. ئەوەی بەوردی سەیری مۆرە سوورە کالەکەی سەر لاپەڕەی هەردوو پاسپۆرتەکانیان بکات، سەرسام و دەڵێت:

سەیرە، مۆری سەر هەردوو پاسپۆرتەکە، لە یەک بەروار و یەک رۆژە. ئەوانە بەردەوام بەیەکەوە سەفەریان کردوە. بەیەکەوە گەڕاونەتەوە کوردستان، دەرچوون

و گەڕانەوەیان بەیەکەوە بووە. ئیمڕۆش وا بەیەکەوەش هاتوونەتە ئەستنبۆل. بەڵام کێ تاقەتی ئەو وردەکارییەی هەیە، وا بەیەکەوە هاتوون، زۆر هەڵسوکەوت و داوا و ویستیان وەک یەکە. ئەگەر رۆژی دەرچوونی پاسپۆرتەکەیان وەک یەک نەبوو، پەیوەندی بەوە هەبوو، ئەودەمانە دەرکردنی پاسپۆرت لە هەولێر نەبوو، ئەگینا بەدڵنیاییەوە رۆژی دەرچوون و مۆرکردنی وەرگرتنەوەکەیان بەیەک رۆژ دەبوو.
ئینجا سەربردەی پاسپۆرتەکانیان سەیرتر دەبوو؛ دوو پاسپۆرت لە یەک رۆژ دەرچووە، لە بەغدا مۆرکراوە، وێنەکانی کۆپی کراوە، دیارە ناوی باب و باپیرانیان وەک یەک نییە، واتە خوشک نین. ئەدی چۆن پاسپۆرتیان بەیەک رۆژ دەرهێناوە، چۆن ئەو هەموو سەفەرەی ناو تورکیایان بەیەکەوە کردوە! مۆرە سوورەکانی سەر لاپەڕەکانی پاسپۆرتەکانیان بە ژمارە و بەروار چوون و گەڕانەوەیان، ئیبراهیم خەلیل و مۆرە کوردییەکەی و خابوور و ناوە تورکییەکەیان وەک یەکە! کوڕە گەنجەکەی پێشوازییەکە، سەیری ناو و وێنەکانیشان ناکات و روو لاپەڕەی یەکەمی هەردوو پاسپۆرتەکە کۆپی دەکات. لەگەڵ پێدانەوەی پاسپۆرتەکانیان کلیل، یان پسولەی کۆدی ژوورەکەیان کە ژمارە ٤٢٣ی لەسەر بوو، لە پێشیان دادەنێت و روو شیرین پێیان دەڵێت:
فەرموون، بە ئەسانسۆرەکە سەرکەون، دوایی جانتاکانتان بۆ دەنێرمە ژوورەکەتان. یەکێکیان، یان هەردووکیان بە نەرمی و سۆزەوە سوپاسی دەکەن، بەڵام نایانەوێ بڵێن، قەیدی نییە خۆمان هەڵیاندەگرین!
بەر لەوەی سەربکەون، کوڕەکە پێیان دەڵێت:
خواردنی تێشتی بەیانییش لە حەوتی بەیانییەوە لە نهۆمی پێنجەم کراوەتەوە!

***

**لەناو شارە گەورەکە**

ئیتر بەو جۆرە جاری یەکەم، هێشتا قوتابی ماستەر بووە، ئاشتی رەحمان لە ئەستنبۆل لە هوتێلێکی ناو کۆڵانە باریکەکانی جەرگەی ئاوەدانی و قەرەباڵغییەکەی سوڵتان ئەحمەد، بە جانتایەکی بچووک و موحەجەبە و بە جلی سادە دادەبەزیت. ئەو گەڕەکەی بەناوی سوڵتان ئەحمەدی یەکەم کراوە، ئەوەی لە دووری ئەستنبۆل و لەسەر دەریای ئیجە لە ساڵی ١٥٩٠ لە دایکبووە. بە دروستکردنی مزگەوتەکە

شـــانازتر ناوی دەردەچێت و دەناســـرێتەوە. مزگەوتەکەی بەرد و مەڕمەڕ و ڕەنگ و شـــەوق و جوانییەکانی بە ڕەنگی شـــین بووە، بۆیە مزگەوتەکە، بە مزگەوتی شینیش ناوی دەبەن.

ڕۆژانـــە دوو ملیـــۆن گەشـــتیار ڕەنگە زووتر وا بووە ســـەردانی دەکەن، «ئێســـتا ئەو ژمـــارە، ئەو شـــەپۆڵە چڕە لە هەناســـە و چاو و حەزەکان کەمـــی کردوە»، ئەوەیان پێش گۆڕانە سیاسییەکان و دوورکەوتنەوەی تورکیا لە مەداری ناتۆ و ئەمریکا «بە ڕەواڵەت و قسە و پەیڤ و دیدارەکان دەرچووە، بەڵام ڕاستییەکەی هێشتا لە جەرگە و گەرمەی هاوکێشـــەکانە»، ئەوێ و جەرگەی ناوچەکە «ئەمینونو» بازاڕ و جوانی و گەرمـــی هاتوچـــۆ و گەنجینـــە کۆنە دەگمەنەکان، دوکانەکانی شـــەوق دەبەخشـــن، بۆنەکانی دەگەنەوە ئەســـتێرەکان، ناو قوڵایی دەریاش زۆر ئاوەدانتر بووە.

ئـــەو لـــە فرۆکەخانەی ســـەبیحە دابەزیـــوە، کات زووە، نیوەڕۆیە، نایـــەوێ زۆر لەناو گەڕەکەکە، بازاڕەکان، قەیســـەرییە گەورەکە، حەوشە و باخەکانی مزگەوت و زوومی کامیرای گەشتیارە ژاپۆنییەکان و ناز و هەڵبژاردنی دیارییەکانی ژنە ئەوروپییەکان و سادەیی ڕێپێوانیان خۆی دوابخات. سەرقاڵ بێت. ماندووە، دوێنێ لەوەتی لە ماڵەوە دەرچـــووە، پیادە و چاوەڕوان و بەڕێوە بووە.

کیژەکە نایەوێ بچێتە ناو قەسری تۆپ قاپی ئەوەی لەنێوان ساڵانی ١٤٦٥ ـ ١٨٥٣ی زاینی بارەگای دەســـەڵات و حکومی هەموو پاشـــاکانی عوسمانییەکان بووە. لەوێ لە ساڵۆنێکی تاریک، زۆریش تاریک نییە، بەڵام چراکانی کزن، ڕووناکییەکە وەک ئەوەی شـــەرم لە گەورەیی و شـــکۆداری گەنجینەکان بکەن، نەرم نەرم دەجریوێنن. شـــیری درێژی بە نەخش و ســـادە و پیرۆزی هەموو خەلیفەکانی ڕاشـــدینی تێدایە. هەر لەو بەشەدا، لەناو جامخانەیەکی توند بەستراو، دەستی پێغمبەرێک. لەناو جامخانەیەکی تری لاکێشەی ڕەنگ گەرم، شوێن پێی یەکێکی تر. لەتەنیشت ئەوانە دار و گۆچانی یەکێکـــی تـــر، بـــۆ نمایش و گەورەییـــان دانراوە! ماوەیـــەک لەناو ســـاڵۆنەکانی کۆنە کۆشـــکەکە نامینێتەوە. بواری ئەوەی نەبووە، لەگەڵ گەشـــتیارە بێگانەکان، ژنەکانی قژیان زۆر کورتە و نایبەستن، سادە هاتوون، بەڵام وا دیارە زۆر بە قوڵییەوە سەیر دەکەن. هەموویان بەدیار گەنجینەکان، جوانییەکان دەوەســـتن. بەڕاستی سامگرتوو، دوو دوو، نـــەرم نـــەرم وەک ڕەوتی کەو. یەک یـــەک وەک پارچەیەک بەفر، دێنە ناو ژوورەکانی دار و دیوارەکانی کۆنە کۆشـــکەکەی سەربردەی زۆریان دیوە، زوڵمی زۆر

و کۆژانـــی ژنانی زۆرتریان دیوە! دەخولێنەوە، بـــەڵام وێنە ناگرن، چونکە لە هەموو بەشـــەکانا بە هێمای کامیرا قەدەغەیە، ئاماژە بەوە کراوە.

***

شەو گەیشتووە و ماندووە و نازانێت بەرنامەی بەیانی لەناو ئەرشیفەکە بە چ دەگات. ئەو دوودڵە، یەکەمجارە دەچێتە مەڵبەندێک. یەکەم توێژەرە، کوردێکە هاتووە لەناو کۆنە ئەرشـــیفەکەیان، کوردســـتان، هەموو کوردســـتان بەتەنیا بدۆزێتەوە. ئەو سادە و ئاســـایی جانتایەکی ژنانەی چەرمی نوێی پێیە. چەند ســـەد دۆلارێکی قەد کردوە «موچەی دوو مانگی لەســـەر یەک وەرگرتوە، ســـەد هەزاریشی لێ سەرف نەکردوە. پارەکەی گۆڕیوەتەوە بە دۆلار»، بۆنێکی بچووک، شـــانەیەکی شـــینی ورد، کەسیش نازانیـــت پرچـــی درێژە یـــان کورتە و چۆن دەیبڕێت، ئەوانـــە و دوو دەرمانی ژنانە و دەفتەرێک و دوو ســـێ قەڵەمی پێیە. پاسپۆرتەکەی لەناو گیرفانی ناوەوەی جانتاکە دانـــاوە. ئـــەو دڵی بـــە جانتاکەیەوە نەبوو، لە جانتاکە و پارەکەی نەدەترســـا، بەڵام لە پاســـپۆرتەکەی دەترســـا. بۆیە زووتر پاســـپۆرتەکەی لەناو گیرفانـــە بچووکەکەی ژێرەوەی چاکێتەکەی بەری دانابوو. وای دادەنێت خۆشـــی هەســـت بە بەرگە رەق و گەرماکەی نەکات! نزیک لە چاو و دڵ و هەناسەی دایدەنێت. پاسپۆرتەکەی ئەوەندە باش شـــاردۆتەوە وا دەزانێـــت، نەیهێناوە، لەلای دایکی بەجێیهێشـــتووە. هێناویەتی چۆن نەیهێناوە، ئەدی چۆن لەسەر سنوور و پردەکە پەڕیوەتەوە! ئەدی ئەو لەگەڵ لێدانی مۆرەکە، لەبەردەم ئەفسەرە تورکە کورتەباڵاکە رانەچڵەکی، وادەزانێت لەگەڵ لێدانـــی توندی مۆرەکە وا دەزانێت لێی کون کردوە!

ئەو ناچێتە سەر پردەکەی «گەلاتا»، پردە کۆنە نەوییەکەی، زۆر بەرز نەکراوەتەوە بـــەڵام ناوەندەکـــەی دەکەنەوە، تا بـــواری تێپەڕبوونی چەند پاپۆڕێک بدەن. لەســـەر پردە ژەنگاوییە کۆنەکە ســـەدان پیاو، هیچیان تۆزقاڵێک، دەســـتی نازیان؛ بە قژ و شـــان و مل و پانتۆڵ و قەمیســـەکانیان دانەهێناوە. مرۆڤی؛ شڕ و ماندوو و تووڕەن. ئەوانە تووڕەن لە دەریاکە، کە ماسییەکان دەشارنەوە، بە لەنجە سەرقاڵیان دەکەن تـــا لـــە چەنگاڵەکانیان نزیک نابنەوە. ماندوون لە دۆخەکە، کە ژیانیان ئاڵۆز کردوە. بـــەڵام چاوەڕوانـــن، لە قوڵاب و داوێکیان بۆ راوەماســـی ناردوتە خوارەوە، چەوری و روون و گۆشتیان دەستکەوێت!

ئـــەو نایـــەوێ و پەلە نـــاکات بچێتە دیار منارەکەی گەلاتا، بە پایە باریک و تەســـکە

بەردەکانی سـەربکەوێتە سـەرەوەی، لەوێ لە بەرزاییەوە سـەیری شـارەکە بکات. لەجیاتـی ئـەوە دەیـەوێ بەیانـی زوو بچێتە نـاو ئەرشـیفەکە، لـەوێ مێژووەکەی بدۆزێتەوە، نایەوێ لەوێ سـەیری بسفۆر بکات؛
چۆن دوو دەریاکە، مەڕمەڕە بە دەریای رەش، لە مەڕمەڕەوە، بە گەرووی دردنیلشەوە بە دەریا ئیجەش دەبەستێتەوە.
ئـای کـە جوانـە! دەریاش بەیەکتـری دەبەسـترێنەوە. ئاویـش زنجیرە، پشـدێنە، ملوانکەیە، ئاو درێژترین رەشـبەڵەک و هاوشـانییە. ئاو دەریا دروست دەکات! دەریا تەنیـا بـە دڵۆپەی ئـاو نەبێت، نابێتە ئـەو رووبـەرە بەرینە، ئەو ئاسـۆیە دوورە! ئاسـمان چەند گەنجینەی هەڵگرتووە، داپۆشـیوە و رەنگین کـردوە. ئاو هەزار جار زۆرتر گەنجینەی شـاردۆتەوە و رەنگینی کردون و بە قەوزە لوولی داون! ئاو ئەگەر بەیەکەوە نەبەسـترێنەوە و ئاوێزان نەبن، وشـک دەبن. بە بەسـتانەوە و هاوشـانی ئاو دەمینێت! ئەگەرنا ئەوانیش، دەریاکانیش دەبن؛ بە بەرد و شـاخ و سـەحراش. لەوێشەوە ئاوەکە، ماسییەکان، شەوە ساردەکان، درەوشانەوەی ئەستێرەکان لەگەڵ وردە دوورگەکان، ملیۆنەها دار زەیتونی دەوەنی دڕکاوی، دەگاتە ناو دەریای سـپی ناوەڕاست!
ئـەو جـارە و دواییـش هـەر نەچووە ناو تـاوەری پاکیـزە «کز کولیسـی» ئەوەی پاشـایەک، ئینجا دیار نییە کام لە پاشـاکان. لەبەر کیژەکەی، لەبەر ناز و ترسـی و دوورخستنەوەی لە مردن و بردن، دایناوە و بەرزی راگرتووە و بووە بە چاوی شارەکە! ئـەوەی دەزانرێـت ئەو بورجەی لەنـاو ئاوەکە دانراوە، دروسـتکراوە، زۆر کۆنە، بە کۆنیش سـەربردەیان بۆ هەڵبەستاوە. هەمووش نیشـانە و چیرۆکی خۆشەویستییە، بەڵام لە بورجەکەوە شاهیدی شەڕ و کاروانی تالان و سوتان و کوشتنی زۆر بینراوە! بورجی لیندر یان بەناوی زۆری تریش ناسراوە، ماسییەکی سەرکەشە، لەناو ئاوەکە، بەبێ ئەوەی مەلەوانیش بێت، ماوە و بۆتە قیبلەی چاوی شـەیدا و دڵی سـووتاو!
ئەسـتنبۆل بۆ ئورهان پامۆک شـاری بیرەوەرییەکان و یاداشـتی شیرین بووە. بۆیە هەموو تەمەنی، هەموو دێرەکانی رۆمانەکانی بۆ ئەو شارە نووسیوە و تەواو نەبووە. ئەو شـارە گەورەیـەی رووداوی زۆری دیوە. گۆڕینی مـەزن و بەرچاوی، لە مێژووی مـرۆڤ و جوگرافیـا و ئایین و نووسـین و هەمـوو کایەکانی تر کـردوە. ئەو هەموو ئەوانەی نووسیوەتەوە، بەڵام بەکورتی، ورد و زانستییانە. گەڕاوەتەوە ناو بیرەوەرییە

کۆنەکان، خەمەکانی جاران گەورە بوون. رۆژگارەکەی تەنیا چەند نووسەرێک لە لاپەڕەی رۆژنامەکان دەینووسن، ئەو دەیاندۆزێتەوە و رامانی لەسەریان دەربڕیوە، سەرکەشانە گوتوویەتی:
بسفۆریش رۆحی شارەکەیە. هێز و مان و بەرگری پێ دەبەخشی.
پامۆک دەزانێت! تۆش هاتوویت لەو شارە، بچیتە ناو ئەرشیفی عوسمانییەکان تا مێژووی شارەکەی خۆتی تێدا بدۆزیتەوە!

***

ئەو بەیانییەکەی لە مەیدانێکی گەورە، لە شەقامێکی زۆر جەنجاڵی شارەکە، سواری پاسی ژمارە ٤١ دەبێت، بەرەو ئەرشیفی عوسمانی بەڕێدەکەوێت. ئەو کێشەی نییە، زمانەکەی لە هەموو تورکەکانی ناو پاسەکەش، ناو مەیدانەکە باشترە! «ئەو شارە گەورەیە، هەموو رەگەز و زمان و نەتەوەیەکی تێکەوتووە، شاری گەورە وایە» بەڵام بەپەلەیە، دەیەوێ زوو بگاتە ناو ئەرشیفەکە، لەناو پاسەکە و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەش دەکات. بەڵام بیری لەسەر هیچ نییە. چاوی بڕیوەتە سەر شەقام و پارک و ئاوەدانییەکەش. بەڵام زۆر هوشیار نییە و هیچ نابینێت. لە جەنجاڵی ئەو شارە گەورەیەدا، نە کەس دەناسێت، نە دەیەوێ کەسیش بیناسێت. ئەو هاتووە بەدوای ئەوانەی لەمێژە نەماون و دابڕاون، ئەوان بدۆزێتەوە!
کاتەکە زووە، ئەویش زوو دەگاتە بەر دەروازەی مەڵبەندەکەی هەموو مێژووی عوسمانییەکانی تێدا پارێزراوە. دۆکومێنتەکانی بوون؛ بە فیلم و دۆسیە و ئەرشیفێکی گەورە. سەرکەشانە، بە تورکییەکی جوان، قسە دەکات و خۆی بە پێشوازییەکە، ئەفەندییەکەی دەستە جلێکی رەشی لەبەرە، قژە رەشە زۆرەکەی بۆ سەرەوەی هەڵداوەتەوە، دەناسێنێت. ئەوەی لە پەنا مێزێکی بەرز و بەرامبەر کۆمپیوتەرە گەورەکە دانیشتوە. لە ئاکار و جلوبەرگی ئاشتی رادەمینێت، بۆیە بە زمانی ئینگلیزی قسە ناکات، یەکسەر بە تورکی دەیدوێنێت.
ئەو دەچێتە ناو مەڵبەندەکە. لەناو سالۆنە سەرەکییەکەی پێشوازییەکە پاسپۆرتەکەی نیشان دەدات. ئەوان سەیری دەکەن، ناسنامەیەکی کاتی بۆ دەکەن، بەڵام بەر لەوەی بزانن کیژەکە عێراقییە، کوردە و هاتووە دەیەوێ کوردستان لەو

باڵەخانەیە بدۆزێتەوە! بەر لەوەی بزانن ماستەری لە تورکیا خوێندوە، شارەزای زمانی عوسمانییە، رێزی دەگرن و بەسۆز و گەرم بەخێرهاتنی دەکەن.
ئەوان، بەڕاستی وا دەزانن، ئەو کیژێکی یۆنانییە. ببوورن زوو دەزانن یۆنانی نییە و نەهاتووە توێژینەوەیەک لەسەر شاری سالۆنیکی یۆنان بنووسێت. نەهاتووە بزانێت کشتوکاڵ زووتر لە سەردەمی عوسمانییەکان لە دوورگەی کریت و دوورگەکانی تری یۆنان چۆن بووە! لە رەنگ و سیما و جلوبەرگ و سەرپۆشەکەی دەزانن کیژەکە ئیتاڵیش نییە، نەهاتووە دکتۆرا لەسەر کاریگەری هونەری ئیتاڵی بەسەر نەخش و هونەر و نووسین و بیناسازی عوسمانییەکان بکات. دروست و ئاسان دەزانن ئەو هاتووە ئیشی بە دۆسیەیەکی جیهانی ئیسلامی هەیە. ئەو کیژە موحەجەبەیە ئاکاری خۆرهەڵاتییە، شەرمن نییە، خۆی پێچاوە بەڵام ئاوەدان و کراوەیە.
ئەو نەهاتووە سەربردەی چەتەکان بنووسێتەوە. چۆن بە پاپۆڕەکان چوونەتە سەر کەنارەکانی ئەوروپا و چەتەیی و راوڕووتیان کردوە، دەسەڵاتداران چەند دژایەتییان کردوە، دوایی خۆیان و کڵێسا و سوپاکانیان کرنۆش دەبەن و زەلیل دەژین! زووتر کوڕێکی باڵابەرزی رەنگ گەنمی، سادە و شارەزای مێژووی خۆرهەڵات، پەریشان بەدوای ئەو بابەتە لەناو ئەرشیفەکە دەگەڕێت، بە دوو زمان، ئینگلیزییەکەی لە فەرەنسییەکەی باشتر بووە، لە دوورەوە هاتبوو! ئەو لەو بابەتە دەکۆڵێتەوە، وەک چەتەیەکی سەدەی بیست و یەک هاتووە مێژووی چەتەگەرایی سەر شار و وڵاتانی ئەو بەر، لە سەدەکانی کۆن بنووسێتەوە.
یەکێکی تر، کوڕێکی قژ زەرد دیارە ئەوروپییە، رەنگە ئەڵمانی یان نەرویژیش بێت، هاتووە ئەو سەربردەیە، راستییەکانی ئەو حیکایەتە بزانیت، هاتووە و زووتر زمانی تورکی فێر بووە، نووسینی عوسمانی شارەزا بووە. دەیەوێ هەشت مانگ لەو شارە بمینێتەوە، رۆژانە لەگەڵ دەوامی رەسمی ئەرشیفەکە لەوێ بێت. سەیری زۆرترین بەڵگەنامە و دادگایی و نووسین و لاپەڕەی دەفتەرەکان بکات! بەڵام پێیان ناڵێت چیم دەوێت، قسە ناکات، نەرم نەرم دۆکومێنتەکان پۆلین دەکات و داوایان دەکات!

***

ئەو کیژە لە هەولێرەوە دەچێتە ئەو بارەگایەی کە گەورەترین ئەرشیفی جیهانی

تێدایە، مێژووی سەدان ساڵەی چەندان میللەت و نەتەوە و زمان و ئایین و ئایینزا و کەلتوورەکانی تێدایە!

کە دەبینن کیژەکە موحەجەبەیە، شەرمنە، بەتەنیایە، سادەیە، وا دەزانن کیژێکی کوێتییە، هاتووە بەدوای چەند لاپەڕەیەکی سنوور و دەسەڵات و ئاو و بیابانی نێوان وڵاتەکەی و شاری بەسرا و تیر و شیر و شەڕی ئەمیرەکانی ئەمارەتەکەیان عەودالە! بەڵام دوایی، کە دەڕواتەوە دەزانن، ئەو کیژە بە دوا مۆدیلی ئۆتۆمبێل و پاسەوان و جلی دوا مۆدە نەهاتبوو. دەزانن کوێتی نەبوو، لە زانکۆیەکی کوێتەوە نەهاتووە، شوفێر و پاسەوان و جانتای گرانبەهای لە دەست نەبوو، دەزانن کوێتی نییە، ئەو نەهاتووە سنوورەکە بدۆزێتەوە. یەک سنوور لەو بیابانە، لەو سەر کەنارە، یەک مەتر لەو خاکە، یەک لیتر لەو لمە گەرمە بۆ وڵاتێکی وەک کوێت زۆرە! هاتووە بیکێشێت و بیپێوێت و بینووسێت و بیسەلمێنێت.

کیژە کوێتییەکە، چەند رۆژە هاتووە، لە هوتێلە گەورەکان دابەزیوە. جارێ لەناو بازاڕەکان سەیری مۆدەکان دەکات. لەسەر کەنارەکان وێنەی زۆر دەگرێت. دوو هەفتەیە لەو شارەیە و دوور دەکەوێتەوە، دەچێتە دوورگەکان، شارە زۆر ئارام و هێمنەکان بەسەر دەکاتەوە! بواری ماوە، پارەی زۆرە، لەسەر ئەوەی گلەیی لە زەیتونی بەیانی و خراپی قاوە و چاکەیان هەبووە، دوو هوتێلی گۆڕیوە. جانتاکەی بۆ هەڵدەگرن و دەڕوات و سنوورەکەی دەگوازێتەوە! ئەو لەو هوتێلە دەڕوات و گوتوویەتی ڤیوی ژوورەکەم، باش و روون و زۆریش دەریای لێوە دیار نییە. هیچ نابینم و پاپۆڕەکان لە دوورەوە نابینم، کە دەگەنە ناو بەنداوەکە. دەڕوات و دەڵێت: نەورەسەکانی سەر منارە و ستارە بەرزە روخاوەکان قیرەقیرپیان زۆرە. ئەوانە جوان نین، باڵیان بچووکە، دەنووکیان تیژە و شەو ناخەون. ئەوانە سەرکەش هەموو سنوور و ئاسۆکانیان لەبەر باڵ و ئاراستەکەیان کراوەیە، ئینجا نافڕن! دوور ناکەونەوە و بەر پەنجەرە بەرینەکەم بەرنادەن، دەمەوێ تەنیا بم، کەس لە سنوورم نزیک نەکەوێتەوە، ئێمە لەگەڵ سنوورا هەستیارین، ترساوین، زۆریش ترساوین! دەڕوات و گلەییان هەیە و دەڵێت:

تاکسییەکان بەئاسانی کۆڵانەکە نادۆزنەوە. خۆشم ناوەکانم پێ لەبەر ناکرێت! لەو

هوتێلـە دەگوازێتـەوە و دەڕوات! کیژەکـەی لەکوێتـەوە دەچێت و دەیـەوێ بزانێت سـنوورەکان چۆن لەناو ئەرشیفە کۆنەکان کێشراوە! سەیری هێڵە سوورەکان، هێڵە رەشـەکان دەکات، نـاوەکان دەخوێنێتەوە! بەڵام زمانی تورکی نازانێت، رێنووسـی عوسـمانی شـارەزا نییە! هاتووە هەموو ئەوانە بە پارە بکات! کوڕێک یان پیاوێکی بـە تەمەنی تورکی عەرەبیزان دەدۆزێتەوە، بەختی کیژە دەوڵەمەندە کوێتییەکە زۆر باشە، لەورۆژانە زۆر لە سورییەکانی ناو تورکیا، ئەوانەی پاش بەهارە عەرەبییەکەی سـوریا، کـە دەبێتە زسـتان و سـەرماکەی هەراسـانیان دەکات. بەهارەکـە دەبێتە پایـز و گەڵارێـزان و باهۆزەکـەی پەخشـانیان دەکات، لـە هەموو گۆشـەیەکی ئەو جیهانـە بڵاودەبنـەوە، سـەرگەردان، هەمـوو جۆرە پیشـەیەک بۆ ژیان و سـێبەر و پۆشـتەیی دەکەن، ژمارەیەک لە هونەرمەند و شـوێنەوارناس و پسپۆری زمانی کۆن و ئەرشـیفیان، دەگەنە نزیک باڵەخانەکە، ناو ئەرشـیفەکان، وەرگێڕان و نووسینەوە و یارمەتی و ئاسـانکاری دروسـت، بە پارەی کەم و بەپەلەش دەکەن!

❊❊❊

بەڵام کە دەزانن، ئاشـتی رەحمان بە پاسـێکی لۆکالی هێڵەکانی ئەستنبۆل دوودڵ و کەمێکیش ترسـاو، لەبەر دەروازە گەورەکەی ئەرشـیف عوسمانسی دابەزیوە. دڵنیا دەبن کیژەکە کوێتی نییە، بۆ ئەوە نەهاتووە سـنوورەکان باشـتر دیار بکات، زۆرتر پتەوی بکات، خەرەند و دیواربەندی ئەو ئەرشـیفە کۆنەی پێوە بلکێنێت و توندتری بکات!

بەڵام ئەو زمانە تورکییەکە چاک دەزانێت، زاراوەکەی تورکی تەواوە، دەزانن کوێتی نییە، لەلایەن ئەمیرەکانی کوێت و زانکۆکانیانەوە نەهاتووە. یان دەزانن ئەو کیژەی تـەواو موحەجەبەیـە، حیجابە رەنگین و نەرمەکەی توند بەسـتاوە، دوو سـێ داوی رووی هەڵگرتووە، تۆزێک مکیاژیشی کردوە، جلەکانی سادە، جانتاکەی دەستی زۆر ئاسـاییە، کوێتی نییە، فێرخوازە و ئەزموونیشی هەیە.

ئەو خوێندکارێکی سەرکێشـی ئەمریکی نییە. بە چەند مانگێک تورکی و نووسـینی عوسـمانی فێـر بووبێت. ئـەو کوڕە باڵابەرزە رەشـتاڵەش نییە، ئـەوەی دوور نییە بەڕەچەڵـەک یۆنانـی یان خەڵکـی وڵاتانی بەلقانیـش بێت، هاتووە دەیـەوێ لەناو

ئەرشـیفی عوسـمانییەکان ئیـش بـکات، تـا زۆرتریـن لاپـەڕەی شـاراوە و گرنگی ناوچەکەیان بدۆزێتەوە!
ئـەو فێرخوازێـک نییە هاتـووە و دەیەوێ توێژینەوەیەک لەسـەر کاریگەری دەرمانە میللییەکان بکات. چۆن دکتۆرەکانی گیاوگوڵ و سڕکردن و پزیشکە نەخوێندەوارەکان، چارەسـەری پەتا و نەخۆشییەکانیان لە سەدەکانی هەژدە و نۆزدەم کردوە!
ئەو نەهاتووە، لە دوکانێکی ناو کۆڵانێکی باریکی شارەکە ــهەموو کۆڵانەکانی شارە کۆنەکە باریکنـ چەپکێک گوڵ بۆ دیاری بکڕیت، یان دوو کیلۆ چەرەزات و پاقلاوەی تورکـی بـۆ شـیرینی و خۆشـیرینکردن بکڕیت. ئـەو هاتووە ئیش بـکات، دەزانێت دۆزینــەوەی بابــەت و ناو و مێژوو لەناو ئەرشـیفەکەی عوسـمانی زێـڕ هەڵکۆڵینە. ئیشـکردنە لەناو قوڵایـی دەریاکان. ئەوانەی دوێنێ شـاردرانەوە، ئەوەی ون بوون، بیدۆزێتەوە! دووبارە بە نووسـینی سەردەم بینووسێتەوە.
کیژەکـە دەچێتــە ناو چــی؟ بەڵگەکان، ئەرشـیفەکە، نامەکان. دەفتــەرە کۆنەکان، ئەوانەی تۆزی زەمانیان لەسـەر کەوتووە، خوراون، گەچراون، دزراون، شەرمەزارن! پاش سـەرکەوتن و دامەزراندنی دەوڵەتی تورکیا، چەند سـاڵیش مقۆمقۆ و ململانێ گەرم بووە، لەسەر ئەوەی دۆکومێنتەکان بفەوتێنن، بفرۆشرێن، بسوتێنن و زۆریشیان سـوتان، زۆریان بە ئاو و رووبارەکانا دادا. ئاو لە هەموو شـتیک بۆ مردن و خنکان و ئاسانترە. یان دۆکومێنتەکان بپارێزێن، ئەوانەی رەوانەی وڵاتی بولگاریا کرابوون، یان روونتر بڵێین فرۆشـرابوون بکڕنەوە، بێنەوە تورکیا.

***

کیژەکە دەچێتە ژوورەوە، ئاسـان و باش لە سیسـتەمەکە تێدەگات، پێیان دەڵێت: مـن هاتــووم دەمەوێ مێژوویـک لەناو ئەرشـیفەکان بدۆزمەوە. مێـژووی میللەتێک، وڵاتێکـی گـەورە، شـارێکی دێرینــی ویلایەتەکانــی شـارەزوور و موسـڵ و بەغدا و حەلەبیـش، هاتووم ئەرکێکی قورسـم لەسەرشـانە! بەتەنیام بـۆ خۆم ئیش دەکەم، بـۆ خۆم هاتــووم، خەریکم رێگایەک لـەو هەورە رەنگ بکەم، بدۆزمــەوە. کارەکانی ماستەرەکەی خۆم تەواو بکەم، دوایی بگەڕێمەوە. دووبارە گەرم و زۆرتر و شارەزاتر بێمــەوە نـاو لاپەڕەکانی چەندان سـاڵە، بـە دەرمان و فلچە و لێزانین و شـارەزایی

پارێزگاریان لێ کراوە یان نەکراوە.
ئـەو زۆریش خەم لەوە ناخوات ئەوانەی لە رۆژگارەکـە، لەناو ململانێیەکان فەوتان. بەر لە روخانی عوسـمانییەکانیش، زووتر لە ململانێیەکانی نێوان سـوڵتانەکان، کوڕ و نـەوە و ئامۆزاکانیان، لەگەڵ سـوتانی مزگەوت و کۆشـک و هەوارەکانیان زۆریان سـوتان. ئەرشـیفی زۆریان بە دەستی خۆیان دەنووسران و دەسووتێنران. ئەوانەیان دەنارد و دەیاندزییەوە و دەیانفەوتاندن. زۆریان دەدایە دەست تەتەرەکانیان و دوایی دوو تیـری ژەهـراوی، چەتەیەکی بێ رەحمی جەلاد، دوو پاسـەوانی بێ رەچەڵەک و زۆڵ تەتەرەکەیـان کوشـتوە و نامەکەیان خوێندیتەوە، یـان نەیانزانیوە بیخوێنەوە. لەسەر نامە و نووسینەکە کابرا دەکوژن، پیاوەکەی نامە و پەیام و فەرمانێکی پێیە، دەکوژن و نامە و پلان و داواکەش دەسووتێنن! هەزارەها نامە و بەرنامە و نووسراوی ئـەو ئیمپراتۆریەتییـە بـەو جۆرە فەوتاوە. بە ناسـین و خوێندنـەوەی نامەکانیش، لەلایەن کەسـانی دووەم کارەسـات و تۆڵەکردنەوە و کوشـتار و یاخیبوونی زۆریش رووی داوە.

❋❋❋

ئەو کە یەکەم کلیک لەسەر ناوی ئەربیل دەکات، یەکسەر هەزار و هەشت سەد بەڵگە لەناو ئەرشـیفەکە دەردەچێت. ناوی شـارەکە لەوەندە نووسـینە، لەوەندە لاپەڕەیە هەبـووە، باسـکراوە، ناوی هاتووە. لە نامە و راسـپاردەکان والـی ویلایەتی دوور و نزیکـی پێ دانراوە، قائیمقامی پێ گواسـتراوەتەوە. مامۆسـتایەکی لـە قوتابخانەی سـبیان و مەدرسـەی روشدیەی عەسـکەری بەو فەرمانە دانراوە، لابردراوە، موچەی زیادکراوە، مردنی یەکێک و وەرگرتنی خانەنشینی و چاککردنەوەی خانەقایەک، شەر و ململانێی عەشـیرەتەکان و یاخیبوونی چەند عەشـیرەتی تـری تێدا بووە! کیژەکە جـوان و باش نامەکان، خەتە کۆنەکە، زمانـە کۆنەکە دەخوێنێتەوە، بە دۆزینەوەی هـەر دۆکومێنتێک شـادمان، بەڵام دەبێ پارە بدات. خۆشـحاڵ بـەڵام زۆر ماندووە. ئەو ئەوەی دەوێ، بۆ ئەوەش بەپەلە و سـەرکەش هاتووە، بەڵام ئیشـی زۆر دەوێت و ماندووش دەبێت.
ئەو کە بەروارەکە دەکاتە دوو سەد ساڵ، ئیتر ژمارەی دۆکومێنتەکان کەم دەبنەوە،

دەبن بە پێنج سەد دانە. دیارە پارەی کڕین و هێنانی پێنج سەد دانەش بۆ قوتابییەکی ماستەر زۆرە. بەڵام ناکرێ دەستبەرداریان بێت! ناکرێ قوتابییەک لە زانکۆیەکی تورکیا ماستەر لەسەر مێژووی هەولێر بکات و هەموو دەقەکان، هەموو نامە و راسپاردە و زانیارییەکانی ئەو شارە پەیدا نەکات! لێرە چاوپۆشین نییە، هەموو جۆرە ئاسانکارییەک مەعقوڵ نییە! لەجیاتی بە تاکسییەک ئاسان و ئاسوودە بگەڕێتەوە هوتێلەکە، دۆکومێنتەکان دەکرێت. لەجیاتی دوو دەستە جلی دەرەوە لەناو قەیسەرە رووناکە زۆر جەنجاڵەکە بکڕێت، دیاری بۆ دایکی، بۆ منداڵە خوشکەکانی بۆ دەستەخوشکەکەی، ئەو فەرمانبەری زۆر ئاسانکاری لە خۆیەتی و ژمێریاری بۆ دەکات، بیر لەوانە ناکاتەوە، بیریش ناکاتەوە، هوتێلەکەی بگۆڕێت، یان بە فڕۆکە لە ئەستنبۆل بگەڕێتەوە. ئەو بە پاسە گەورەکان دەگەڕێتەوە، کە بەدرێژایی رێگا دوورەکە، قاچەکانی ژان دەکەن و پشتی دەبروسکێنێت! بەڵام زۆرترین دۆکومێنتی تایبەت بە شاری هەولێر ـ ئەربیل ـ دەکڕێت.

# گۆڕستانی جووان

**٧ مارت ١٣٣٠**

**بۆ نەزارەتی ناوخۆی دەرسەعادەت**

ئێمــە لە قەســەبەی هەولێر لەگــەڵ ئەوەی لە میللەتی بە توانای موســەویین کەچی لەلایــەن حکومەتەوە دەیانەوێت لەســەر گۆڕســتانەکەمان مەکتەبێکی دواناوەندی و تەلەگرافخانەیــەک دروســت بکەن، بارودۆخی ئێمە ئەوەیە ئەو گۆڕســتانە بەگشــتی بــۆ ئێمــە تەرخانکراوە، ئەمەش نابێت وەک رێگا و کێڵگەکان ببەســترێتەوە بە تاپۆ و لەســەر جێبەجێکردنی نیزام، لە بیرۆکەی ئەوەدان گۆڕســتانی ناوبراوی ئێمە، بە تاپۆ ببەســتنەوە، ئەوەی هەقی ئێمەیە ئەگەر ئەم کارە جێبەجێ بکرێت زوڵمان لێ دەکرێت، لەو ســەرپێچییە تکایە دادوەری پەیڕەو بکرێت.

**عەبدوڵا/ هاوڵاتی عوســمانی بەناوی میللەتی موسەوی.**

***

لەگــەڵ داوا و دەرچوونــی نیمچــە بڕیارێکی حکومــەت، بۆ دروســتکردنی قوتابخانە و تەلەگرافخانەیــەک، جووەکانی ناو شــارەکە، ژمارەیــان کەمیش نەبوو، زۆر بوون؛ دوکاندار، ســەنعەتکار و مامۆســتا و بازرگانەکانیان، پیاو و ژنەکانیشیان کۆک بوون لەســەر ئــەوەی نامەیەک بۆ کاربەدەســتانی ئەســتانە بەرز بکەنــەوە، داوا بکەن و قبــوڵ نەکــەن گۆڕســتانەکەیان بکرێتە قوتابخانەیەکی دواناوەنــدی. ئەوان لە داوا و بانگەوازەکەیان دەڵێن:

چۆن لەســەر مەزار و راز و ئێســقان و کەللەسەری مرۆڤەکانمان، بە بەردی رەق، بە

کوتانی چەکوچ و باری گرانی دیوار و خۆڵەبان و حەوشە دوو بینایەی گەورە و زۆر گرانیش دروســت بکرێت. مرۆڤی مردوو، پیرۆز و یادی شانازە.
جووەکان نامەکە دەنووســن، بەڵام نامەکەیان بە نەرمی، بە شــێوازێکی شارســتان دەنووسن. بابەتەکە ترسناک بوو، دۆخی سیاسی ئەستانەش باش نەبوو، عوسمانییەکان لە هەموو ناوچەکانی دەســەڵات و سوپایان هەبوو، شەڕ و ململانێی دژواریان لەسەر بــوو، دەشــکان، ناوچەی زۆریان چۆڵ دەکرد و ســوپاکانیان دەڕەوینەوە! شــاریش ئاڵۆز بوو، ســەفەربەلەک و پارەکۆکردنەوە بــۆ قەیرانەکان بەردەوام بووە. ئەوانیش لەودەمانــە داوا دەکەن، گۆڕســتانێک لە ناوەندی شــارەکە نەکرێتــە قوتابخانە. لەو دۆخەدا، نەک وەڵامی داواکەیان جێبەجێ ناکەن، وەڵامیشــیان نادەنەوە، یان رەنگە نامەکــەش نەگاتە بەرپرســان، بەڵام دیــارە نامەکە گەیشــتووە و خوێندراوەتەوە و دەســتی زۆری پێکراوە، بۆیە جوان لەناو گەنجینەکاندا ماوە و پارێزراوە.
جــووەکان کۆدەبنــەوە. لەو کۆبوونــەوە گەرمەدا حاخامەکــە، داوا دەکات ئارام بن، کەســیان لە بەرژەوەندی و ویســتی بابەتەکە دەرنەچن، ئاراســتەی داواکە نەگۆڕن.
پێیان دەڵێت: ئێمە چەندانساڵ و باب و باپیرانمان لەو شارە ژیاون، لە گوندەکان، لەســەر ســنوورەکانی ئێرانیش، دەنگمان دەرنەچووە، کێشــەمان نەبووە. ئەوەی لە دەستمان دێت دەتوانین داوایەک بنووسین، تکایەک بکەین، دەچینە خزمەت قائیمقام، بــە شــێخەکان دەڵێــن. من هەموویان دەناســم و پەیوەندییمان خۆشــە. ســەردانی ئەفەندییەکان دەکەین، بەگ و موختارەکان دەبینین. بە کۆمەڵ و بەرێزەوە دەچینە خزمەت ئاغاکانی دەشــتی دزەیی، ناو عەشــیرەتەکانی ســورچییەکان، هەرکییەکان، پێیان دەڵێن:
ئەوانــە دەیانــەوێ بەو بیانــووە، گۆڕەکانمــان بســڕنەوە، نــاو و یادەوەرییەکانمان هەڵتەکێنن! کەس نییە نەزانێت، هەموومان هەســتمان بەوە کردوە، گۆڕســتانەکانی ناوچەکە، نامانەوێ بڵێن گۆڕســتانی موســڵمانەکان ــنەوەک بــە دیدێکی نەژادی و ئایینی حیســابمان بۆ بکەن ئاوەدانە، شــەوانە رووناکە، مەلائیکەت و رووناکی چاوی پیاوچاکان، دڵسۆزەکان تێدا دەدرەوشێتەوە!
لە گۆڕستانی ناو گوندێکی دووری ناو تەم و خنکاوی ناو گەرووی شاخا، کەس، هیچ تەورێ، ئاگری بروســکیش دارێکــی نەبڕیوەتەوە. بەئەنقەســت لقێکیان بۆ جۆلانەی منداڵێکی گریاوی ناســکیش نەشــکاندوە. ئەگەر لە وەرزی شــەختە و زریانا سەرما

بیانتەزێنێـت دارێکی وشـکی ناسـوتێنن، قەد و لقـی دارێک بۆ ئاگـردان نابڕنەوە. داری ئـەو گۆڕسـتانانە ناکەنـە ڕەژوو. قـەدی دار و کۆتـەرە گەورەکانیش، ناکەنە لانک و گۆچانی دەسـتی لەرزۆک و پشـتی چەماوە و چاوی کەم بیناش! گۆڕسـتان هەواری کەسـە بێ دەسـەڵاتەکانە. کەسـی بە دەسـەڵات ناچێتە سـەر مردووەکان. ئەوانـەی نەخۆشـن، کەنەفتەن و ژان دەیانکوژێـت. ئەوانەی چاویان لە ژیان و گوند و کانـی و ئاسـمان بـوو، دەمرن! منداڵەکانـی نازانن دەرمـان و هەتوانیان بکەن و دەمرن، ژنەکانی پەرۆش بوون تا دەمرن؛ خەنەیان لێ نەبڕیت، کلیان تەواو نەبێت، مێخەکیـان بۆنـدار بمینێتەوە! نەوەکانیان پێ بگـرن! ئێرە، هەواری پیرۆزی ئەوانە. گوناحە ئەو هەوارە شـیرینە بسـڕێتەوە! ئەو یادگارە تاڵ و شیرینە هەڵگیرێت.

***

ئەفەندییەکـی وردیلـەی مـوو نەرمـی پەنجـە باریک، چـاوە قاوەییەکانـی گەش و خوێندەوار، لە حاخامەکەی چاویلکەیەکی شووشە ئەستووری چوارچێوە مسی وردی لە چاو دایە، نەرم نەرم و بە خشـەخش دێتە پێشـەوە، دەگاتە بەر سـێبەری ریشە سپییە درێژەکەی، زۆر باش هەست بە هەناسە و جۆشی پەیڤینەکەی دەکات و پێی دەڵێت:

دونیا گەورەیە، وڵاتی زۆر بوونیان هەیە، جوو لە هەموو دونیا پەخشـانن. ژمارەیان زۆرە. ئێمە بوارمان نەبووە، بگەڕێن، لەبەر کاسبی و منداڵەکانمان نەکراوە و بۆمان نەبـووە، زۆر دوور بڕۆیـن. ئـەوەی دوور بـڕوات، بەداخەوە تەمـەن و چاو و قاچ و سامانەکەشـی بواری نادات بگەڕێتەوە. بەڵام من چوومەتە بەغدا، لەوێ گۆڕسـتانی جـووان ماوە. دەوڵەمەندەکانی بەغدا بەردەوام و دڵسـۆزانە خزمەتی دەکەن. لەوێ بیسـتوومە، لەناو قاهیرە گەورەترین گۆڕستانی جووان ماوە و هەیە!

پێیان بڵێن: میسـرییەکان، موسـڵمانەکانی ناو قاهیرە. بە گۆڕستانی جووەکانی ناو باخچەکان دەڵێن «تربەی جووەکان». شـانازی بەو شـوێنەوارە دەکەن و ماوەیەکی زۆرە لەنـاو جەرگەی ئاوەدانییەکی گەورە ماوەتەوە!

یەکێکـی تـر، زۆر دوور لە حاخامەکە دانەنیشـتووە، جلی کوردی لەبەرە، پشـدێنە ئەسـتوورەکەی، ناوقـەدە باریکەکـەی کـردوە بـە قامیشـێکی باریک، شـادمان و بەجۆشـەوە رۆژانە، بۆ کاسـبی و بەرهەم و داهاتی زۆرتر دەیژەنێت. ئەو دەڵێت:

ڕاستە لەوێ ماوە و گەورەیە، بەڵام زۆرتر لەبەر ئەوەی مەزاری موسی میمونی تێدایە!

«حاخامەکـە ئەو زانیارییەی دەزانی، کە قسـەکەی لەسـەر زاری ئەو دەبیسـتێت، سەرسـامە، بە ئیرەیی و حەپەسـاو سـەیری دەکات. ئەو چۆن ئەوە دەزانێت. ئەو لەناو چوارگۆشـەیەکی دوکانەکەی، پیشـەکەی دوور نەکەوتووتەوە، ئەوە لە کێ فێر بووە و کێ بۆی باسکردوە».

ـ «یەکێک لە ئامادەبووان، بازرگانە و زۆریش ئیشی گەنم و دانەوێڵە دەکات و سێ دوکانی لەنزیک حەسارەکانی بەرامبەر گەڕەکی تەعجیل، نزیک لە مزگەوتەکە هەیە» ئەو ناوەم بیسـتووە، بەڵام نەمدەزانی میسرییە، وامدەزانی خەڵکی شام بووە! بەڵام بەدڵنیایـی دەمزانی جوو بووە، زۆر ناوی لە مێژوودا هەبووە.

ـ «پیاوەکەی قسەکە دەکات، رەنگە دوایی کوڕی ئەو، یان یەکێک لە نەوەکانی بووە بە شێوەکاری دیاری شارەکە، ئەو رەنگ و خامە و تابلۆی لەو شارە داناوە» چۆنت بیسـتووە! لەکوێت خوێندۆتەوە، لەکام کتێب و بە چ زمانێک ئەوەت بیسـتووە؟

ـ «کابـرا دڵنیابـوو، دەیزانـی چ دەڵێـت، بـڕوای بـەوەش هەبـوو، ئامادەبووان و حاخامەکەش بڕوا بە قسـەکانی دەکەن» ئەو دکتۆری تایبەتی سـەلاحەدینی ئەیوبی بـووە! موسـڵمانەکان زۆر نـاوی دەهێنـن، لە کاتی پێویسـت ناوی دەبـەن، کارتە بەکاریدەهێنن!

***

لەوێ، لە شـارەکانی وەک ئەسـکەندەریە، خەرتوم، جەزائیر هەموویان شانازی بەوە دەکەن، لە جەرگەی شارەکانیان، بازاڕە ئاوەدانەکانیان شوێنەوار و بیرەوەری کۆنی جـووەکان ــگۆڕستانەکانـ ماون، پارێزراون، پاک و شـاناز راگیـراون. بەردەوامیش ئەسـتێرە شـەش تیشـکەکە، داودییەکە نـوێ دەکەنـەوە، نووسـینەکان، ناوەکان دەنووسنەوە، شورەیان بۆ کردوە.

دیارە نۆژەنکردنەوەکان بە پارەی رێکخراوەکانی جووان و سـەرمایەدارەکانیان بووە. ئەوانـەی لەو وڵاتە، یان لە هەندەران ژیاون. پارەیان بۆ نۆژەنکردنەوە و پاراسـتنی کۆنە گۆڕستانەکانیان ناردوە. بە کۆنتاکت و پەیوەندییە مرۆییەکانەوە ئەو پڕۆسەیە دەکەن. خۆشـیان لەوێ دووریش بن و دەسـتیان نەگاتە وڵاتەکـە، نۆژەنکردنەوەکە هەر دەکەن.

حاخامەکـە ناوی عەبدوڵا بوو. بەناوی هەموو جووەکانی هەولێر داوا دەکات سـنوور و رووبەر و کێل و ئەسـتێرە داودییەکانی سـەر گۆڕەکانیان لەناو شـارەکە بمینێت.

ئەو باش دەیزانی لەناو جەرگەی شاری پراگ، پایتەختی چیک، شارەکەی کافکا، نووسەرە جووەکە داماوەکەی ناو پراگ و ناو جەرگەی شارەکە، ئەوەی ڤێگەتاری بوو، گۆشتی نەدەخوارد و دەیگوت:
ژیان و گوزەران و بە سەربردن بۆ کەسانی وەک منی ڤێگەتاری ئاسانە، چونکە ئێمە بە گۆشتی جەستەمان تێر دەخۆین! گۆڕستانی کۆنی جووەکان لە شارە ماوە و پارێزراوە.
لەودەمانەی ئەوان لە هەولێر سەرقاڵی پاراستنی گۆڕستانەکەیان دەبن، لەناو شارەکەی پراگ، کە گۆڕستانێکی سەیری جووەکان لەناو شارەکە هەبووە، بەڵام بەدڵنیاییەوە هەموویان نا، بەڵام بەشێکیان سەربردەی گۆڕستانەکەی ناو جەرگەی بازاڕە کۆنەکەیان دەزانی، دەزانن! چۆن نازانن گۆڕستانێک تەرمی دوازدە هەزار مردووی ئەوانی تێدا بووە، تا ساڵی ١٧٨٧ی زاینی ئەو ڕووبەرە تەسکە، ئەو گۆڕستانە پیرۆزەیان پێشوازی تەرمەکانی کردوە. هەموویان ویستوویانە لەوێ بنێژرێن، بۆیە ویستوویانە بەمردوویی لەیەکتری نزیک بن، لەوێش لە چارەنووسی پاش مردنیشیان ترساون. یەکتریان گرتووە. بەمردوویی لە یەک گۆڕستان نێژراون. گۆڕستانەکەیان نهۆم لەسەر نهۆم بووە، ئەوەندەی ستوونەکان، بەرزاییەکە بەرگەی گرتووە تەرمیان داناوە! تا جەستەی مردووەکان، سۆزیان بۆ ژیان و چاوەڕوانی زۆریان بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە و کەساسییە مەزنەکە ئەستوور و قورس بووە، بەژنی گۆڕستان و شوێنی ناشتنەکە بەرز دەکەنەوە. ستوونی بۆ رادەگرن، تا باڵەخانە و ستوون و قورساییەکە بەرگەی نەگرتووە، ئینجا وازیان هێناوە!
ئێستا گۆڕستانەکە، وەک ماڵ و هەوار و شانازییەکانی کافکا دیارە. لەو شارە، ئەو هەوارە ناوازەیە بووە بە مۆزە و ڕۆژانە سەردانی دەکەن، هەزاران گەشتیار بەدیار هەزاران کێل و شوێنەوار و ناو و ئەستێرەکان دەوەستن، ئەوەی شارەزا بێت و ئاگاداری ڕۆژەڤەکە بووبێت پێیان دەڵێن:
ئێوە زوو مردن. ئەگەرنا لە ساڵانی ١٩١١ و ١٩١٢ ئەنشتاین لە زانکۆی ئەو شارە وانەبێژ بووە، ئەوتان دەناسی، بەڵام بەداخەوە زوو مردن. چاوەڕوانتان نەکرد، ئەگەرنا لە قاوەخانەکەی فرانز کافکا قاوەتان دەخواردەوە، ڕۆژنامەتان دەخوێندەوە. دەچوونە ناو خانووە بەردینەکەی کافکا، تێدا شاکاری ئەدەبی نووسیوە.
***

پاش ئەو کۆبوونەوەیە، دەزانن حاخامەکە نامەکەی نووسیوە، سەردانی قائیمقامی کردووە، یان نامەکەی داوەتە کەسێک زۆر بۆ کاسبییەکانی سەردانی موسڵ دەکات، ئەویش لەوێ ناسیاری زۆری هەبووە، نامەکە دەگەیەنێتە دەست والی موسڵ! بەڵام بواری ئەوەی نەبووە، وەڵامەکە وەربگرێتەوە، یان دەمەتەقێیەکی لەگەڵدا بکات!
ئیتر ئەوان، حاخامەکە و جووەکانی هەولێر، هەموو جووەکان هەواڵەکە دەزانن، وەڵامەکە وەردەگرنەوە یان نا! دیار نییە، یان من هیچ زانیارییەکم نییە! ماوەیەکیش دەپرسم و دەمەوێ ئەو فێرخوازەش بدۆزمەوە، ئەوەی ماستەری لەسەر گۆڕستانی ناو شاری هەولێر کردبوو. ئەو بدۆزمەوە، یان نامەکەی ببینم، ڕەنگە باسی ئەو بابەتەی کردبێت، تێدا زانیارییەکی وردم دەستدەکەوێت.
بێگومان ئەو کچە، بە بۆن و بەرام و بزەی شیرینی، سەردانی گۆڕستانەکانی کردووە. بۆ نووسینی نامەکەی، چەندان جار ئارەزوومەندانە مردووە، بۆ تەواوکردنی نامەکەی زیندوو بۆتەوە. کیژەکە وەک «دانتی»، چی تێدایە دانتی کێیە؟ ئەویش مردووە و زیندووبۆتەوە. بەزیندوویی بۆ نووسین و زانین خۆی دەمرێنێت. هەردوو دەستەکانی دەکاتە دوو کێل، دوو بەرد. ئەو چەند جارەی ئەو کیژە، بۆ خوێندنەوەی ناوی مردووەکان، ناوەکان، هەناسەیەک دەدات بە مردووەکان. هەندێکیان زیندوو دەبنەوە. سەرکەشانە قسەی لەگەڵ دەکەن. بەشادییەوە سەربردەکانی لەناو کتێبەکان، لە توێژینەوەی توێژەرەکان بوونیان نییە دەگێڕنەوە و گلەیی دەکەن؛
ئەوانە توێژینەوە لەسەر زۆر بابەت و گۆشە نیگا دەکەن. زۆر دەنووسن، بە چەندان زمان پەرۆش و خەریکی ژێدەری زۆر ئاڵۆز دەبن. ئەوان بەداخەوە، جارێکیان نەهاتن، نەوێران، جورئەتیان نەکرد، دڵیان بەمردوویی و ئێسقان و کفنە رزیوەکانی ئێمە نەسووتا و باسیان نەکردین! ئێمەی ناو ئەو مەملەکەتە کۆنە، باپیرانی چەندان نەوەی زیندوو و دیاری شارەکە. ساڵانە بە خۆڵە سوورەکەی سەر سینگمان زیندوو دەبینەوە، گوڵ دەردەکەین، دەبوژێنەوە، سوپاسی باران دەکەین، سوپاسی هەتاو دەکەین، هەڵدەستینەوە و ناوچەکە بۆندار دەکەین، بەهاران ڕووبەرەکە جوان دەکەین و کەسیش سەرێکمان لێ نادات.
ئەو توێژەرە، وەک خوێندکارە زیرەکەکەی ناو تاقیگەکانی بوارە تەندروستییەکەی دەیەوێ مردووەکان زیندوو بکاتەوە. بەشە زیندوو و باشەکان کۆبکاتەوە. دووبارە بیانکاتەوە مرۆڤی ڕاستەقینە. ئەندامەکان لە یەکتری ببەستێتەوە، قاچێک بەسەر

شاخێک نەکەوتبێت، هەڵنەخلیسکابێت، نەشکابێت، درزی نەبردبێت، بداتەوە ئەوەی بە شـکان و نەمان و بڕینەوەی قاچێکی، بەو ژان و ڕووداوە مردووە.
ژنە نووسـەری ئینگلیز «ماری شـیلی» هاوسەری شاعیری ناسراو شیلی، خوێندکار فیکتـۆر فرانکنشـتاین دەکاتـە پاڵەوانـی ڕۆمانێک، لە سـاڵی ١٨١٨ی زاینی چاپی دەکات، بەو فانتازیایە کۆژان و جوانەش جیهان سەرسـام دەکات. ئەو جەسـتەیەک بە چەندان کەرتە جەسـتەی تر تەواو دەکاتەوە، شـکاو و زامدار و پارچەکان، بەو پرۆسـەیە، بەو فانتازیایە کۆژانە بەسەرپێ دەکەونەوە و دەژین.

❊❊❊

ئەوەی ئێسـتا دۆزراوەتەوە، لەناو ئەرشیفی عوسـمانییەکان زانراوە ئاشتی رەحمان دەقەکـە بە زمانـە عوسـمانییەکە دەخوێنێتەوە و کردویەتی بە کـوردی. والیەکەی موسـڵ بـەو جۆرە نامەکـەی ناردوە، بەو شـێوە تێبینی خۆی نووسـیوە. بێگومان چارەنووسـی گۆڕسـتانەکە دیارە، کە نەماوە و ئاشکراشـە قوتابخانەکەش دروسـت نەکراوە.

**بۆ نەزارەتی ناوخۆ**

لە ٩ مارت ١٣٣٠ لەلایەن حاخامی هەولێر پروپاگەندەی ئەوە دەکات کە گۆڕستانەکە هـی یەهودییەکانـە، لەوانەیـە ئەوەی پروپاگەنـدەی بۆ دەکات راسـت نەبێت، هیچ بەڵگەیەکیان لە دەسـت نییە، کە کاتی خۆی لەو قەسـەبەیە ئەو شوێنەیان کردبێتە گۆڕستان، خودی خۆی وەکیلی باس حاخامی ئەوەی راگەیاندوە، لە راگەیاندراوێکی ئـاوا بەنـرخ هەروەها قەسـەبەکە بەزیادەوە پێویسـتی بە مەکتەبێکـی دواناوەندی و تەلەگرافخانەیـە، ئەمانە دەیانەوێت کاریگەری لەسـەر بیناسـازی دروسـت بکەن، داوایـەک کـە هیچ بەڵگەیەکی نەبووبێت و لەلایەن تاکە کەسـێکەوە وترابێت، ئەگەر لەلایـەن کۆمەڵـە خەڵکێکەوەش بـاس بکرێت و رێگەی پێ نەدرێت ئەوە ئاسـاییە، بەڵام لە حەقی خۆیان دڵنیان دەتوانن سـەردانی دادگا بکەن.

**لە ١١ مارت ١٣٣٠**

**نەزیف والی موسڵ**

❊❊❊

ئیتـر حاخامەکـە نەماوە، نەوەکانیشـی، خزمەکانی ئێسـتا لەو جیهانـە گەورەیەدا خەریکی بازرگانی و نووسـین و چەکدارن لە سوپای ئیسرائیل. شەوانەش لە هەندێ خاڵی هەستیار و پاسەوانییەوە بە تفەنگەوە دەخەون، پۆستاڵیان لەپێیە و سەریان کۆتە، یان خودەی ئاسـنی ڕەنگ خاکییان لە سەرە.

قائیمقامەکـەی نامەکـەی نـاردوە، والیەکەی موسـڵیش ئەگەر ڕەچەڵەکیشـی لەناو موسـڵاوییەکانیش هەبوبێت، ئەوەشـیان ئەگەرێکی زۆرە، لە ڕووداوەکانی داعش و داگیرکردنی موسـڵ و وێرانکردنی شـارەکە، یان نەماوە، یان هاتوونەتە ناو هەولێر! یەکێکیـان لەنـاو گەڕەکێکی ئەو شـارە، لەناو خانوویێکی سـەد مەتـری دوو نهۆمی گەڕەکی هەڤاڵانی هەولێر، یان شـارە نوێیەکانی ئاشـتی و زەیتونە و ئاوێنە دەژیت! ئەو بە دشداشـە سـپییە خاوێنەکەی، دەسـت بە تەلەفۆن بەردەوام قسـە دەکات. بواری نییە سەیری سەر شەقام و هاتوچۆش بکات. دەنگی کزە و گیرفانی سەرەوە و هەردوو گیرفانەکەی تەنیشـتی دشداشـەکەی پڕن، لە پارە و جیزدان و مۆبایلێکی کارتی زین. دەڕوات و قسـە دەکات، دەپرسـن و دەیانەوێ بزانن لە موسـڵ سونامی بوو، بومەلەرزە بوو، چۆن وا بەپەلە، ئەو شـارە سـەروبن بوو!؟ چ سونامییەک بوو، ئێمەی وا پەڕگەندە کرد، باشـە وا لە هەولێر ماینەوە، دەژین.

***

پاش بڵاوبوونەوەی ئەو نامەیە، ئەو کۆنە دۆکومێنتە عوسـمانییە تورکییە. پرسـیار دەکرێت، ئایا گۆڕستانەکە لەناو شارەکە، لە ڕووبەڕە تەسکەکەی ئەودەمانە، لەکوێ بووە؟ دەپرسـین گۆڕسـتانەکە لەکام بەشـی شـارەکە. لەسەر کام شـەقام، لەبەر سـێبەری چ باڵەخانە و هوتێلێکی شـەش نهۆمی شـارەکە بووە. گۆڕسـتانەکە بووە بە باڵەخانەیەکی بازرگانی، یان شـەقام و شۆسـتە و بازنەیەکی گەورەی چەند ساڵ جارێـک، شـێوە و ڕووبەڕ و نافوورە و باخچەیەک و ناویشـی دەگۆڕن، ناوەکەشـی دەگۆڕن، بەڵام خەڵکەکە هەر بەناوە میللییەکەی دەیناسـنەوە!

لە کۆنە گۆڕستانەکەی جووەکانی ناو شاری هەولێر. ئەوەی لە دۆکومێنتە عوسمانییە کۆنەکـە باسـکراوە؛ چـوار گـۆڕ و دەیـان کێلی بـەردی ئەسـمەری لار و خۆڕگر و دەیـان ئەسـتیرەی داودیـی بەرزبونەتـەوە، چۆن؟ ئاسـاییە، ئەوانە لە نووسـتن و کەوتـن و ڕوخـان بێـزار بـوون و هەڵسـاونەتەوە؟ ئەوانە بـوون بـە باڵەخانەیەکی شـەش نهۆم، نهۆمەکانی سـەدان پەنجەرەی گەورەی تێدایە. پەنجەرەکان ڕوویان لە

خەڵـک و جەنجاڵی ئۆتۆمبێلەکانی یەک سەرنشـینی تێدایـە. گۆڕی پیاوێک، بەر لە مردنی دەیان سـاڵ لەناو بازاڕەکەی ژێرەوەی قەڵات و تەنیشـت قەیسەرییەکە ئیشی دەسـتی کردووە، مسـی تاواندۆتەوە، قاڵبی گەورە و بچووک و بازنەیی و نەخشینی دانـاوە. ئـەو فافۆنـی کردوە بە؛ نەخش و نیگار و سـیم. یان زیـوی لەگەڵ مرواری و مـوورووی فەیـروزی کـردوە بە؛ خەناوکەی گەردەن و بازن و خڵخاڵ. ئێسـتا لەناو باڵەخانەیەکـی رەنـگ قاوەیی سـێ نهۆمدا، شـوێنی گۆڕەکـەی، هەوارەکە بووە بە ئۆفیس و نووسـینگەی گەنجێکی دەرچووی بەشی ئەلکترۆنی ئەندازە، تێدا دوو سێ گەنجی ئاکار و جلوبەرگ ناوازە، خەریکی بەرنامە و سـیدی و لاپتۆپن!

شوێنەوار و دەمار و داوە قژی زەرد و رەشە بە بریسکەکانی ژنێک، یان کیژێکی چاو قاوەیی، شوێنەکەی بووە بە بوتیکێکی لاکێشەیی روو لەسەر شەقام و شووشەبەندی رازاوەی بـە رووناکـی و سـیم و چـرا، دەرگایـە شووشـەییە بەرینـە بڵندەکەی بە کامیرای زوومی وردی ناسـک بەسـتراوەتەوە، تێدا هەموو مۆدە و فاشـۆن و رەنگە رازاوەکانی جلوبەرگ و ئیکسسـوار و پۆشـاکی تێدا نمایش دەکرێت. ئەو بوتیکەش لەلایـەن کیژێکـی دەم و لێـو شـیرینی و سـازکار و ناوقـەد باریکی زمان شـیرین، زاراوەکانـی پەیڤـی قسـەکردنی زۆربەی بێگانەییـە، بەڕێوە دەبرێـت. بوتیکەکە بە هەموو سـازییەکانی خۆییەوە، سپۆنسـەری بەرنامە هونەرییەکان و پۆشاک و مکیاژ و نازەنینـی کیژەکانی سـەر شاشـە و بەرنامەکان دەکات. چێورمـەی بنەماڵەیەک، دوو پیاو و ژنێکیان زمانزان و نووسـەر بوون، باڵەخانەکەی لەسـەری دروستکراوە، نهۆمی دووەمی بووە بە ئۆفیس و سالۆنی فێربوونی زمانە ئەوروپاییەکان، بەیانییان و ئێواران ئاوەدانە و کاردەکەن.

ئـەو دوکان و گـەراج و سـیف و هوتێلـەش، ئەگـەر لەسـەر ئـەو کۆنە گۆڕسـتانە دروسـتیش کرابێـت، رەنگـە دەسـکەوت و خێری نەبـووە، خاوەنەکانیـان زوو زوو لەبـەر چەنـدان هۆکار دەیکڕن و دەیفرۆشـنەوە، دەیڕوخێنن و دروسـتی دەکەنەوە، بەکرێی دەدەن و دەیانفرۆشن، دووبارە تەختیان دەکەنەوە، ئیتر لەسەر رووبەرەکە، ژێرزەمین هەڵدەکۆڵن و باڵەخانەی گەورەتر و بڵندتر دروسـت دەکەنەوە!

***

ئەوانـە، رەنگـە نەتوانن شـوێنی کۆنە گۆڕسـتانەکە دەستنیشـان بکـەن. خۆ زۆر لە شـارەزایانی شـارەکە و پسـپۆڕانی شارناسـی و نەخشەسـازییەکەش، ناتوانن و

نەیانتوانیوە شوێنی کۆنە گۆڕستانەکە، یان دواناوەندییەکە دەستنیشان بکەن! لەناو گەڕەکە کۆنەکانی شارەکە، هەردوو تەعجیلەکە ـتەعجیلی ئیسلام و تەعجیلی جووانـ، خانەقاش دیارە کۆنە. بە ژمارە قوتابخانەی کەمی تێدا بووە. ئەوانەی بوونیان هەیە نوێن. دووریش نییە لەبەر رۆژەڤەکە، شەڕەکانی ناوچەکە، سەفەربەلەک و یاخیبوونی عەشیرەتەکان و نەخۆشکەوتن و سستی دەوڵەتەکە، قوتابخانەکە دروست نەکرابێت. چونکـە هیچ شـوێنەوار و بـاس و وردەکارییەکانی نییە! یان دروسـتکراوە و زوو بە بـاران و ناکۆکییەکانــی رۆژگارەکە و خراپی کەرەســتەکان روخاوە!؟ یان نیاز بوایە دەست بە کارەکە بکەن، بەڵام رۆژەڤە نالەبارەکە و ئارەزووی بەرپرسێک لێرەولەوێ بواری نەداوە!؟ یان وروژاندن و باسکردنی مەسەلەکە تەنیا بۆ لەناوبردنی و لابردنی چەنـد کۆنــە کێل و گۆڕ و شـوورەی گۆڕی جووەکان بـووە!؟ ئەوانەش، بە فیت و داوای کێ بووە!؟ ئەوانە ویستوویانە لەناو شارەکە، نزیک قشڵە و قەڵات و مزگەوت و خانەقا و منارەکانیان، شـوێنەواری جووان و ئەسـتێرەی داودی نەمینێت! بۆچی نەمینێت؟ خۆ لە سـنووری قەڵەمڕەوی عوسـمانییەکان، جووەکە وەک کەسـایەتی و ئـاوەز و بەرنامەکانی گەشــەی ژیان نـاودار و پایەداریش بوون! ئەوەش راســتە، بەڵام ئەوە مەســەلەیەکە و مانەوەی شــوێنەواریش مەســەلەیەکی ترە! یان بیانوو و وردەکارییەکانی والی موسـڵ نەزیف پاشـا راسـت بووە، ئەوانە بۆ خۆیان شتێکیان داناوە بەناوی گۆڕسـتانی جووان و داوا دەکەن بمینێتەوە!

دۆکومێنتەکـە، کـە بریتییــە لە نامەکەی حاخامی جوو و داوا و راسـپاردەکەی والی موسـڵ، سـەر لە توێژەرەکە دەشـێوێنێت. گەنجە لاوازەکە کە دوو سـاڵە خەریکی ماستەرە. ئەو وەک قوتابییەک، کە بڕوای بە هیچ مەزهەب و ئایینێکیش نییە، ئینجا ئیش لەسەر شوێنە پیرۆزەکانی ناو شار دەکات، بەڵام لە رووکاری دەرەوەیان، نەک زۆر بچێتــە نـاو وردەکارییــەکان. دەیەوێ ئاییـن و ئیمان، لەناو، لەســەر رووبەندی و ئـاکاری مزگـەوت و کڵێسـا و مەرقــەد و مــەزار و گۆڕسـتان و بــەرد و کێلەکان دەستنیشان بکات!

قوتابییەکە سەیری چەندان سەرچاوەی تریش دەکات. دەیەوێ بزانێت و بخوێنێتەوە چۆن هەڵسـوکەوت لەگەڵ کۆنە گۆڕسـتانەکان کراوە. لە شـارە گەورەکان شوێنیان لەکام بەشـی شـاردا بووە. چۆن جووە دەوڵەمەندەکان، دوایی دەوڵەتی ئیسـرائیل بە هەموو ئامرازەکانی پەیوەندی، کار بۆ پاراسـتنی گۆڕسـتانە کۆنەکانیان لە شارە

گەورەکان دەکەن!

***

قوتابییەکە کچە و شەیدایی بۆ بابەتەکە، بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە منداڵ بووە، شەش و حەوت ساڵان بووە، هەفتانە دوو جار، لەگەڵ دایکی چۆتە ناو قەبرستانەکەیان، ناو چێوەرمەکەیان، ئەوەی بە سێ ریز دیواری لاکێشەیی دەستنیشانکراوە، تێدا مردوو و بیرەوەری و ناو و کێل، لەژێرەوەش ئێسقانی بابوباپیرانی بە نێر و مێیەوە لەخۆگرتووە. چێوەرمەکە زۆریش لە ماڵەکەیان دوور نەبووە، ئەو زۆریش چووە، تا دایکی تاقەتی هەبووە، پێ و چاوەکانی بواریان بەو داوە، هەفتانە سەردانی کێل و خۆڵی سەر سینگی مردووەکانی کردوە.

ئەویش لەگەڵ ئەو کەلتوورە گەورە بووە، یادگاری لەو سەردانانە زۆرە. لەوێ دەستە خوشکی پەیدا کردوە. ژنانی زۆری ناسیوە. وەرزەکانی لەوێ دۆزیوەتەوە. بەهار، زستان و بارانی زۆر و تەڕبوونی مردووەکان، تێدا ئاو چۆن ئێسقانیان بەمردوویی دەخنکێنێت! هاوینان چۆن دەکەونە ناو دڕک و دووکەڵ و سوتانی بەردەوام. ئەدی شێتەکانی ژیانیان لەوێ بەسەر بردوە. ئەو نەدیبوو، بەڵام بۆیان گێڕاوەتەوە، زۆر لە پیاوانی عاشق و بەلەنگاز لەوێ مەست دەبوون و شووشەی عەرەقیان بەگەرمی بەدیار مردووەکان تەواوکردوە. ئەوانە لەوێ گریاون. کێلەکانیان بە فرمێسکی گەرمیان شووشتوە و عەرەقیان خواردیتەوە. رێگای دەربازبوونیان کورتکردیتەوە.

لەو نامەیەدا توێژەرەکە چیرۆکێکی راستەقینەیی ناو میدیای جیهانی دەنووسێت، دەگێڕێتەوە، کە ژنێکی میسری، رووبەڕوو بۆ کەناڵەکانی راگەیاندن گوتوویەتی:

من شادمان بووم، کە داخوازی دەکرێم. خەنی دەبم بە بوکێنی دەچمە شار. بە خەنە و مەکیاژ و جلی نوێ دەگوازرێمەوە ناو قاهیرە. بووکم، لە ژان و خەم و ئێش و کارەکانی ناو ئاو، بەر هەتاو، ناو دڕک و زۆرداریییەکان دەربازم دەبێت. بەڵام بە بوکێنی، زاواکە، منی بردە ناو کۆشک و مجێوری بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی ناو گۆڕستانە گەورەکەی قاهیرە. ئەو لەوێ دەژیت و ماوەیەکی زۆریش و شادمان، بەرامبەر موچە و پارە پاسەوانی مەزارەکەیان دەکات. ئەوان، لەوێ زەماوەند دەکەن. لەوێ منداڵەکانیان گەورە دەکەن! ئەو دەڵێت:

من بەختیار بووم ئێمە پاسەوانی گۆڕی دەوڵەمەندەکان بووین. لەو جیهان و رۆژگارە سپڵەیە ژوور و هەوارمان دەستکەوتووە، با گۆڕستانیش بێت، دوورین

لــە زیندووەکان، ئــەوان تاقەتیان نەمابوو ئازاری کەس بــدەن، ناتوانن بە ئاماژەش ســەرنج بدەن، تەواو ببوون! ژیان لەناو مردووەکان بۆ ئێمە ئاســوودەیە و کێشەمان لەگەڵ مردووەکان نییە.

لەودەمانە مردووەکان لە ماڵ و دەرگا و پەنجەرە و کەسوکاریان دوور نەدەکەوتنەوە. ئــەوان بەختیــار بــوون، نزیــک بوون لە ئەســرین و نــزا و بۆنی خــواردن و بەزمی نــاو ماڵەکانیــان! پیاوێــک دەمرێت و دەنێژرێــت و لەبیریش دەکرێت، بەڵام ئاســان بــوو بزانێــت، چ لەناو ماڵەکــەی دەگوزەرێت. ژنێک بە گەنجــی دەمرد، نزای دەکرد منداڵەکانی نەکەونە بەر زەبری ژنێکی دەســت رەشــی مێردەکەی. بۆیە ئاســان بوو لەنزیکەوە چاوی لە منداڵەکانی، ناز و جلوبەرگ و خوێندنیان بێت! گۆڕســتانەکان، لەنــاو ماڵەکان نزیک بوون و نزیکیش ماونەتەوە. بەڵام گۆڕســتانەکەی حاخامەکەی داوای کــردوە هەڵنەگیرێــت و شــوێنەکە نەکرێتە بینای گەورە، هیچ شــوێنەوارێکی لەناو شاری هەولێر نەماوە.

***

**دکتۆرەکە**

ئیســحاقە ئەفەنــدی، قاتێکــی رەشــی ئەفرنجی جــوان ئوتوکراوی لەبەرە. ســیدارە رەشــەکەی، بــێ ئــەوەی گەردێکی لەســەر بێت، لەســەر ســەرە لووســەکەی قیت راگرتــووە. پێــڵاوە نارنجییەکەی شــەوق دەداتەوە. کابرا موچەخۆرە، ژنەکەشــی لە کۆڵانەکــە و لەســەر قەڵاتیش مامانــی دەکات. ژنەکە لەگەڵ زەمانــا هەندێ تیمار و داو و دەرمــان لە مێردەکەی فێر بووە. ئەویش برە پارەیەکی دەســتدەکەوێت، بۆیە گوزەرانیان باشــە. کابرا حەقیەتی جلی نایابی دەســتکردی دەرەوەش لەبەر بکات! ئەگەر بیەوێ نزیک لە قەســر و باخچەکانی پشــتەوەی گەڕەکی خانەقاش، دەتوانێت خانووێکی باش، لەســەر نەخشــە و دیزاینی خانووەکانی ناو قەڵات، بە حەوشەی بە حــەوزی ئاوەوە دروســت بکات! بەڵام ئەو زۆر جار گوتوویەتی ئارەزوومە دوا ســاڵ و رۆژەکانی ژیانم لە شــار، یان لە گوندێکی نزیک دەریا بێت! من ماســی بووم، لە دەریــا دەریانهێناوم و دەمەوێ بگەڕێمەوە ناو ئاو، بەپیری و بەمردوویش مەلەوانم. ئەگەر لە هەموو جووڵە و کۆششــێکی مرۆڤیش دوور بم، شــەیدایی شەپۆڵ بەردەوام دەبینم و دەمهەژێنێت.

دەڕوات و دیــارە ســمێڵە نەرمەکــەی جوان قنجکــردوە. لە کۆڵانێکــی باریک، دێتە

دەرەوە، هەر لە کۆڵانێکی باریکی شارێکی دووریش لەدایکبووە! گەورە دەبێت و شەرمیش ناکات، بۆچی شەرم بکات، چەند جار گوتوویەتی:
دایکم کیژێکی منداڵ بووە، بەڵام خۆی ناسیووە، لە کۆڵانەکەیان، لەسەر بانەکەیان عاشقی ژەندرمە، یان سوار و سەربازێکی عوسمانی ناو شارەکە دەبێت. چۆن دەیناسێت و لەکوێ دیویەتی، ئەوەیان روون نییە، زۆریش شیاوی باسیش نییە، گرنگ ئەوەیە، کیژەکە زمانی کوڕەکەی نەزانیوە، بەڵام بە جلوبەرگ و شیر و هەندامی کوڕەکە شەیدا بووە، حەزی لێی کردوە. لەو پرۆسەیە، لەو دیمانەیەدا، دوور لە ئایین و زمان و خاک و زەوق و ناسیاری و عەشیرەت هاوسەرگیری دەکەن. لەو پرۆسەیەدا ئەو لەدایکبووە! ئیتر چۆن گەورە بووە، لەکوێ خوێندویەتی، پزیشکی لەکوێ و کەی فێربووە، کەم شیاوی باس بووە، چونکە ئەو دکتۆرێکی سەرکەوتوو بووە.

***

ماڵت لەو شارە لە هەر کۆڵان و گەڕەکێک، لە باشوور یان باکوورەکەی، رۆژئاوا و رۆژهەڵاتەکەی بێت. قەڵاتت هەر لێوە دیارە. ئەو لە تەعجیل دێتە دەرەوە، نەرم نەرم دەڕوات و سەیری پێش خۆی دەکات، زۆریش بەپەلە نییە لە کۆڵانەکە دەربازی بێت. سڵاو لە دوو دوکاندارەکەی سەر رێگاکەی دەکات. ئەوەی شارەزای نەبێت و نەیناسێت، گومان لەوە ناکات ئەو ئەفەندییە خاوێنە گرێیەک، کێشەیەکی هەیە، شتێکیان بۆ دروستکردوە، ئەگەرنا ئەو خۆی هیچی نییە. لەوەتی هاتۆتە ئەو شارە، ئیشی خۆی کردوە و خزمەتی خەڵکەکەی کردوە! لە هەنگاوەکانی دەرچوونی لە ماڵەوە پەشۆکاو دیارە، خەم لە رابردوو و خزمەتەکانی دەخوات، نا، پیشەکەی مرۆییە و منەت بەسەر کەسەوە ناکات، بەڵام غەدر و ناحەقییەکانی دەکرێن، سەخڵەتی کردوە.
بەیانییەکی زوو، کە دەشتەکییەکان گەیشتوونەتە ناو شار. هەموو جۆرە کەرەستە و خواردن و سەوزە و میوەیان؛ بە بار و بە شان و بە بوخچە و سەبەتە و قەرتاڵە و فەردە و جەواڵ، بە دەست و چاو و ناز و جوانی و شیرینی هێناوەتەوە ناو بازاڕ و کۆڵانەکانی شارەکە. لە باشووریش خورما هاتووە. بازرگانە موسڵاوییەکان، ئێرانییەکان، ئەوانەی حەلەب و موسڵ فێرن کاڵا دەهێنن، گەیشتوون، لە خانەکان ماونەتەوە. دوکانەکانی ناو قەیسەری بۆ سڵاوکردن و ئاخاوتن و دیشلەمە خواردن

و چاوەڕوانــی بانگدانــی نوێژ و کڕین و فرۆشــتن کراونەتــەوە. مەیدانەکان ئاوەدان، بازاڕەکە گەرمە، بەفر هاتووە. ســەقاکان هەموو ماڵەکانی قەڵاتیان ئاوداوە، ئاویان؛ بۆ نوێژی ژنەکان و خوناوی گوڵەکان و مەلەی حەوزە بچووکەکانی ناو حەوشــەکان بردوە، ئاویان بۆ؛ چێشــت و نان و پەنجە و دەســت و بســک و خەنە و کۆترەکانی ســەربان و تەڕکردنی کوپەی بەر هەیوان و شەربەی سەربانەکان، بردوە!

***

ســەقاکان، دوو پیاوەکەی؛ بە شان و مل و کەروبارەکانیان قەڵاتێک ئاودەدەن. سێ گــەڕەک لــە مــاڵ و خێزان بە ئاو تەڕ دەکەن. پێویســت ناکات، پیــاوەکان، خاوەن ماڵــەکان، داوایــان لێ بکەن، پێیان بڵێــن ئاومان نەماوە و ســەردانمان بکەن، یان لــە تینوویەتی و وشــکبوون و پیســبوون و نوێژ بەبیریان بێنــەوە، خۆیان دەزانن و شــارەزان، ڕێــژەی ئاوی نــاو ماڵەکان، ناو جەســتەی ژنەکان، بەرۆکــی منداڵەکان، جلوبەرگیان دەزانن! لەوەتی بیرەکەی نزیک مزگەوتەکە لێدراوە، ســەقاکان ژمارەیان کــەم بوتــەوە. یەکێکیان لەنــاو بازاڕەکە مێوژی خۆشــناوەتی بە بــار دەکڕێتەوە و دەیکاتــە مێوژی رەمــەزان. یەکێکی تریــان کوڕەکەی قوتابخانەی روشــدیەی تەواو کــردوە، قبووڵــی نییــە چیتر باوکی؛ بە شــان و دێمکــە و تێڕ و کونــدە، باوکە بە تەمەنەکــەی، کورتەکێکــی بەلۆکــەی ئەســتووری لەبەرە، بە هەردوو لەپی دەســتی و قــاچ و تاقــەت و هــەردوو گوپی، ئــاو بۆ قەڵاتێکی پانوبەرین و وشــک و بەرزیش بکێشێتەوە.

لەوانە تەنیا دوو کەسیان وەک سەقای قەڵاتەکە ماون، لەو کارە راهاتوون، پەرۆشی پێشــوازییەکانن، حەز بەو پەیوەندییە دەکەن، چاوەڕوانییەکانیان پێ خۆشە! ئەوان ماونەتەوە و ئیشــەکە دەکەن و ئەوان لەجیاتی ســەنحاریب! ئاوی قەڵاتەکە دەدەن.

سەنحاریب نەیار و پلانی زۆری هەبوو. پاشای ئاشوورییەکان، سەنحاریب بۆ دەڤەری نەینــەوا پــڕۆژەی زۆر دەکات، ئەوێ تەواو دەکات، دەیەوێ ئاویش بۆ قەڵاتی هەولێر بێنێت، لە چۆم و ئاوی بەستۆرەوە، ئەو رایەڵە بە جۆگەیەک ئاو ببەستێت. جوانترین ملوانکە و رێگا و بواری بەستاوەنەوە ئاو بێت، پیرۆزە! شوێنەواری پڕۆژەکەی ماوە، بەڵام شەڕ و پەلاماردانەکانی رۆژگارەکە بواری ژیانی زۆر نادەن، ناتوانێت بەرنامە و خەونەکانی «ســەرجوونی دووەم»ی باوکی بێنێتەدی، کە دوو کوڕەکەی دەیکوژن! ئاوەکەی ســەنحارییبیش بۆ ســەر قەڵاتی هەولێر وشک دەکات و دیوارەکانی دەڕمێن.

لــەو رۆژگارەوە، ئیتــر ســەقاکان رۆژانە ئاو دەبەنە ســەر قەڵات، ئــەوان جۆگەکەی ســەنحاریب تەواو دەکەن. هەر ئەوانیش بوون بە سەنحاریبی قەڵاتەکەش.
بەیانییــان، ئــاوی ئەو جۆگانــەی دەگەنە ناو باخچەکانی ســێتاقان پاکن. چۆن پاک نەبــن!؟ لــە کانییەکانەوە بە دەمارێکی پیرۆز، بە جریوەی شــیرین بەرەو شــارەکە بەڕێدەکــەون. ئاوەکــەی پاکــە تەنیا؛ دوو بەرخ، یــان دوو کێشــکەی نازەنین، یان دوو دەم و مســت دوو دڵۆپەیان لێی خواردیتەوە. ئاوی ســەرگەردان و بە لڤین، بە جریوە و باعەباعێکی شیرین، کە سوپاسی جۆگە و باران و هەور و ئاسمان و زەوی دەکەن، پیس نابێت. ئەوان تینوویەتی خۆیان دەشــکێنن. سوپاســی بۆن و هەســت و هوشــیاری دەکەن، کە بەرەو ئەو دەمارە شــیرینە، ئەو ئاوە هەنگوێنەیان دەبات. ئاوەکەی دەگاتە ناو مزگەوتەکەی ناو بازاڕ هێشــتا زۆر ساردە!

***

بەیانییەکی زووە، ئیســحاقە فەندی نیگەرانە، تووڕەیە لەمێژە داوا دەکات دەزگاکەی ئــەو، نەخۆشــخانەکەی لەناو قــەڵات بێننە خوارەوە، لە دیــوی مزگەوتەکە، لەنێوان منارەکەی چۆلی و مزگەوتەکەی شــێخ، کەمێک نزیکتر لەوانەش، خەســتەخانەیەکی بۆ بکەنەوە، پارەی بۆ کۆبکەنەوە. چۆن بۆ نۆژەنکردنەوەی قوتابخانەکەی روشدیە، بــۆ خانەقاکەو بــۆ بیرەکانی ئاو و کارێــزەکان پارە کۆدەکەنــەوە، دەنێرن، ئەویش پێویســتی بــەوە هەیە، خەســتەخانەیەکی هەبێت، رووبەڕوو بە بــەگ و ئەفەندی و قائیمقام و بەرپرسەکان دەڵێت:
چیتــر لــەو کولانکەیە، لەو دوو ژوورە قووڕە تەســکە تاریکە بــێ پەنجەرەیە دەوام ناکەم، ئیش ناکەم، میللەت هەمووی نەخۆشــە، دەرشــێنەوە، رەنگ زەردن، منداڵان دەمرن، ژنان گڕوو دەبن! من چارەســەریان دەکەم، بە هەموو جۆریک دەرمانیان بۆ پەیدا دەکەم.
ئــەو رووبــەڕوو هەرەشــە لە ئاغــاکان دەکات، بەگەکانی رۆژ بــە رۆژ موڵکی زۆرتر، گوندی زۆرتر، بەناوی خۆیان دەکەن. بەردەوام لە هومایۆنەوە پاداشتی زۆرتریان بۆ دێت. بەناوی قوتابخانە ئایینییەکان، مامۆســتاکانی زانســت بڵاودەکەنەوە، گوندیان بەناو دەکرێت! بۆ ئەوانە دریغی ناکەن، بەڵام بۆ ئەوەی نەخۆشــخانەیەک پەنجەرەی زۆری تێدا بێت، ئاوی خاوێن، دەرمانی باشی هەبێت، چاودێری و خەمخۆری هەبێت، هیچ ناکەن.

ئیتر چەند ڕۆژێک دەم بەگلەییەوە دەوام دەکات، دەنگی دەکاتە قائیمقام و بەرپرسان، هەموو دکتۆرەکانی بەغدا و موسڵیش، بەو داوایە، لەو قەیرانە و داواکانی ئەو تووڕە دەبن. لەو سەردەمە، لەودەمەی دەوڵەت و ئەستانە ڕووبەڕووی چەندان ئاژاوە و شەڕ بۆتەوە. پیاوە نەخۆشەکە، دەوڵەتە لاوازەکە چۆن دەتوانێت پارە بۆ دروستکردنی نەخۆشخانەیەک دابین بکات!؟

***

ئەو ڕۆژە، دکتۆرەکە بەو وردە رازانە، دەگاتە خەستەخانەکەی. نەخۆشەکان، دوو سێ پیر و چەند منداڵی گڕوو، ژنێکی سیس و خەمبار و باشیش دیار نییە نەخۆشە، بەڵام دیارە نازانێت و نەدەکرا بپرسێت ڕووبەڕوو بڵێت منداڵم دەوێ، ئەو کوفرییەی نەکردوە، لەبەردەم دکتۆرێکی عوسمانی کریستیان ئەو رازە بدرکێنێت! ئەگەر ئەویش لە ژنەکەی دەپرسی، کەی شووت کردوە، ئەویش لە وەڵامدا دەیگوت:

- شەش ساڵ زۆرترە بۆ باوکم ژنم کردوە!

- ژنت بۆ باوکت کردوە؟ «دکتۆرەکە بەپێوە وەستاوە، پەنجەیەک بە برۆیە پانەکەی دادەنێت، مووەکان زۆرتر پان دەکاتەوە! ئەو وا دەزانێت لەگەڵ نیگا و سەرسامییەکەی، ئەویش برۆیە گەورە پانەکەی دەترووێنێت».

- ئا، ژنم بۆ باوکم کردوە، برام نەبوو، ژنی بۆ بکەم!

ئیسحاقە ئەفەندی ئەو بەزمەی زۆر دەزانی، ژن بە ژنی و ژن بۆ برای یان باوکی دەکات. بەڵام نەیدەتوانی بپرسیت بۆ منداڵت نییە، «لەوەتی دکتۆرە و هاتووتە ناو ئەو خەڵکە، زووتریش لە دەڤەری موسڵیش بووە، نەبوە و نەیتوانیوە ئەو پرسیارە و پرسیاری زۆرتر لە ژنان بکات، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندی بە سک و منداڵ و سووڕی مانگانە و نەخۆشی ژنانە هەبووبێت» ئەگەر منداڵی نەبووە، چارەسەریت دەویت!

***

لەبەر دەرگاکە لە دیاریان ڕادەوەستێت، دەیەوێ ئارامیان بکاتەوە، بە لوتفی شیرین ژانیان سووک بکاتەوە، بەڵام زوو دزداری قەڵات، پیاوەکەی خەنجەرێکی لەبەر پشدێنە، دوو کورتەکی لەسەریەک لەبەرە، لێی دێتە پێش و پێی دەڵێت:

ئیسحاقە ئەفەندی، ئەفەندی قائیمقام تۆی دەوێ!

ئەویش دوودڵە نەخۆشەکان چارەسەر بکات، یان بچێتە خزمەت قائیمقام! ناکرێ ئیسحاقە ئەفەندی نەچێتە خزمەت قائیمقام، زووتریش چرپەیەکی لەسەر مانەوە

و ئیشـکردنی لـەو قەزایەی بیسـتبوو، دەیزانی داوێکیان بۆی ناوەتەوە، قسـەکانی ئەویان پێ خۆش نییە، هەر بۆ ئەوەش سـەردانی موسڵی کردبوو، داوای لێ دەکەن دکتۆرێک بیپشـکنێت، بەڵام نەیپرسـیبوو، بۆ دەمپشـکنن، خۆم دکتۆرم و باش لە دۆخـی خـۆم و باری تەندروسـتی خۆم شـارەزام! مـن دەنێرنە بەردەم سـێ چوار دکتۆری موسـڵاوی و هەموو گیانم دەپشکنن، جلەکانم پێ دادەکەنن، سەیری پێست و مووی سەر و پشتم دەکەن!؟

ئـەو بەپەلـە سـەیرێکی نەخۆشـەکان دەکات، بەڵام کێشـەی ئەو لەگـەڵ قائیمقام لەسـەر هیچ نییە، نێوانیان گەرمە، هاموشـۆیان شیرینە، بەڵام لە زمانەکەی یەکتری باش تێناگەن، قائیمقام و خەڵکەکە کێشـەیان ئەوەیە زمانە عوسـمانییەکەیان باش نییـە. سـیدارەکەی لەسـەر دادەنێتەوە، بـەرەو خزمەت قائیمقام دەڕوات. شـوێنی هەردووکیان لەیەک دوور نەبوو، دوو دیوار و سـێ پەنجەرە و دوو پاسـەوان و چەند میوان و کوپەیەک ئاو و دوو سـێ دۆلاب و چەند کۆنە تفەنگ و خەنجەر لەپشـت و ئاغای میوان، نێوانیان بوو. بۆیەش بەئاسـانی دەگاتە ژوورەکە، لەسـەر کورسییەک کە بە رایەخێکی رەنگینی هێڵدار داپۆشـرابوو دادەنیشێت.

رووی لـە کابرایە و دەیەوێ بزانیـت بۆ بانگی کردوە، بەو بەیانییە چی دەوێت، کام لە ئاغاکان، کام لە سـوار و ژەندرمەکان بریندارە، تیماری کێی دەوێت! دەرمانی بۆ کام نەخۆش پێویستە! ئەو دکتۆرە و بۆ ئەوەش داوا دەکرێت، ناتوانێت دوابکەوێت، درەنـگ بـەدوای ژان و بریـن و شـکان و بورانـەوە و چاوکولبـوون و کەچەڵـی و مارپێوەدان و سـەرمابوون و رەقبوون و تەنگەنەفسـی نەچێت! دکتۆرە و سـوێندی خـواردوە، سـوێندەکەی لـە زانکـۆ و فێرگەیەکی ناو کڵێسـایەکی نزیک سـالۆنیک خـواردوە. ئـەو بە زمانی ئیتاڵی یان لاتینی سـوێندی خواردوە. ئـەو زمانە، زمانی پیرۆزی کڵێسای کاسۆلیک بووە!

لـە پەنجەرەکە باش و روون خوارەوەی قەڵاتی لێوە دیارە، باخچەکانی چواردەورەی قـەڵات وەک مافـووری رەنگیـن دەردەکـەون. باش و نزیک و سـۆزدار، هەسـت بە جووڵەی ئاو و جۆگەکانی ناو شینایییەکان دەکات. نەک دیمەنەکە سەرسامی دەکات، لە دوورەوە تامی بەرهەم و سـەوزایییەکانی باش بڕک و پنجەکان لقیان هاویشـتووە و باڵایـان کردوە! سـینگی بۆ سـروە فێنکەکەش دەکاتەوە. هێشـتا چاوی لەسـەر شـینایییەکان بوو، قائیمقام ئەو بڕیارەی نیشان دەدات.

**بۆ نەزارەتی پۆلیسی باڵا**
**٢٣ جەمادی کۆتایی ١٣١٧**
**١٦ تشرینی یەکەم ١٣١٥**
لە قەزای هەولێر کە ســەر بە ویلایەتی موســڵە، ئیساق هارون ئەفەندی لە شارەوانی بە پزیشک دامەزراوە، لەبەر هەندێک نەخۆشی جەستەیی داوای کردوە دانەمەزرێت، بەڵام لە حاڵی حازر دوای پشکنین ئەنجامەکەی دەرکەوتووە هیچ شتێکی نییە، بۆیە بەپێی بڕیار دەبێ بچێتە ســەر کارەکــەی و هەروەها بەپێی ڕێنماییەکان ١٥٠ لیرەی عوســمانی بۆ نێردراوە، لە نەزارەتی ئۆفیســەکانی گشتی سەربازیش بە مێژووی ٢٥ ئەیلول ١٣١٥ ژمارە ١٢٦ نووســراو هاتووە.

***

لەودەمانــەی فەرمانەکــە دەخوێنێتــەوە، یان بەر لــەوەی بیخوێنێتــەوە، بە دیمەنی خوارەوە و باخچەکان و گەرمەی بازاڕەکە، هاتوچۆی گوندییەکان ئیسحاقە ئەفەندی تەندروســتی و ڕووی خۆش و ســازگار دەبێت. بۆیە، زۆر بایەخ بەناوەڕۆکی نامەکە نــادات و بــە فۆنەتیکی دوور لە تورکــی و عەرەبی فەرمانەکــە دەخوێنێتەوە. بەڵام خۆی دکتۆرە و شارەزای هەموو نەخۆشییەکانە، باش دەزانێت جەستەی وەک گوێز ســاخە، گومانی نییە، زۆریش بە رامان و مقۆمقۆکانیان نیگەران و پەریشــان نابێت، ڕەنگــی ناگۆڕێت و ئارەقە نــاکات و زۆریش هەڵپە ناکات، فەرمانەکە لوول دەداتەوە و لەناو لوولە مســەکەی دەنێتەوە، لەســەر مێزەکەی قائیمقام جێیدەهێڵێت. دەیەوێ بگاتــەوە نەخۆشــەکانی، بەڵام هــەر دوودڵە بە ژنەکەی کەســاس و زەبوون هاتووە و دەڵێ نەخۆشــم، بپرســێت منداڵی بووە، مێردەکەی تەمەنی چەندە، هاموشــۆیان چۆنە! لەوانە دڵنیا بێت، ئینجا هەتوان و چارەســەری بۆ دابنێت.

***

ئەو دوو ســاڵ بوو هاتبووە ئەو شــارە، سەر ئەو قەڵاتە. زۆرتریش هاتنی بۆ قەزاکە لەبــەر دیتــن و ژیان و کارکردنی بــوو لەناو ئەو قەڵاتە! ئەو ناوەکەی بیســتبوو، لە حەلەب باســی ئەو قەڵاتە و ئاوەکەی ســەنحارییبان بۆ کردوە، لە شــام، لە ترابزۆن ئەوەی زانیوە، یان ئەودەمانە ئەو دەقە نەدۆزراوەتەوە. کەس نەیزانیوە ســەنحاریب نیازی چی بووە، کە گوتوویەتی:
**«من ســەنحاریبم، شــای جیهان و وڵاتی ئاشــوور، ســێ ڕووبارم لە چیاکانی خانێ**

**هەڵکەندووە، ئەو چیایانەی کەوتۆتە هەورازی شاری هەولێر ئەربلەوە ئاوی کانیاوەکانی لای دەستەچەپی رووبارەکانیشم کردۆتە ناویانەوە؛ ئینجا نۆکەندێکم تا ناوەڕاستی شاری هەولێر نیشتمانی خودای گەورە و مەزنمان ئەشتار هەڵکەندووە و ئاوەکەشم راست هێناوە».**

ئەگەر ئەوەی دەزانی، زۆرتر پەرۆشی دیتنی قەڵات و شوێنەوارەکەی دەبوو!

***

**بۆ سەدارەتی پەناهی**

لە قەزای هەولێر سەر بە سەنجەقی شارەزوور کەسێک بەناوی جوبرائیل لە هەردوو مەمکی شیر هەیە و لەکاتی خۆی لە ٥ حوزەیران ١٣٠٨ یەک پارچە داواکاریم پێشکەش بە بابی هومایۆن کرد، تاوەکو بڕێک خەرجی رێگا بۆ ناوبراو خەرج بکرێت، هەروەها موچەیەکی گونجاو بۆ ماڵ و منداڵەکانی ببڕێتەوە تاکو بچێتە دەرسەعادەت، بەڵام ئەو خەرجی رێگایەی کە دەدرایە ناوبراو دواکەوتووە و دواتر لە کۆتایی شیر لە مەمکەکانی نامینێت و سوودی نابێت، پێویستە شتێکی ئاوابێ وێنە بچێتە دەرسەعادەت و پشکنینی بۆ بکرێت، ئەمڕۆ ناوبراو شیر لە مەمکەکانیەتی، بەڵام لەگەڵ رۆیشتنی بۆ دەرسەعادەت و پشکنین دەربکەوێت شیر لە مەمکەکانی نییە، ئەو کاتە خەرجی رێگای دەکەوێتە ئەستۆی خۆی، ئەو فەرمانە بۆ ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

دکتۆر ئیسحاق ئەفەندی بەر لەوەی لە ژووری قائیمقام بچێتە دەرەوە. بێ ئەوەی دەستی بداتێ، سەرپێی ئەو نامە و داوایەش دەخوێنێتەوە. هەر بەپێوە دووبارە نامەکە دەخوێنێتەوە، واتە جوان لە مەبەستەکە تێدەگات، نایەوێ بڵێت:

من دکتۆری شارەکەم، شارەزام لە هەموو دۆخ و پێکهاتەکانی جەستەی مرۆڤم، بەبێ من ئەو ئیشە کراوە، ئەو نامەیە نووسراوە! دەبوایە ئەو جوبرائیلە ببینم، پشکنینی بۆ بکەم. چاو و هۆشی لەسەر نامەکە هەڵدەگرێت و لە ژوورەکە دەچێتە دەرەوە.

دوایی دەزانێت پیاوەکەی لە بەیان و نامەکە ناوی هاتووە، نامەی تری لەسەر نووسراوە، ئەوەی جێگای رامانە تەمەنی حەفتا ساڵە و منداڵیشی زۆرە! لەگەڵ ئەوەش هیچ قسەیەک ناکات و دەست لەو کارانە وەرنادات.

***

# قائیمقامەکانی قەزای هەولێر

**کۆشکی یڵدزی هومایۆن**
**فەرمانگەی باش کیتابەت**
**لە ویلایەتی موسڵ لە قەزای هەولێر قائیمقامی هەولێر عەبدوڵا پاشا لە پلەی چوار نیشانی عوسمانی پێدراوە.**
**١٦ رەمەزان ١٣٠٦**

عەبدوڵا پاشا، دوو جار لەسەر یەک، فەرمانەکە لەبەر خۆی و لە دڵەوە، بەڕووێکی شادمان دەخوێنێتەوە، دوایی هەموو میوانەکانی ئەوانەی خوێندەواریان هەبوو؛ مەلا و ئەفەندی و مامۆستاکانی شار و بەگزادەکان، نامەکەی بەشادییەوە لێ وەردەگرن. نامەکە بەنازەوە لە دەستە نەرمە شووشەییەکەی وەردەگرن. ئەوەی چاوی کز ببوو زەڕەبینەکەی لە گیرفانی سەڵتە و کەوا و چاکێتە ئەستوورەکەی دەردەهێنێت، نامەکە دەخوێنێتەوە. ئەوانەی خوێندەواریان نەبوو، داوا دەکەن پاشا بۆیان بخوێنێتەوە:

بابی عالی «ئەو ناوە، بەگەورەیی و دەنگی بەرز دەخوێنێتەوە. لەگەڵ خوێندنەوە سەیری هەموویان دەکات. هەڵوەستەیەک لەسەر ناوەکە دەکات، لەسەر خوێندنەوەکەی ساتێک دەوەستێت. شانازیش نیگای ئامادەبووان، میوان و منداڵ و خزم و کەس و بنەماڵەکەی دەکات. بەو چرکەیە شرۆڤەی نیگا و رامانیان لەسەر بڕیار و خوێندنەوەکەی دەکات، دروست سەیری یەک بەیەکیان دەکات»

ئەو دووبارە دەقەکە دەخوێنێتەوە. هەموو روویان گەش دەبێت، دیارە حەسوودیش هەر هەبووە، نەیاریش لەسەر پۆست و موڵک و ناوداریش هەر هەبووە، بەڵام خۆشەویستەکانی، ئەوانەی شیرینییەکە بە نمەک و دڵسۆزییەوە دەخۆن، دڵیان خۆش دەبێت. زۆریش بیر لەوە دەکەنەوە، چەند جەنابی قائیمقامەکەیان مەقامی باڵاتر بێت، ئەوان زۆرتر سوودمەندتر دەبن. ئەوە بۆ شارەکە، بۆ قەڵاتیش باشترە! ئەوانەی زمانە تورکییەکەیان باش نییە، جەنابی قائیمقام بۆیان دەکاتە کوردی! جوانیش فەرمانەکەیان بۆ راڤە دەکات!
لەگەڵ خوێندنەوەی فەرمانەکە، شێخێکی مێزەر کەسکی سەر گەورە، چاو و برۆ رەش، باڵابەرز، کەواکەی بەری، پشدێنە باریکەکەی، جلوبەرگی و ئاکاریشی لەگەڵ میوانەکانی تر جیاواز بوو، لەگەڵ خوێندنەوە و راڤەکردنی فەرمانەکە رووگەرم و سەرکەش، سەیری خەڵکەکە دەکات. ئەوانیش، بەتایبەتی ئەوانەی دەزانن، ئەو لە ناردن و هێنان و گەیاندنی پەیام و نیشانەکە رۆلی سەرەکی هەبووە. سەیری یەکتری دەکەن! بەڵام ئەوانەی نازانن ئەو میوانە بۆ لە سەرەوە دانیشتوە، بۆ ئەوەندە بۆندارە! زۆرتر بخوورەکە، قاوەکە ئاراستەی ئەو دەکرێت، دوایی دەزانن، ئەو هەموو چالاکییەکانی ئەوی گەیاندوە. هەر ئەویش نیشانەکەی بە دەستی خۆی لە یەخەی قائیمقام داوە.

❊❊❊

قائیمقام لەکاتی دەوام و لە سەردانە تایبەتییەکانی نیشانەکەی لە یەخە دەدات. کە دێتەوەماڵەوەش ژنەکەی نەرم و لەسەرخۆ، پاش ئەوەی سیدارەکەی لێ وەردەگرێت، بە پەنجە بەخەنەکەی دەرزی نیشانەکەی لە یەخەی چاکێتەکەی، کەواکەی، شاڵەکەی دەکاتەوە. ژنەکەی تەمەنی زۆر لە پاشا بچووکتر بوو، لەگەڵ ئەوەش باڵای لەو بەرزتر بوو، بەنەرمی و شانازیش نیشانەکە لەناو دەستماڵە کەسکە پەروازە بە ژەنگیانەکەی، بەدیاری لە کرمانەوە بۆ هاتبوو، دادەنێت، لچکەکانی لەسەر یەک پێ دادەداتەوە و قەدیان دەکات. لەگەڵ زرینگەی بازنە زێڕ و مووروە فەیروزییەکانی باسکی، گرێیەکی نەرمی لێ دەدات، دەستماڵەکە لەسەر رەفکەکەی قورئان و سێ کتێبی گەورەی تری لەسەرە، دادەنێت. هەر ئەو ژنە و هەموو گاڤێ، نیشانەکەی بۆ لە یەخەی دەدات، ئەگەر لێی بپرسن، تۆ نیشانەکەت، ئەوەندە ساڵەی لە یەخەت دەدرەوشێتەوە بە دەستی خۆت لێداوە، بەدڵنیاییەوە

عەبدوڵا پاشـای قائیمقام و لەبەردەم خەڵکەکەش هەر دەڵێت:
ئەو ئیشی خاتوونە، فێربووم، ئەو باشتر دەزانێت، دەرزیلەی زۆر بەکارهێناوە. بەڵام ناڵێت، لەگەڵ لێدانی دەرزیلەکە و وەستانی بەرامبەرم، بەڕاستی بۆن و هەناسەکەی چەشـەی رۆژ و دیمانـە و چالاکییەکانـم دەکاتەوە! خۆزگە دوو سـێ نیشـانەی وام دەبوو، تا زۆرتر خاتوون لە یەخەم بدات و بەرامبەرم بوەستێت. بەو بۆنەوە دەژیم، بۆنی ئەوم پێ لە نیشـانەکان پێ خۆشترە.

***

لە سەردەمی عەبدوڵا پاشا، کە ئەو قائیمقامی هەولێر بووە، ئەو پیاوەی لە چیاکانی دەڤـەری رەوانـدوز یاخـی بووە، بـۆ دەربازبـوون و نەگیرانی زۆرتر لە دە کەسـی کوشـتوە. دووریـش نییە هەندێ لەوانەی کوژراون پەیوەنـدی بەوە هەبووە پیاوەکە عاشـق بووە، کیژێکی خۆشویسـتووە! داوای کردوە، ویسـتوویەتی جوانییەکانی ئەو لە لاسارییەکانی دەربازی بکات! بەڵام بواری نادەن، کیژەکە دەشارنەوە، هەڕەشەی لێ دەکەن، ئەویش عاشـقە ـعیشقەکە ئەوەندە کۆنیشە، بەڵام بۆنە سازگارەکەی و جوانی و وەفا و قوربانییەکانی رەنگی داوەتەوە. بۆ ژووان و گەیشتن بە یار تەقەی کردوە، پاسـەوانی کوشـتوە، ئەوانەی ویسـتوویانە کیژەکە، دڵەکەی ئەو بۆ خۆیان ببـەن دریغی نەکردوە، بە تفەنگ و خەنجەر دەیانکوژێت!
بـەڵام ئەو لە شـەوێکی تاریکدا، لەگەڵ جریوەی ئەسـتێرە و چەکـەرەی نەمامێک، دەگاتـە هەیوان و حەوشـە و ناو خەون و داواکانـی کیژەکە و دەیفڕێنێت و دەڕوات و دەگاتـە بەرزاییەکانـی چیاکانی کوڕەک و بێجـان. لەوێ ئەو ژنێکی لەگەڵدا بووە، «عەبـدوڵا پاشـا دەڵێـت داخ بەتەنیا نەبووە، دەسـتی گیراوە، ئەگەرنـا نەدەگیرا، نەدەکەوت، ئەو تەیریش بوو» ئەو دەڕوات و شـوێنەواری سـڕیوەتەوە، باری شانی هەڵگرتووە، ئاوی بۆ زمان و قوڕگ، نانی وشـکی بۆ تێشـوو و هەنگاوەکانی بردوە. لـەو کاروانـەی وەک جۆگەی ئاو ویسـتوویەتی لەنێوان دوو تیشـە بەرد و درزی ناو دەوەنەکانا، دەربازی ببێت، بۆیە دەسـتی نەپاراسـتوە. ئەوەی پردی پەڕینەوەی بۆ گەیشتن و گرتنی ئەوی بڕیوە، پشتی کردوە بە پرد و لەسەری پەڕیوەتەوە. ئەوەی پەنجـەی بە پەلاپیتکەی تفەنگەکەی بۆ کوشـتنی ئەو داگرتـووە، پەنجەکانی بڕیوە و بە دەم خوێن و ئازارەوە جێیهێشـتووە و رۆیشـتوە. ئیتر بەردەوام بە کوشـتن و ترسـاندن، خـۆی دەرباز کردوە و کچەکەشـی لەگەڵدا بووە. تا وەلـەد ئەفەندی بۆ

پاداشت و خەڵات لەدوای شەڕێکی نەبەردانە، کابرا لەبەر ئەوەی ژنی لەگەڵدا بووە، پارچەیەک لە دڵی، نیوەی چاوی، هەناسەی لەکن ئەزیز و دڵدارەکەی بووە. شەڕی زۆری کردوە، فیشـەکی زۆری تەقاندوە، بەردەبازی زۆری بڕیوە، ماندوو و برسـی و تەنیـاش بووە، لەو راونان و بەدواچوونەدا دەگیرێت.
پاش دوو رۆژ عەبدوڵا پاشـا لەسـەر قەڵات، لەکاتی دەوام و میوانداریيەکانی گیرانی ئەو پیاوە دەزانێت! وەلەد ئەفەندی قوماندای سەربازی، نایەوێ پاشا ئەوە بزانێت زوو گیراوەکـە، هەواڵەکـە، برینەکـە، ژووانەکە دەباتە موسـڵ، لەوێش دوو هەزار و پێنـج سـەد قوورش بەرامبەر گیرانی دڵێکی عاشـق و پیاوێکـی وەک باز و هەڵۆی باڵدار، وەردەگرێت!
لە دڵی خۆی دەڵێت:
ئەگـەر مـن ئاگادار دەبووم، زووتر ئەوەم دەزانی ئـەو پیاوە گیراوە، چارەم دەکرد! زنجیری دەستم دەکردەوە، خەمی قورسم وەک هەور بەسەر شارەکە دەباراند، بەڵام مـن چـۆن بڕوا بکەم ئـەو دەگیرێت، دەبوایە بـڕوام کردبوایە، تـازە کیژەکەی بۆی سـووتابوو، بەجلـی بەرییـەوە بردبوو! دەبوایە بمزانیبوایە، هەسـتم بـەوە کردبوو، شـەوانە ئەسـتێرەیەک ناجریوێنن! هەسـتم بەوە کردبوو، ماوەیەکە رەشەرەیحانەی هەیوانەکەم رەش و گەش و باڵدارن، بەڵام بۆنیان سـارد و سووکە!
کێ ئەو عاشقە گەورەیە دەگرێت؟ چۆن باڵکرا؟ چۆن ئاو پەریشانی دەکات!؟ لەکوێ بەرەو چیای سـەخت باڵ دەگرێت؟ چۆن دەگاتە لوتکە و دوندەکە؟ لەوێ بەهارێکی رەنگین و بۆندار و وەرزی هاوینێک، دوایی زەردەی پایزێک لە ئەشکەوتەکانا، لەناو دەوەنەکانـا، وەک دوو کـەو، دوو مامز و هەزارەها پەپولـە دەمینێنەوە. ئەوان دوو دڵی دڵدار دەبن، بە هەزارەها باڵی رەنگینی پەپولە. شەوانە قسەکانیان، راز و ماچ و خەونەکانیان، ئارام و شـیرین دەبنە باڵ و رەنگ، سەربەسـتانە دەفڕن و دەبن بە پەپولە! دیارە پەپولەش وەرزی باڵ و رەنگە شیرینەکانیشـی تەواو دەبێت! ئەویش وەک پەپولە، هەست و نەستی زۆر کاریگەری هەبووە. بەتایبەتی هەستی پێیەکانی. ئەویش هەستی خشپەی پێیەکانی زوو دەبیست. ئەویش وەک پەپولەش لەناو رەنگ و شەو و سێبەرەدا خۆی دەشارێتەوە. بەڵام دیسان وەک پەپولە تەمەنی کورت بووە و زوو دەگیرێت. بەڵام دیار نییە، لەو پەپولانە بووە، ئەوانەی تەنیا دە رۆژ دەژین، یـان ئەوانەی کەمتر لە سـاڵێک دەفڕن، ئارەزوومەندانە شـیلەی گـوڵ و نەمامەکان

دەمژن، ئینجا باڵ و ڕەنگ و نازیان بە ســروەیەک، بە باهۆزێک هەڵدەوەرێت.
وەلەد ئەفەندی، پیاوەکەی تەربوشێکی ڕەشی بەرزی لەسەرە. سمێڵە باریکەکەی لە باڵی ریشـۆڵەیەک دەچێت، لە دەڤەرێکی دووری موسڵەوە هاتبوو. چڵکاوخۆرەکان، ئەوانەی چاویان بە پاشــا هەڵنەدەهات، باش دەیانزانی عەبدوڵا پاشــا، نایەوێ ئەو عاشقە باڵ بکرێت. ئەو بازە زامدار بکرێت. ئەو دوور لە فەرمانی پاشا و قائیمقامیەت بــەدزی، بە پشــتیوانی، چەندان تۆڕ و داو و زمانــی لووس و چەوری بەکاردەهێنێت و کابرا دەگرن! دەگیرێت، بەڵام هێشــتا دڵ و دەســت و ســەنگەرەکەی گەرم بووە، دەیگرن بەڵام دەســتی توند لەناو دەستی کیژەکە بووە.
وەلەد ئەفەندی بێجگە لەوەی پاداشتی وەرگرتووە، نیشانی مەجیدی پلەی چوارەمی وەرگرتوە.

**بۆ ویلایەتی موسڵ**

**١٨ شەعبان ١٣٠٩**

**٥ مارت ١٣٠٨**

لــە هەولێر فەرمانبەری ئەفســەری یوزباشــی وەڵەد ئەفەندی لەگــەڵ بەرزبوونەوەی پلەکەی بۆ پلەی چوارەم، یەک پارچە نیشــانی مەجیدی وەرگرتوە.

***

**شیر و خورشید**

**بابی عالی**

**ژمارە ٢١٨٤**

قائیمقامی قەزای هەولێر عەبدوڵا پاشــا لەلایەن وڵاتی ئێرانەوە لە پلەی دوو نیشــانی شیر و خورشیدی پێ دراوە، بە مەبەستی تێبینی پێشکەشی نەزارەتی ناوخۆ کراوە.

**لــە ١٣ زیلقەعدە ١٣١٠ و ١٧ مارس ١٣٠٩**

**سەدری ئەعزەم و یاوەری**

«لەوەتــی دەوڵەتــی عوســمانی پەیدابــووە، بــە چــەک و شــەڕ، بەنــاوی ئیســلام رووبەرێکــی فراوانــی ناوچەکە، بێجگە لە ســنووری ئێران دەگرێت. پەیوەندیشــیان بــە فەرمانڕەواکانــی ناو ئێران باش و هاوســۆز نەبووە. پاش شــەڕەکەی چاڵدێرانی ســاڵی ١٥١٤ی زاینی، ســەلیم پاشای عوسمانی و ئیسماعیل سەفەوی ئێرانی ناکۆک

بوون، شاهەنشـاهەکانی دەوڵەتی قاجاریش کە لە سـاڵی ١٧٨٥ لە سـنووری ئێستا ئێـران فەرمانڕەوا و دەسـەڵاتدار بوون! هەر ناکۆک بوون. لەودەمانە عەبدوڵا پاشـا لـە ڕۆژانـی فەرمانڕەوایی ئێران نێوانیان دەکات. کێشـەی هەڵاتـن و دەربازبوون و پەناهەندەیی هاوڵاتی عوسـمانی بۆ ئێران چارەسـەر دەکات. بە سـەردان و ئاخاوتن و دانوستانەکانی، ئاوارە و هەڵاتووەکان دەگێڕێتەوە سەر زێدی باب و باپیرانیان».
ئاغایەکی ناو مەجلیسە گەورە و گەرمەکەی عەبدوڵا پاشا. فنجانە قاوەکە لە دەستی پیـاوە باڵابەرزەکـەی بەرامبـەری، کە بە جلی کوردی قـاوەی عەرەبی بۆ تێدەکات، وەردەگرێـت. ئاغاکـە قوومێکـی لێ دەدات، دەمێک تام و شـلە و ڕەنگ و گەرمایی قاوەکـە لەنـاو دەمی دەهێڵێتـەوە، ئینجا قاوەکە ئاودیو دەکات. چاو و هەستیشـی لەسـەر قسـە و ئاکارە شیرین و گەشـەکەی عەبدوڵا پاشایە، ئەویش لە دوورەوە بە قاوەچییەکەی دەڵێت:
کارەسوو، بۆی تێکەوە، دیارە ئاغا قاوەکەی پێ خۆشە! تێکەوە بابم، چ زۆرە قاوە زۆرە!
ئەویش بەشەرمەوە دەڵێت:
بەڵێ پاشا بۆی تێدەکەمەوە. بە چاوان هەموو لە خێر و بەرەکەتی تۆیە. «کابراکە خەنجەرێکی دەبانی درێژیشـی لەبەر پشـدێنە، هەڵدەسـتێتەوە و سـەیری پاشـاش دەکات».
فەرمانەکە دوو جار دەخوێندرێتەوە، بەڵام قاوە فڕکردن و گەرمکردنەوە و تێکردن و ئاگر گەشـکردنەوەکە تەواو نابێت، هەر بەردەوامە، کوڕێکی باریکەی ڕەشـتاڵەش بۆ سـازییەکان و چاپوکی بەردەسـتی قاوەچییەکە دەکات. بەو بۆنەیە، لەسەر زەوق و شـادییەکانی پاشـا، دیوەخانەکە تا درەنگ بە سازی و ئاوەدانی دەمێنێتەوە.
پاشا ئارم و نیشانەی شیر و خورشیدی لە ئێران ئـەودەمانە دەوڵەت و دەسەڵات و ناوچەکـە ناوی ئێران نەبووە، لەکۆنەوە ئەوە ناوە هەبووە، بەڵام لە سـاڵی ١٩٣٥ی زاینـی وڵاتەکـە لە وڵاتی فارس، ناوەکەی دەگۆڕێت بـە ئێران، واتە زێدی ئارییەکان وەرگرتـوە. ئـەو نیشـانەیەی لەوەتی دەوڵەتی سـەفەوی لە سـاڵی ١٥٧٦ی زاینی هەبـووە پەیـڕەو و پیـرۆز کراوە. نیشـان و ئاڵاکەیان ماوە و زۆر گۆڕانی بەسـەردا هاتووە، تا شۆڕشـی ئیسـلامی سـاڵی ١٩٧٩ی خومەینی بەیەکجاری دەیسـڕێتەوە، ئەگەرچی شـێرەکە «خورشید» هێما و ئاماژەی ئیمامی عەلی بوو!

نیشــانەکە دێنێتــەوە هەولێر، لــە دیوەخانەکەی نیشــانی دەدات. یەکەم نیشــان و شــانازی ئێرانییەکانە بۆ کاربەدەســتێکی عوســمانی! بۆیەش دەوڵەتی عوسمانی لە ئەنجامی وەرگرتنی ئەو نیشانە و قایلکردنی گەڕانەوەی چەندان خانەوادەی ناوچەکە بۆ ســنووری عوســمانی سەرفرازە. چونکە ترسی ئەوەی هەبووە ڕۆژێک، لە ئەنجامی ناکۆکییــەک، پێشــهاتێکی لەناکاو، ئەوانــە لەلایەن ئێــران بەکاربهێندرێن، ئاژاوە بۆ ناوچەکــە پەیــدا بکــەن. ئەوانە لەوێ بن ڕۆژێــک دەتوانن بــواری کاروانەکان بگرن، ڕێگاکان ببڕن، خەڵکی زۆرتر دژ بە عوســمانییەکان هان بدەن!

عەبدوڵا پاشــا کۆششــێکی زۆر دەکات، ماوەیەک چاوەڕوان دەکات و لە گوندەکانی ســورچییەکان دەمینێتەوە تا بەفر دەتوێتەوە. کە کاروانەکان بەڕێدەکەون و ڕێگاکە دەکرێتــەوە، ئەویــش وەک نمایندەیەکی وریا و چالاک ئاودیــو دەبێت! بە کاروانەوە دەچێتــە ورمــێ، دەگاتە تەبرێز. لــەو کاروانەدا مەلایەکی دوازدە عیلمی فارســیزانی لەگەڵە. دوو کەسی لەگەڵە مافوری ئێرانی دەناسن. یەکێکیان لەگەڵ عەشیرەتەکانی ناوچەکــە بــە ژن خزمایەتی هەیــە. ئەو پیاوێکی بردوە هەموو شــیعرەکانی خەیامی لەبەرە! بۆ چاپۆشــین و شانازی دیاری زۆری بردوە، پەیامی پێیە.

ئەوانــەی زووتــر لەگەڵ چەند ســەرۆک عەشــیرەتێک زویر بــوون، ئەوانەی تووڕەن! ئەوانــەی داوای موڵکەکانیــان دەکەنــەوە، تــووڕەن چیتــر بەخۆڕایــی پیاوەکانیان نەگیرێــن، باجــەکان زۆرتر نەکــەن، مەئموری بیانی نەهێنە ناوچەکە، ســواری دڕ و ژەندرمەکان بەســەر گوندەکانمان وەرنەکەن! بۆیە دەڕۆن و دەچنە ناو ئێران، لەوێ دەبنــە هێــز و مەترســییەکی دژواری دانراوەی بە هەژموون. لــە هومایۆنەوە، بلەز و بــەردەوام داوای زۆر لــە پاشــا دەکەن. لە کۆشــکی یڵدزەوە داوا دەکــەن، عەبدوڵا پاشا، بچێتە ئێران، زیرەکانە کاروانەکە بکات، زووتر پەیوەندی بکات، ڕێگای چوون و گەڕانەوەی دابین و ئاســان بکات! قســە لەگەڵ کاربەدەســتان بکات، دەمی پیاوی عەشیرەتەکان شیرین بکات. قائیمقام ئەوە دەکات، ئەدی ئەو پاشا نییە، بەخۆڕایی زووتر نازناوی پاشای وەرنەگرتووە.

***

بەڵام پاداشــتی عوسمانییەکان ســاڵێک پاش ئەو نیشانە لە ٢٤ی موحەرەمی ساڵی ١٣١١ی کۆچی بۆ دەرچووە.

ســەبارەت بە وەرگرتنی پلەی میری میران ئەو نامەی بۆ نووسرابوو.

**بۆ سەدارەتپەناهی**

قائیقمامــی قــەزای هەولێر عەبدوڵا پاشــا لە ئەشــراف و خانەوادەکانی هەولێر پلەی میــری میرانــی وەرگرتــوە، لــە بــارەی بەرزکردنەوەی پلەکــەی بۆ میــری میران لە ویلایەتی موســڵ نووســراوە بە مێژووی ٢٠ مایس ١٣٠٩ ژمارە ٣٤ پێشکەشــکراوە، تاوەکو جێبەجێ بکرێت.

***.

**٢٩ موحەرەم ١٣١١**

**بابی عالی**

**فەرمانگەی سەدارەت**

**٢٦٧**

لە فەرمانی هێنانی ئێزدییەکان و شەش سەد خانەی عەشیرەتی هەرکی کە کۆچیان کردبوو بۆ ئێران، بۆ ناو مەمالیکی شاهانە، قائیمقام عەبدوڵا پاشا هاوکاری کردوە، لەبەر ئەوەی بۆ بەرزکردنەوەی پلەکەی بۆ میری میران پێشکەشــی نەزارەتی ناوخۆ کراوە.

**لــە ٢٩ موحەرەم ١٣١١ و ٣١ تەمموز ١٣٠٩**

***

من میری میرانم، چیتر قائیمقام نییم، بەڵام زۆر دڵسۆزی کاروباری سادەی ناو شار و ناو گوندەکان دەبم. خەم لە کەمی ئاوی کاریزەکان دەخۆم. بریکار و بەردەســتم زۆرە، ئــەوان دەنێرمــە نــاو کارێــزەکان. کە نەخۆشــیەک بڵاودەبێتــەوە، من میری میران دەیان میر لەبن دەســتم هاتوچۆیانە، ئەوان بۆ چارەســەرکردن دەچنە موسڵ، دکتۆر و دەرمان بۆ نەخۆشــەکان دەهێنن! چەکداری زۆرم لەبن دەســتە، ســەرۆک عەشیرەتەکان، چەتەکان، رێگرەکان، هەمەوەند و دزەییەکان، هەموویان پاسەوان و هــاوکاری مــن دەبن. من میری میرانم، کەس پێش من ئەو نازناوەی نەبووە!

چیتر نازناوی چەلەبی و ئەفەندی و پاشــا و بەگ و باشــکاتب و قائیمقامیشــم قبوڵ نییە. من میری میرانم. ســوڵتان لە ئەســتنبۆلەوە ناوی لە من ناوە. لە ئاســمانەوە، لــە دەریاوە، لەودیوی توروس و ئەنادۆڵەوە ئەو نازناوەم بۆ هاتووە!

میری میرانم، هەموو میرەکانی ناوچەکە، تا دوا سنووری شارەزوور و نزیک موسڵیش دەکەونــە بــەر دەســەڵات و فەرمانی من. ئەوە قســە و بانگەشــەی مــن نییە، ئەوە

فەرمانی سوڵتانە.
مـن بـووم چوومە نـاو ئێران، چوومـە ئەودیوی سـنوور. وڵات و ناوچەیەک هەرگیز بەرپرسـێکی عوسـمانی رووی تێنەکـردوە، قبوڵیـان نەبـووە، بەرپرسـێکی سـونە مەزهەب، پیاو و ئەفەندییەکی عوسمانی سەردانیان بکات! من چووم، لە سنوورەکە پەڕیمـەوە، لە باڵەکایەتی رێنیشـاندەر هاوکارم هەبوو. منیان ناسـیویەوە، گوتیان باپیرت، داپیرت خەڵکی ئەو دەڤەرە بووە. تۆ کوڕی خۆمانی شانازیت پێوە دەکەین هاوڕێـی تـۆ دەبین. بەیەکـەوە لەگـەڵ پیاوچاکەکانیان سـەفەرەکە دەکەم. گەنجە ئازاکانیان پشـتیوانم دەبن، ئەوان بەفر و زریان لێیان دەترسـێت. بەیەکەوە دەچینە نـاو مەرگـەوەڕ و شـەڵماش و موکریانیش. بێ دوودڵی دەچینە سـەر دەریاچەکەی ورمـێ! یـەک بەیەک عێل و هۆزەکان بەسـەردەکەینەوە. ماڵ بە ماڵ و رەشـماڵ بە رەشـماڵ، گوتیـان میـوان بە پاشـا، خزمەتت دەکەیـن! بۆنی سـونەکانی خۆمان، کوردەکانی خۆمانت لێ دێ!
میـری میران، دەسـەڵاتم ئەوەندە زۆرە، داوا دەکەم هەمـوو نامەکانی هومایۆن بەر لە والی موسـڵ و بەغداش ببینم. دەمەوێ سـاڵانە لەگەڵ کاروانی دەوڵەمەندەکان، بازرگانەکان، دەروێش و مەلاکانیش بچمە ماڵی خودا. زۆرتر لەوانە لە ماڵی خودا و لەبەردەم گۆڕ و هەوارەکەی خۆشەویسـتمان موحەمەد بمینێمەوە!
ئەدی من میری میران نییم بۆ چەکدارم کەمە، بۆ تۆپخانەکەی سـەر قەڵاتم بارودی کەمە؟ بۆ دکتۆرم بۆ زیاد ناکەن؟ شـارەکەمان گەورەیە، گوندمان زۆرە، من قسـەم بـە خەڵکەکـە داوە. ئاشـکرا و رووبەڕوو بـە دزەییەکانم گوتووە ئـارام بن، هەموو شتەکان باش دەکەم. لەو دەڤەرەدا قسەم دەڕوات، قوتابخانەکان نۆژەن دەکەینەوە، مامۆستای زۆرتری بۆ پەیدا دەکەین!
پێش من، بەر لەوەی من ببمە قائیمقامی شار و قەڵات و دەشتەکە، ببمە خۆشەویستی عەشـیرەتەکان. قـەڵات، قەڵاتەکەمـان کـز و تەپیـوو دەردەکەوت، بـەڵام بە پلە و پۆسـتەکانی مـن، بڕوا بکەن قوڵانجێک بـاڵا دەکات. «هەر بەو نەبەردی و مانەوە و خۆراگـری و جوامێرییانە بووە، قەڵات بەژنی هەڵداوە و بڵند بووە».
بە ئێزدییەکانم گوتووە، لالش پیرۆزە و بە پیرۆزیی دەمینێتەوە. دڵمان وەک تاووس بەرۆونـی و رەنگاورەنگـی بۆتان دەکەینەوە. بـەس بگەڕێنەوە، لەناو ئێران، داماو و کەساس خۆتان مات مەکەن، لەقە لە بەختی خۆتان و لالش مەدەن! ئێوە چۆن بێ

ئاو و پیرۆزییەکەی لالش دەژین! بگەڕێنەوە، من فەرمان و دەسەڵاتی ئەستنبۆل و سولّتانم پێیە. هەموو داوکارییەکانتان جێبەجێ دەکرێت. چیتر فەرمانتان لەسەر دەرناچێت، چیتر هەڕەشەتان لێ ناکەن و مەسحەفی ڕەشتان پیرۆزە و بە پیرۆزییش سەیر دەکرێت.
کام شار و ویلایەت نازناوی میری میرانی بە قائیمقامەکەی داوە؟ کێ ماڵ و دیوەخانەکەی لەسەر قەڵاتە. قائیمقامێکی وەک من نەبێت! من پاشا و میری میرانیشم. شەوانە تا درەنگ دیوەخانەکەم ئاوەدانە، میوانی موکریان و جاف و عەرەبی شەممەرم هەیە. بەردەوام و شانازیش شێخەکانی شەمزینان، نەقشبەندییەکان، بەرزنجییەکان، کە لە خانەقا و تەکیەکان هەڵدەستن سەردانم دەکەن. بە جەماعەت نوێژیان لەگەڵ دەکەم و لە پشت مەلاکە قامەت دەگرم. لە خوێندنی مەولوودەکانیان لەوێ دەبم، بەشدارییان دەکەم و یارمەتییان دەدەم. بەشانازییەوە دەستیان ماچ دەکەم، ورد ورد گوێ لە تەفسیری ئایەت و حەدیسەکانی مەلا نازدارەکانمان دەگرم.
حەزم لە حەیرانی دەنگخۆشەکانی دەزییەکانە. ئەسپ و تاژی و کەرەستە باشەکانی ڕاوم بۆ ساز دەکەن. بەیەکەوە دەچینە ئەو دەشت و ناو زوورگەکان، سنووری موڵکەکانم نیشان دەدەن. نامە و داوایان بۆ دەنووسم، داوا دەکەم سنوورەکانیان بۆ فراوانتر بکەن. جوتیار و سەپانەکانیان نەکەونە بەر لێشاوی سەفەربەلەک و شەڕەکانی بەلقان. مەلاکانیان دەنێرمە حەلەب و حەج و شامیش. داواش دەکەم زانا و مامۆستاکان پارەی وانەبێژی و فێرکارییان بۆ سەرف بکەن! لەگەڵ ئاغاکان نێوانم خۆشە، ئامادەن سەد پیاو بە چەکەوە لە خزمەتم بن. شەوانە، لە دیوەخانەکانیان بەشداری بەزمە شیرینەکانیان دەبم! قاوەی ئەوانم پێ خۆشە، پیاوەکانیان لە زیندان دەردەهێنم، نەخۆشەکانیان نیشانی دکتۆرەکان دەدەم.
منیش بەردەوام خزمەتیان دەکەم. هەرکییەکان، سورچییەکان، ئەو ڕەوەندانەی کە دەچنە کوێستانەکان، ئاسانکارییان بۆ دەکەم. ماوە ماوە پەیوەندی بە دەسەڵاتدارانی ئێرانیشەوە دەکەم. ئەوە من وا دەڵێم هەموو میللەتانی ناوچەکە، ئێرانییەکانیش دەزانن دۆخی سولّتان باش نییە. پاش شکان و نسکۆکانیان لە بەلقان و بەڕووی ڕووسەکان سوپاکەیان شپرزە بووە. چەکەکانیان لاواز، دەریاوانییەکە وەک جاران لەناو دەریاکان هاتوچۆیان نییە! سولّتانێک هەڵدەستێتەوە و دەیەوێ لاسایی ئەوروپا بکاتەوە. چاو لە فەرەنسا و ئیتاڵیا دەکات! یەکێکی تر دژ بەوە دەوەستێتەوە.

یۆنانییەکان، بوڵگارەکان، کوردەکان، عەشـیرەتەکان هەست بە نەخۆشی دەسەڵاتی ئەستنبۆل دەکەن!
هێنانەوەی شـەش سەد خانەوادەی هەرکییەکان لە ئێرانەوە بۆ ناوچەی قەزاکەمان، بۆ بەر سـێبەری سـوڵتان و والی کەم نییە. شـەش سـەد خانەوادە واتە چەکێکی زۆر، خەنجەر و ئەسـپ و مەڕ و ماڵات و ئەسـپ و سـواری زۆر دەگێڕمەوە. ئەوانە کـە دەگەڕێنــەوە مەرجیــان هەبــووە، دەبوایە رێزیان بگــرن، پیاوەکانیــان نەگرن، موڵکەکانیان بدەنەوە، هەموویان بۆ دەکەم.
ئەوانە کە دەگەڕێنەوە شـکاو و بەزیو پەشـیمان نەبوون، بە قسـەی من قایل دەبن بێنــەوە. ئــەوان بەرهەمیان هەیــە، داهاتیــان زۆرە، بە قسـەی ئاغاکانیان دەکەن. ئاغاکانیش لەگەڵ من دۆستن، میوانداری یەکتری دەکەین. ئەوان چەند ناو شارەکەیان پێ خۆشــە، من ســەد ئەوەندە رەشــماڵ و تاوڵ و مەڕدارییەکانی ئەوانم پێ خۆشە. لەبــەر کاروبــاری قەزاکە نەبێت، لە خەمی قوتابخانە و قشـڵەکەمان نەبێت. تەواوی هاوینــان بەگــەڵ رەوەندەکان دەکەوم. بە بــا و بارانی پایــز دەگەڕێمەوە، دەمەوێ ســامانەکەم بە پەز و وەڵسات بدەم...

***

### ٧ زیلقەعدە ١٣١٢
### بۆ ویلایەتی موسڵ

قائیمقامــی هەولێــر عەبدوڵا پاشــا بەهۆی ئەو زوڵم و ســتەمەی کە دەیکات، بەهۆی زیادبوونــی کارە بەدەکانــی رێگای سـنووری بە شـێوەیک تێکچــووە، هەموو مەڕ و مــاڵات دەخاتــە زیادەوە، هەر یەکێک یەک ئاقچە زیاتری بداتێ دەداتە ئەو، لە کاتی بەجێهێشــتنی پلەکەش بۆ کوڕە دوازدە ســاڵانەکەی بەجێهێشــتووە، بۆیە پێویســتە بە زووترین کات، لێکۆڵینەوە لەســەر ئەوە بکرێت و کاری پێویســت ئەنجام بدرێت.

***

ئــەو میــری میران بوو. شمشــێری ئێرانییەکانــی وەرگرتبوو. رۆژەکەی شــانازی ناو بەیداخەکەیان وەردەگرێت! بۆ ناوبژیوانی و پەیوەندییەکان دەچێتە ئێران، شــەیدای ســنوور بــووە. دەیزانــی هاتوچــۆی نێوان ئــەو دوو وڵاتــە گرنگــە! زۆر لەمێژ نییە نیشــانەکانی وەرگرتوە، بۆ لەودەمانە، لەو نزیکانە دەســت دەکات بە راوڕووت!؟ من کارم بەوە نییە، چی کردوە، یان نا!؟ عەبدوڵا پاشــا ناوێکی دیاری هەبووە، بەپێی

بەڵگەنامەکان دیارە ئاستی چالاکییەکانی لە دەرەوەی سنووریش بووە. دەپرسین: بۆ لەناکاو، لە گەرمەی شانازییەکان دەست لەو کارە قێزەوەنە وەردەدات و تێکەڵی مەڕدار و رەوەندەکان دەبێت!؟

***

من هاتووم ئیش لە دەقە عوسمانییەکان بکەم و بیانکەمە کوردی و کۆیانبکەمەوە، ریزبەندیان بکەم، خاوەنی زانکۆش پەلەم لێ دەکات، زۆرجار دەڵێت:
- ئاشتی دەزانم چالاکی، ئیشەکانت جوان دەڕوات، بەڵام دەمەوێ زانکۆکەمان یەکەمی ئەو بوارە بێت. شانازییەکە، ناسینی دۆکومێنتەکان و بڵاوکردنەوەیان بە زمان و چاپی کوردی بەر زانکۆکەمان بکەوێت! زانکۆی جیهان.
- دکتۆر منیش حەز دەکەم، ئەوەم دەوێ! ئەگەر سەرەتا هەندێ زەحمەتیم لە شرۆڤەکردن و ناسینەوە و خوێندنەوەی نووسینەکان دەبینی، بەڵام ئێستا «رووی زەرد هەڵدەگەڕێت و شەرم دەکات کە باس و پەسنی خۆی دەکات» زۆر باش بووم، ناڵێم وەک پرۆفیسۆر فاروقم! بەڵام هیچ پەکم ناکەوێت! وشە چییە، رازی دەروون و دەبڕینی رووداوەکانە. ئەوە وشەیە! من ئاشنای کەسایەتی خەڵکەکە بووم، خەڵکی ئەودەمانە، بووم بە ئەندامێکی جڤاتەکە. باشیش رەنگدانەوە و چۆنیەتی رۆژگارەکەم بەرجەستە کردوە، ئیتر دەتوانم دەقەکان بەئاسانی بخوێنمەوە.
- با لە بیرم نەچێت، ئەو پرۆفیسۆرە کێیە؟ «بەسەرسامییەوە» با ئەویش بێت، ئەویش دادەمەزرێنم!
- ببوورە دکتۆر، ئەو سەرپەرشتیاری ماستەرەکەم بوو، تورکە! لێرە نییە.
- وامزانی مامۆستایەکی خۆمانە، گوتم با بێت لە پرۆژەکە هاوکارت بێت! باشە کەسی تر نییە، لەو هەولێرە، لە هەموو زانکۆکان کەس هەیە، ئەویش بێنە بەیەکەوە ئیشەکە بکەن!
- دکتۆر نازانم، کەس هەیە، یان نا! بەڵام من بەڵێن دەدەم، خوێندنەوە و وەرگێڕانی دەقەکان، هاوشانی چاپکردنیان بڕوات! خەمت نەبێت!
- بەنیازی چۆن ئیش بکەیت و بەرنامەت چۆنە!
- سەرەتا هەولێر تەواو دەکەین! هەموو دەقەکانی تایبەتن بە هەولێر، یان ناوی هەولێریان تێدایە جیاکراونەتەوە. ئەوانە ئامادەن، زۆریشم تەواو کردوە. وێنە و خەت و هێماکان «ناڵێم نووسین» بوون بە نووسین و خوێندرانەوە، ئیتر وەرگێڕانەکەشی

ئاســان بووە، ئاســانترە، تەنیا خوێندنەوەکەیان کەمێک ئاســتەنگی تێدایە. ئەوانەم تەواو کردوە.

- بێگومــان هەولێــرم زوو دەوێت، دۆکومێنتەکان زۆرن! «دانیشــە کیژم، بۆ بە پێوە وەســتاویت، دانیشە با قاوەیەکت بۆ بێنن».

- ســوپاس دکتــۆر نامــەوێ دوا بکــەوم، ســەرمێزەکەم قەرەباڵغــە و کتێبخانەکەش خەڵکێکی زۆری تێدایە، دەڕۆم. با بێینەوە ســەر بابەتەکەمان بەڵێ، زۆرن، نزیکەی بابەتی دوو بەرگم ئامادە کردوە. بە دوای هەولێر، شار بە شار خەریک دەبین، بەڵام هەولێــر تەواو دەکەین! ئینجا ئەوانی تر.

- ئــەدی چــۆن منیش یەکەمجــار هەولێرم دەوێ! ئەوانی تر پــاش هەولێر «بزەیەک دەکات» ئــەدی هەولێــر پایتەخت نییە! بەڵام دەمەوێ چاپەکان بە دیزاین و بەرگ و نــاوەوە و چاپەکەی، جوان و ناوازە بێت!

- خەمت نەبێت، دیزاینەری باشــمان هەیە، ئێســتاش، خۆت ئاگاداری چاپی هەولێر جوانە، چاپخانەکان شــارەزا بوون و ئەزموونیان زۆرە!

***

من چییم داوە لەوەی عەبدوڵا پاشا غەدری لێکراوە، یان ئەوان شەڕی پێ دەفرۆشن و دەیانــەوێ بیگۆڕن. ئەو بەڕوونی لە چەندان جێگا و مەجلیســا، لەبەردەم خەڵکی ناسیار و نەناسیش، گوتوویەتی:

راستە من پیاوێکی دزەییەکانم داڵدە داوە، رامگرتووە، درۆ ناکەم و ئەوە ناشارمەوە. پیاو ئەو پیاوەیە راستییەکان وەک خۆی بگێڕێتەوە! ئەوە لە من دەوەشێتەوە، چۆن مــن چوومــە ئێران و خەڵکی ناو خێڵــە یاخییەکان و ئێزدییەکانم هێنایەوە، ئاشــتم کردنەوە، ئەوەم کردوە و ئەوەشــم کردوە. ئەوە دەکەم، چونکە؛

شــەوێکیان خەوتبووم. بەر لە نووســتن دوو ســورەتی قورئانم خوێندبوو. بەشــێکی حیکایەتی هەزار و یەک شــەوەم تەواو کرد. ئەو شــەوە لەگەڵ حیکایەتی شەهرەزاد و ســۆزی گێڕانــەوە و داڕشــتنی بابەتەکــە چــاک و راســت ئاوێتە ببــووم. چیرۆک و گێڕانەوەکــە نــەک منــی بــاش خەواند، شــەهریاری پاشــا و هاوســەرەکەی پێش مــن خەواندبــوو. باش خەوم لێکەوتبوو. کەمێک پەنجەرەکەشــم کردبووەوە، بایەکی فێنــک، درۆ نییــە ئەگــەر بڵێم بایەکــە وەک بولبول بە جریــوەوە دەهاتە ژوورەکە. بەر لەوەی بەڕاســتی خەوم لێ بکەوێت، چاویشــم لەســەر ئەســتێرەیەک بوو. دیارە

ئەویـش وەک مـن بە گێڕانەوەی حیکایەتەکە، زۆر لە دوورەوە هاتبووە ناو دیوەخان و نووسـین و گێڕانەوەکەمـان، بۆیـە بێـدار بوو. ئەویـش بۆ نەرمبـوون و کەمۆیی شـەهرەیار دەبروسکایەوە، دیارە گوێی لەوە بووە شەهرەزاد چی بۆ گێڕاوەتەوە.
پیـاوەکان، یـان خاتوون خان بوو، لە خەوم هەڵدەسـتێنن. خۆم گەرم دادەپۆشـم، دێمـە دەرەوە، لەناو حەوشـەکە و لەبەر دەرگاکە، ئەحمەد دەبینم. ئەو شـەکەت و زامدار، دەیناسم، چەند جارم دیبوو، دەمزانی ئەو یەکێکە لە پیاوە ئازاکانی ئاغاکانی دزەییان. لەگەڵ بینینی جەرگم بۆی سـووتا، زامداری کردم. ئەو بەو شـەوە و بەو دۆخە نالەبەرە هاتووتە ناوماڵم. باڵی شکاوە، راویان ناوە، بەڵام دیارە ئازاش بووە، چۆن دەربازی بووە، چۆن وەک جنۆکەیەک گەیشـتووتە سـەر قەڵات، ناو ماڵەکەی من. دیارە ئەو بە سـەر دیوارەکانا هەڵگەڕاوە. یان دووریش نییە لەگەڵ رووناکی و بروسـکەی ئەسـتێرەیەک دابەزیوەتە ناو حەوشەکەم. ئەو چۆن گەیشتووە. رووناکی و کلکی ئەستێرەکەی گوێی لە چیرۆکەکە گرتبوو، دەستی گرتووە، ئەگەرنا دەرگای قەڵات داخراو بوو، قەڵات دیوارەکانی سـەختە، چۆن هاتووە و چۆن گەیشـتوە!
پیـاوە میوانەکـە گـەرم دەبێتـەوە. تێر دەخوات و ترسـی دەڕەوێتەوە ـئەو خۆی ترسـنۆک نەبوو، پیاو و چاو و دەسـتێکی ترسـاویش نەبوو، بەڵام لە دۆخەکە، لە میواندارییەکە دەترسـێت پاشـا لێی دەچێتە پێش، ئەحمەد کوچک دەباتە پەنایەکی هەیوانەکەیان و پێی دەڵێت، یان دەیەوێ بۆی روون بکاتەوە و بگێڕێتەوە، ئەو چۆن گەیشتووتە ناو قەڵات و هاتووتە ناو ماڵەکەی، چۆن دەرگای بۆ کراوەتەوە و هاتووتە نـاو حەوشـەکەیان. دیـارە ئەویش ورد و درشـتی پلان و دەسـت و بەرنامەکەی بۆ گێڕاوەتەوە، بەڵام وەک ئەوەی قسەکانی بۆ دیوار و پەنجەرە و کاریتەکانی ژوورەکە کردبێـت، کـەس گوێی لێ نەبووبێت و پاشـاش هیچی نەبیسـتبێت، کەس هیچی لێ نەزانی، چونکە پاشـا قسـەکەی نەگێڕاوەتەوە، بە چاوی کەسیشـی دانەداوەتەوە و مـل و گەردەنـی کەسیشـی نەشـکاندوە، وەک دەڵێن: بەردێکی لەسـەر دادەنێت و رۆژەڤەکە بن ئاویش دەکات.
راسـتییەکان دەڵێـم، من پیـاوی درۆ و پانکردنەوە و هەڵخەڵەتانـدن نییم. دەمزانی ئیبراهیم ئاغای دزەیی ماوەیەکە سـەرپێچی دەکات. دەچێتە سـەر رێگاکانی نێوان کەرکوک و هەولێر. بە تفەنگ و چەکی زۆرەوە، پیاوانی زۆری بردوتە سەر کاروانەکان. ئەویـش یەکێکـە لە پیاوەکانی، زووتر ئەوەشـم دەزانی بەمردوویـی زەلامێک و دوو

کەسیان بەچەکەوە و بەزیندوویی گیراون! ئەوەم دەزانی و بۆیان نووسیبوم، داوای چارەسەرکردن و سزادانیان کردبوو.
ئەو بەو شەوە هاتبوو، چۆن دالدەی نەدەم، تێری نەکەم، وشکی نەکەمەوە، تینوویەتی نەشکێنم! کەس کۆتری باڵ شکاوی دەرپەڕاندوە و هێلانەی روخاندوە. کەس قورگی هەناسەی سواری بۆ خنکاندن گرتووە، ئینجا لەکوێ؟ لەناو حەوشەکەی خۆی، لەبەردەم ژن و منداڵ و چاوی ئەستێرەکانی شەوەکە، کەس ئەوەی کردوە، بۆیە دالدەم داوە، یەکسەر داوا دەکەم نانی گەرم، ئاوی سارد و پێخەمی نەرمی بۆ ساز بکەن و بیحەوێنەوە.

***

**١٧ موحەرەم ١٣١٤**

**بە وەکالەتی ویلایەتی موسڵ**

لە ١٩ی مایس ١٣١٢ قائیمقامی هەولێر عەبدوڵا پاشا ئەرکی پارێزگاریکردنی لە ئاسایش و سەقامگیرکردنی مەملەکەتی پێ سپێردراوە کەچی ئەحمەد کوچوک رایکردوە بۆ خانەی قائیمقام و لەوێ خۆی حەشار داوە، بۆ ئەم مەبەستە نووسراو بۆ ویلایەت کراوە.

***

**١٠ شوبات ١٣١١**

**بۆ نەزەراتی خەزینەی شاهانەی جەلیلە**

**٢٩ی شوال ١٣١٢**

**١٢ نیسان ١٣١١**

لە موڵکی هومایۆنی کشتوکاڵی شەمامک سەر بە قەزای هەولێر سەر بە سەنجەقی کەرکوک یەکێک لە ئاغاکانی عەشیرەتی دەزیی ئیبراهیم ئاغا و نزیکەی چل کەس لە خزم و پاسەوانەکانی چوونەتە سەر فەرمانگەی موڵکی هومایۆن، فەرمانبەرەکانیان ناچاکردوە کارەکانیان بەجێبهێڵن، بۆ ئەو مەبەستە هەواڵ نێردراوەتە سەرۆکایەتی قومیسیۆن لە موسڵ، لەبەر ئەوە پێویستە چارەسەرێک بۆ ئەوە بدۆزرێتەوە، لە ویلایەتی موسڵ تەلگراف بە مێژووی ١٠ شوبات ١٣١١ لەگەڵ زانیاری نێردراوە تا کاری لەسەر بکرێت.

***

**١٠ شەعبان ١٣٣٢**

**بابی عالی**

**نەزارەتی ناوخۆ**

**بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی**

**پوختە ٢١ حوزەیران ١٣٣٠**

لە قەزای هەولێر لە چەتەکانی دزەیی عومەر بەمردوویی و مەستەفا و ئەحمەد چەلەبی بەزیندوویی دەستگیرکراون لە مێژووی ٢٠ حوزەیران ١٣٣٠ لە ویلایەتی موسڵ ڕاگەیاندراوە.

***

**خەزینەی تایبەتی شاهانە**

**خاوەنداریەتی هومایۆن**

**ژمارە ١٨**

لە بارەی ئەو کەسانەی هێرشیان کردوتە سەر کارگێڕی شەمامکی موڵکی پاشا لە ویلایەتی موسڵ لە وەڵامدا تەلەگرافنامە وەرگیراوە، فەرمانی پاشا لە ٢٢ مایس ١٣١٢ فەرمان لەسەر ئەو کەسانە دراوە کە بەو کارە هەڵساون و بەم نزیکانە دادگاییەکەیان جێبەجێ دەکرێت. هەروەها هەڵاتوو ئەحمەد کوچوک بۆ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون لەسەر ناوبراو و هێزی سەربازی ڕەوانەی هەولێر کراوە، لە بەشێکی تەلەگرافنامەکە هاتووە، هەڵاتوو ئەحمەد کوچوک لەگەڵ قائیمقامی هەولێر عەبدوڵا پاشا پەیوەندی هەیە، تەنانەت یەک شەو لە ماڵی قائیمقام میوان بووە، لەو کاتەی کە قائیمقام ئەرکی پاراستنی ئاسایش و پاراستنی هەولێری پێ دراوە، کەچی ناوبراو کەسێک بە تاوان تاوانبار کراوە لە ماڵەکەی خۆی شاردۆتەوە، بەمەش زیان بە ئارامی دەگەیەنێت، بۆیە دەبێ کاری پێویست ئەنجام بدرێت، ئەمر و فەرمان بۆ ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

**لە ١٣ موحەرەم ١٣١٤ ١٣ حوزەیران ١٣١٢**

***

**١٩ موحەرەم ١٣١٤**

**بۆ ویلایەتی موسڵ**

**شێوە**

لە ١٨ حوزەیران ١٣١٢ قائیمقامی هەولێر عەبدوڵا پاشا بەپێی ئەو کارانەی کردویەتی باش نییە یەک کاتژمێر لەسەر کارەکەی بمینێتەوە، پێویستە بە زووترین کات

مامەڵــەی گۆڕینی بۆ بکرێت، زانیاری دراوەتە نەزارەتی ناوخۆ.

❊❊❊

دەیگــۆڕن، بەڵام ســزای نادەن، دیارە ناتوانن، یــان بیانووەکەیان لاواز بووە. دوایی خۆیان داوا دەکەن لەگەڵ عەشــیرەتی دزەیی ئاشــت ببنــەوە. داوایان دەکەن چیتر بەناوی دەرچوون و یاخیبوون بەرەو ئێران، هەڕەشە نەکەن. سەرۆک عەشیرەتەکان چییــان دەوێ بۆیــان دەکەیــن، موڵکەکانیان بەنــاو دەکەیــن، گوندەکانیان بەناوی خۆیان دەنووســین، چییان دەوێ. بەڵام عەبدوڵا پاشــا دەگۆڕن و لە شوێنی عەبدوڵا پاشا، قائیمقامی ژەنگاڵ ئیبراهیم سدقی بەگ دادەمەزرێنن. بەڵام، ئەو زۆر ناتوانێت ناوچەکە، عەشــیرەتەکان، سنوورەکە کۆنترۆڵ بکات، داوای گۆڕین و لادانی دەکەن، لــە ســاڵی ١٣١٥ ئیبراهیم ئەفەندی دەگوازنەوە ســیواس و روشــدی ئەفەندی بۆتە قائیمقامی قەزای هەولێر.

چەکدار و پیاوانی عەشیرەتەکە زۆر بە گفت و بەڵێنەکان بڕوا ناکەن، داوای فەرمان و دامەزرانــدن و بەناوکردنــی موڵکــەکان دەکــەن، قائیمقامیش لــەو داوایانە درێغی ناکات و هەموو بەرنامەکانیان بۆ جێبەجێ دەکات، بۆیە عەشیرەتەکە ـدزەییـ بە هەر چــوار بەرەبــاب و ناودارەکانی دەبنە خاوەن چەندان گوند و گرد و ئاو و وەزیفەش، سەبر سەبر دەگەنە ناو شارەکە.

❊❊❊

روشــدیە ئەفەندی لەو دوو ســێ ساڵە سێیەم کەسە دەبێتە قائیمقامی هەولێر، بەڵام دیارە تاقەتی نییە، دەسەڵاتی ناڕوات، پشتیوانی نییە، نە ئەو و نە ئیبراهیم سدقی بەگ پێشــوازی گەرمی لێ ناکەن. عەشــیرەتەکان، کریستیان و جووش پشتیوانییان ناکەن. زوو ئیبراهیم ئەفەندی دەربازی دەبێت، بەڵام روشــدی ئەفەندی بە بیانووی چوونە حەج و دوورکەوتنەوە لە دەســەڵاتەکە رادەکات!

❊❊❊

**٤ی جەمادی کۆتایی ١٣١٦**

**بۆ سەدارەتپەناهی**

بە مەبەســتی ئەنجامدانی فەریزەی حەج قائیمقامی قەزای هەولێر روشــدی ئەفەندی داوای مۆڵەتــی کردوە بۆ ئەمەش داواکاری پێشــکەش کردوە ناوبراو بە نووســراوی ژمارە ٥ ئەیلول ١٣٠٤ ژمارە ٨ پێشــکەش ویلایەتی موسڵ کراوە.

❊❊❊

هەموو قائیمقامەکان، سوپاکەی ناوچەکانی خۆیان دەپاراست، چەکەکان، بارود و جبەخانەکەی لەسەر قەڵاتەکان کۆکرابوونەوە، تفەنگ و سوارەکانیان نیوەی وڵاتانی ئەوروپای سارديان بڕی و داگیری دەکەن! کڵێساکانیان دەکەن بە مزگەوت و باجیان لەسەر دەکەنە ماڵ. لەگەڵ ئەوانەش سوود لە کتێب و نووسین و زانیارییەکانیشیان دەبینن.

بەڵام لەو ویلایەتە، لەو قەڵاتەوە نەیانتوانی کۆنترۆڵی چەند سوار و تفەنگ و راوەشەوی دزەییەکان رابگرن! ئەوانە ژمارەیان کەمە، لە دەشتێکی وشک و کراوەدا، بۆ بە شەو، بە رۆژیش، بۆ لە زستان و رۆژانی هەوریش، لە ساماڵیش پەلاماری دەزگاکان دەدەن، کاروانەکان دەپشکنن، رووتیان دەکەن، فەرمانبەرانی دەچنە موسڵ و بەغدا و کەرکوک رادەگرن، هەڕەشەیان لێ دەکەن، بە زمانی کوردی قسەیان لەگەڵ دەکەن، پێیان دەڵێن:

باران بۆ ئێمە دەبارێت! ئەو دەشتە بە خوێن و شەونخونی وەرگیراوە! خێر و بەرەکەتەکانیشی بۆ خۆمانە!

قائیمقام و ژەندرمەکانی، ماوەیەک بوو ئەرز لەبن پێی خۆیان و زەبری شمشێر و ئەسپەکانیان دەلەرزی، سەریان بۆ دادەنوێنن، لێیان دەترسن و داواکانیان بەزیادەوە جێبەجێ دەکەن!

❊❊❊

حاجی بەکر ئەفەندی لەسەر نەخوێندەواری و نەزانینی نووسینی نامە و شرۆڤەکردنی پەیامەکان دەگۆڕن. لە دەقی داواکە وا دەنووسن، لەبەر ئەوەی حاجی بەکری وەکیلی قائیمقامی قەزای هەولێر نەخوێندەوارە دەیگۆڕین! بەڵام من لەسەر ئەوە ناگۆڕێم!

❊❊❊

چەند رۆژێک، یان پاش ماوەیەک لە فەرمانی گۆڕینی عەبدوڵا پاشا، پاش وەرگرتنی بڕیارەکە و ساخبوونەوەی نەمانی ئەو، پاش هەفتەیەک میوانی ئاغاکانی دزەییان دەبێت. لە گوندەکان بووە. ئەوان چوار پیاوی بەدوای دەنێرن و دەڵێن:

ئاغا بۆیە خۆی نەهات، گوتوویەتی بە نەمانی پاشا لە قائیمقامیەتی چاومان بەرایی نادات، وا زوو سەر لە شار نادەین، بۆ هەموو ئیشوکارەکانمان پیاوەکانمان دەنێرین. پاشا بەرخ و ماست و پەنیرەکە وەردەگرێت، دەیانباتە ژوورەوە و دەگەڕێتەوە دیوەخان و دووبارە بەگەرمی بەخێرهاتنی پیاوەکان دەکات. یەکێکیان دەڵێت:

پاشا هاتووین لەگەڵ خۆمان بتبەین، ئەسپێکی زیادیشمان هێناوە، زینکراوە، ناڵمان کردوە، بە فێنکی دەڕۆین و ئێوارەش لەگەڵ ئاغامان مەجلیس گەرم دەبێت و بەزمی خۆش ساز دەکرێت!

عەبدوڵا پاشا، چاوی لەسەر مەرسوومەکانە، ئەوانەی بە هەر چوار دیواری دیوەخانەکەی هەڵواسراون. بیری لەسەر ئەوە بوو، هەر لەوێ بن، یان لێیان بکاتەوە. بە ژنەکەی بڵێت: خاتوون ئەوانە هەڵگرە! چیتر شانازییان پێوە ناکەم. ئەو بە داواکە و بیانووی نەهاتنی ئاغا بە خۆی بۆ بردنی پاشا و میوانداریەکە زۆر بیر ناکاتەوە. لەگەڵ ئەوان یەک ماڵە، دۆست و خزمیشە! زوو دەڵێ باشە خۆم دەپێچمەوە و قاتێکی جلی کوردی نوێم لە بێتواتە بە دەستکردی جووەکانەوە بۆ هاتووە لەبەر دەکەم، جەمەدانییەکەشم هەر دیاری ئاغایە، پار بۆی ناردبووم دەبەستم و دەڕۆین!

***

لە خانەقای نەقشبەندی ناو شار، نوێژی عەسر دەکات، پێ بەپێ لەگەڵ مەلایەک ـ زووتر بەیەکەوە سەفەر موسڵ و ورمێیان کردبوو ـ و دوو فەقێ، پاشا و پیاوەکانی ئاغا تا نزیک ئاوی میری دەڕۆن. پیادەن و زووتر پیاوەکان پێی دەڵێن پاشا سوار بە، با بڕۆین، بەڵام ئەو گوتوویەتی:

با فێنکتر بێت، هێشتا گەرمە!

بەر لەوەی بگەنە گردەکەی قاڵینج ئاغا. ئەو گردەی بەرزایی و گەورەییەکەی نەگەیشتوتە بەرزایی و گەورەیی قەڵاتەکە. بە بەرزبوونی قەڵات، ئەو گردە کۆنە پەراوێز کراوە. شوێنەوارەکانی کەوتووتە ژێر پەردوو و کەلاوە و گەردی زەمانە و سڕاونەتەوە. پاشا بە مەلا و دوو فەقێیەکە دەڵێت:

ئێوە بگەڕێنەوە و ئێمەش سوار دەبین و دەڕۆین و ئاغا چاوەڕوانمان دەکات، پێش نوێژی مەغریب بگەین، باشە.

بەر لەوەی جیاببنەوە. مەلا دوعای بۆ دەکات، سەفەرێکی خۆش و سەلامەت بکات و بەخوڵقەوە بگەڕێتەوە، چیتر بە کزی و پەریشان نەیبینێتەوە.

پیاوەکان دێمەکانیان پڕ لە ئاوە ساردەکە دەکەن. ئەسپەکە بۆ پاشا دەگرن تا سوار دەبێت. ئەویش بەر لەوەی پشت لە شارەکە و بەرەو دەشتەکە، بۆ چوونە راو و سەردانی ئاغاکان بڕوات. ئاوڕێک دەداتەوە و سەیرێکی قەڵات دەکات. بە پیاوەکان و برا و هاوسەرەکەی گوتبوو:

دەچمە ئەو دەشتە، زۆرتر لە هەفتەیەک لەوێ دەبم، تا دەگەڕێمەوە، ماڵەکە بگوازنەوە خانووەکەمان. نامەوێ چیتر لە قەڵات بژیم، ئیتر من قائیمقام نییم و ئیشم لەناو قەڵات نەماوە. لەو دەشتە خەریکی گەنم و جۆ و شینایی دەبم! ئەو سەفەر و راو و شکارم بۆیە حەز لێ بوو، دەمەوێ لەو ژیانە رابێم، بە چاو و دڵ و هەناسە و کردەوەش، واز لە پاشا و فەرمان و دەوڵەت بهێنم، سەربەرست بژیم!

***

لە رێگای گەڕانەوەیان یەکێک لە فەقێیەکان لە مەلاکە دەپرسێت:

- مامۆستا، پاشا لەسەر چ دەگۆڕن! ئەو ماوەیەکی زۆر بوو قائیمقامی هەولێر و سەرداری ناوچەکەش بوو. لە قەزاکانی تریش دەست و قسە و دەربڕینی هەبوو؟

- ئیتر سەدری ئەعزەم خۆیان دەزانن، دەیگۆڕن نایگۆڕن! خۆیان فەرمان دەردەکەن و جێبەجێی دەکەن. مەگەر خودا کەس هەیە رووبەڕوویان ببێتەوە!

- مامۆستا لەسەر دزی و حەرامخواردن بووە!؟ دەڵێن چەند ساڵێک بەر لە ئێستا قائیمقامێک بەناوی مەهدی ئەفەندی هەبووە، ئەو لەسەر دزی و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتەکەی دەگۆڕن، ئەویش وا بووە! ئەویش دز***

مامۆستا هەنگاوی رۆیشتنەکەی سووک دەکاتەوە و دەوەستێت، قسەکەی دەبڕێت و لە وەڵامی پرسیاری فەقێیەکە دەڵێت:

ئەلحەق، دوارۆژمان قەبرە، پاشا لەسەر لاملی و کەللەرەقی دەگۆڕن. ئەو پیاوێکی سەربەرز بووە، پشتگیری عەشیرەتەکانی کردوە، بۆ هەموویان باوک و کەس و سەردار بووە. لەبەر خاتری ئەوان، چەند جار چوویتە ورمێ، تەبریز و ناوبژیوانی کردوە. چاکەی زۆری بۆ باب عالی هەبووە، بەڵام دیارە هەموومان باش دەزانین، بەتایبەتی من، لەوەیان دڵنیام ئەو لەسەر داڵدەی پیاوێکی دزەییان لێی تووڕە دەبن. دووریش نییە لێی ترساون، گوتوویانە پیاوەکە لەناو هەموو خەڵکەکە، لەناو هەموو عەشیرەتەکان ناودارە، دەستی دەڕوات، بۆیە دەیگۆڕن.

دەیگۆرن نەوەک رۆژێک لەسەر ئەو قەڵاتە بەڕاستی ببێتە پاشا و یاخی بێت. ئیتر هەموو چەکدارەکان پشتیوانی دەکەن. چاکەی لەگەڵ هەمووان هەبووە. پشتی بەرنادەن! ویستوویانە زوو پێشی لێ بگرن، لە یەکەم دڵشکانی سەدر ئەعزەم، تووڕەبوونی والی موسڵ و بەغداش، بەیەکەوە گفتوگۆ دەکەن و بڕیارەکە بە ئەستنبۆل دەردەکەن. بڕیارەکە ئاسان نەبووە، ماوەیەکیش دوا دەکەوێت! بەڵام بەڕاستی لە هەژموون و ناوبانگییەکەی ترسیان هەبوو.

❋❋❋

زووتر هەمەوەندەکان، دوایی ئێزدییەکان و هەرکییەکان و بلباس و دوایی خۆشناو و دزەییەکان بەڕووی دەســەڵاتی عوسمانییەکان یاخی دەبن، دیارە نایانەوێ سەربازی بکەن، باج بدەن و داهات و دەســکەوتیان بۆ خۆیان بێت!

بــاب عالی بۆ زۆربەیان سازشــی کردوە، پارەیان بــۆ دەبڕێتەوە، نەرمی دەنوێنێت و لە دەســەڵات و ویستی ئێران دووریاندەخاتەوە.

## ٥ رەمەزان ١٢٦٩

یــەک راپــۆرت لە نەزارەتی دارایی دراوەتە ئەنجومەنــی واڵا کە داواکاری ئەنجومەنی ژمێریاری لەگەڵی هاوپێچە، لە پوختەی دارایی یەکێک لە بەگەکانی هۆزی خۆشــناو پێشەکی رایکردوە و بەپێی جێبەجێ کردنی والی شارەزوور لەلایەن جەنابی پاشاوە بە هەســتی پاراســتنەوە موحمەد بەگ لەنێوان کۆیسنجق و قەزای هەولێر نیشتەجێ بــووە، مانگانــە لە پارەی ناوخۆ چوار ســەد هەروەها بۆ موحمــەد بەگەکەی تر کە لە دوای مردنی یەحیا بەگ پێنج ســەد موچەیان بۆ بڕاوەتەوە، لەو بارەیە فەرمانی پاشــای لەســەرە. لە داواکاری ناوهاتوو روونکراوەتەوە و باسکراوە، ئەوانەی بەهۆی هەندێــک رەفتــاری خراپ کە بوێریان کردوە ئەنجامی بدەن، تا ئەو کاتە بە تێڕوانین لــە جێبەجێکردنی و بەرژەوەندی ئەو هەســتەیان ناهێڵدرێت، بەپێی ئەو نووســراوە ناوبراوان ســەرەتا موچەکەیان بۆ ببڕێتەوە. ئەو کات مانای ئەوە دەکات کە هەستی مانەوەیــان لــەلا دروســت دەبێت، لە کۆتایی هەر لە ســاڵی ٦٨ ســەرەتای تەمموز موچەی ناوبراو بە دابینکردن و وەرگرتنی بەیەکەوە بە بڕیاری پێشوو دەبێت، ئەوانە لە داهاتوودا باشتر وایە بچنە دەرسەعادەت کە کات و سەردەمی خۆی هات پێویست بــە شــاردنەوەیان ناکات و هەروەها ئاســانکاری تێــدا دەکرێت، دڵنیایــی بدرێت لە ناردنی ئەوان بۆ ئەوێ، بۆ ئەمەش والی ناوبراو بە فەرمانනامەی ســەدری ئەعزەم لە خەزینە بۆ جێبەجێکردنی لە نەزارەتی ناوبراو نووســراو نێردراوەتە ئەنجومەنی واڵا.

❋❋❋

# یەک بست لە مێژوو دوور ناکەوێتەوە

ئاشــتی خوێندنی ماســتەری تــەواو کردووە، بەڵام بــە بۆنی دەریاکانــی ناو تورکیا و نووســینی کۆنــی عوســمانی و قورســایی پــردی گەلاتای ناو ئەســتنبۆل و ســەر کەنارەکــەی هەلیــج و جەنجاڵییەکانی و منارەی کچە شــازادەکە حەیرانە. ئەو تەواو بــووە، بــەڵام پەرۆشــە و حەز دەکات بــەردەوام بێــت. دەیەوێ بەر لــەوەی بواری خوێندنی دکتۆراکەی بۆ بســازێت، دووبارە لە لق و بوار و شــوێن و ســەردەمێکی تر بخوێنێت، لەو مەیدانە زۆر دوور نەکەوێتەوە. بەڵام بۆ خوێندنەکەی کات و بەرنامەی ماوە، بۆیە بیر دەکاتەوە چۆن دووبارە زۆرتر بە ستایل و شێوازێکی تر بگاتەوە ناو مێژوو، یەک بســتیش لە مێژوو دوورنەکەوێتەوە، لە باوکی دوورنەکەوێتەوە.

***

ئەو لە قۆناخی سەرەتایی و دواییش ناوەندی بووە، هێشتا لە هەولێر حیجابی ژنان، سەرپۆشی کیژانی سەرەتایی، کابان لەبەر دەرگای ماڵان بو پێشوازی کڕینی سەوزە و وردەواڵە و داواکاری منداڵان زۆریان سەرپۆش نەبوون. ئەوەش بەشێکە لە مێژوو و یادنووســی تاک و خەڵک و شار و ئاوەدانییەکان.

ئەو باشی لەبیرە و مێژووی خوێندوە، مامۆستای مێژوو و کتێبی مێژووشی هەبووە! بەڵام لەناو کتێبەکانی خوێندنا، لە دەمی ســاردی مامۆســتاکانا، هێشــتا هەستی بە شــیرینی و بەرجەســتەیی رووداو و ناو و شــوێن و مەبەســتی مێژووەکە نەکردبوو. مێژوو لەودەمانە، کتێبێکی کۆن و مامۆستایەکی بەتەمەنی ماندووی لاوازی قژ کورت

بووە. ئەودەمانە بابەتی مێژوو لە قوتابخانەکانا، ناوێکی سەر تەختە رەشەکەی بەر لە تەقەی پێڵاوە بەرز و رەشــەکەی هاتنی مامۆســتاکە، چاودێرەکە بە تەباشیرێکی زۆر بەکارهاتووی ســپی گەچ، بەشــکۆ و شــانازی بە خەتە ناشیرینەکەی دەینووسی مێــژوو، بۆ دیارکــردن و قەبەکردنی مێژووەکەش، هێڵێکــی نیمچە کەوانەیی بەژێری دادەهێنا. بەروار و رۆژەکە بۆ خوێندکاران دیار و بەرچاو بوو، وا نووسرابوو باشیش دەخوێندرایــەوە. بابەتەکــە، مێژووەکە، کتێبەکە زۆر شــیرین و ویســتراویش نەبوو. ئەگــەر دروســت و تــەواو وەک خــۆی دۆخەکە بنووســینەوە، زۆریــش بڕوایان پێی نەدەکرد!

ئەویــش کــە دەچــووە قوتابخانەکەی نزیک ماڵەکەیان، دوو ســێ کیــژی هاوتەمەن، بەئاســانی لە شــەقامە بەرینەکە دەپەڕینەوە. شــاناز ســەمایان بە جانتا سادەکەی پشتیان دەکرد، دەستی یەکتریان توند و دڵسۆزانە دەگرت. بۆ ئەو کاروانە رۆژانەیە، بەردەوام کەزی و بســک و قردێلەکانی کردبووە دوو بەش. یەکێکیان هاتبووە ســەر ســینگی، ئەوی تریشــی لەسەر پشــتی هاتبووە خوارەوە. بەیانییان، دایکی بە شانە دارەکــەی لەنــاو فافۆنــە ئاوێکــی وەردەدا، بــۆی دادەهێنا. دایکەکــە، کیژەکەی بە ســەدریەکی رەش و قەمیســێکی ســپی و پێڵاوێکی رەش، تەنیا بۆ چوونە قوتابخانە لەپێ دەکرا، زۆر بەشــادی و ئومێدەوە بەڕێیدەکرد. ئەوەش مێژووە.

رۆژانەشــی لە باوکی وەردەگرت، جاروباریش بە بیر باوکی دەهێنایەوە، دەیگوت:

بابــە خەمــت نەبێــت، دەبمە مامۆســتای مێــژوو. مێــژوو دەناســم و دەخوێنمەوە، قوتابییانیش فێری مێژوو دەکەم!

ئەویــش لەگەڵ بەســتنی قەفە گوڵزارەکانی پشــدێنەکەی، دوایی لــە پێش ژنەکەی رادەوەســتا تا پشتی بۆ رێکبخات، پێی دەڵێت:

بڕوا دەکەم، متمانەم بە بســک و چاوت هەیە!

پیاوەکەش بەر لەوەی بچێتە دوکان و ناوبازاڕەکە، دەیبینی کیژەکەی چۆن بەزەوقەوە دەچێتە قوتابخانە. چەند جوان، جانتا ســادەکەی لە پشــتی دەکات و شــانازی بە بریقەی پێڵاوەکەی دێت و خۆی بادەدات. پیاوەکە مێشکی بەو رۆژگارەی تێدا دەژین زۆر جەنجاڵــە، تێدا ئایندە و رۆژەڤەکەی روون نییە!

❊❊❊

لــەو ســاڵانە بوو، باوکــی داوای لێ دەکات مێــژوو بخوێنێت. دیــارە داواکەی باوکی قســەیەکی گشــتی بووە. ئەو مەبەســتی نەبوو، کیژەکەی ئەوەندە پەرۆشی داواکەی باوکــی بێــت، بــە موچەی خــۆی، بە داوا و ویســتی خۆی، بکەوێتە ئــەو مەیدانە و پــەرۆش کار بــکات. زۆریــش کار بۆ ئەوە بکات تا مۆڵەتــی دەدەنێ، زۆر چاوەڕوان دەکات، تا سەرۆکایەتی زانکۆ و زووتریش بەش و کۆلێژەکەی ڕەزامەندی دەفەرموون لەســەر ئــەوەی، مۆڵەتی خوێندن بــە موچە وەربگرێت، بۆ خوێنــدن بچێتە تورکیا. کیژێک بەتەنیا سنوور ببڕێت، لەناو شارە گەورەکانی تورکیا، زانکۆ بە دوای زانکۆ، بۆ خوێندنی مێژوو ســەردانیان بکات، نامەیان بۆ بنووسێت و بەردەوامیش بپرسێت، داوا بکات!

خوێنــدن و ســەفەری ئەو بۆ خوێنــدن لە وڵاتی تورکیا، تەنیا؛ پارە و پاســپۆرت و ئارەزوو و جانتا ئامادەکردن و وەرگێڕان و پەسەندکردنی بڕوانامەکەی لە سەرۆکایەتی زانکــۆ و خوێندنــی بــاڵا و وەزارەتی دەرەوەی عێراق نەبوو. بۆ ئەو، لەبەر شــوێن و جــۆری خوێندنەکەی، دەبوایە دووبــارە ببێتەوە خوێندکارێکی ســەرەتایی، دووبارە پیتــەکان بناســێتەوە، فۆنەتیکی پیتــەکان زۆر لەبەر خۆییەوە نەرم و وریا بڵێتەوە، ســەرەتاکانی گراماتیکی زمانێکی نوێ بخوێنێــت. چونکە دەیەوێ بچێتە تورکیا، بە زمانی تورکی، بە پیتی لاتینی ماســتەر بخوێنێت. واتە دەبێ زمانەکەی پێرفێکت و بــاش و ورد، بە نووســین و خوێندنەوە و ئیدیــۆم و گراماتیکەوە بزانێت. بە هەموو کەرەســتە و زانینەوە، بچێتەوە بەردەم مامۆســتایەکی تورک، کە سیستەمێکی نوێ و جیاواز لە سیســتەمی زانکۆی سەلاحەدینی تێدا پەیڕەو دەکرێت .

❊❊❊

ئــەو پێنج ســاڵە ماســتەری وەرگرتــوە. زمانی عوســمانی باش دەزانێــت. لەو لقە، لەو زانســتە تاکە فێرخواز و زانایە. یەکەمی کوردســتانە لە ناســین و خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی زمان و ڕێنووســی عوسمانی بە پیتی عەرەبی کۆن!

لێزانانە بەردەوامە، کە دەقێک دەدۆزێتەوە. ناوەکە، ڕووداوەکە، دەزانێت شوێنەکە دروســت لەســەر قەڵاتی هەولێرە. دەخوێنێتەوە، تێــدەگات دۆکومێنتەکە باس لەناو

و ڕووداوێکی پێش دوو سـەد سـاڵ، یان زووتری دەکات. دەقەکە، گوزارشت لەناوی کەسـێک، بنەماڵەیـەک، وەزیفەیەکـی ناو هەولێر و قـەڵات دەکات. ئەو زۆر بەوردی ئیش لەسـەر نووسـینە کۆنەکە دەکات. دەیەوێ لاپەڕەیەکی تری شـار و میللەت و وڵاتەکە بنووسێتەوە. ئەو دەقانەی ئەو بەردەوام خولیا و پەریشانیان بوو، ئەوەندە کـۆن و کەڤنـار بـوون، بۆن و ڕەنگ و تامیشـیان لە مێژ بوو نەمابـوو. بەڵام لەناو دەسـتی ئەو، لەسـەر شاشەی لاپتۆپەکەی بە لڤین و ورشە بوون، زیندوو ببوونەوە، خوناویـان دەکـرد، هەڵدەپەڕین، شـادمان و دووبارە با، گەردی ئەوەندە سـاڵەیان لەسـەر لادەدەن. شـاناز و پـەرۆش سـڵاوێکی گەرمـی کوردانەیان لـێ دەکەنەوە. دەقـەکان، پیت و نووسـینە تورکییە عوسـمانییەکان، دەبنـەوە کورد و دەبنەوە بە هەولێری! ئەوانەی چەندان ساڵە بە پۆشاک و نووسین و قەڵەمی تورکیا، سەخڵەت و نائومێد مابوونەوە.

هەموو نەتەوەکان، سـەدان فێرخواز، مامۆسـتا و توێژەری زۆر هاتن و گەڕانەوە ناو دۆکومێنتـە کۆنەکانیـان، خزم و دۆسـت و هەوارەکانیان دۆزیـەوە و بژاریان دەکەن و چوارچێـوە و ناونیشـان و سـەنگیان بۆ دادەنێن. بەڵام ئەوانـە، ئەوانەی کیژەکە دەیاندۆزێتەوە، دەیانهێنێتەوە، دۆکومێنتە کوردییەکان، کوردستانییەکان، شارەکان، بێناز بوون، خەوی قورسیان لێ کەوتبوو، نەخۆشی درێژخایەنیان گرتبوو، سەرسام، ترسـاو، لە بێکەسی و پەراوێزیدا شەرمەزاریش بوون.

ئەو پارچە کاغەزانەی ئەو کیژە شـەیدایان بوو، بە حوبرێکی زۆر کۆنە نووسرابوون. دۆکومێنتەکانی هەواڵ و سـەربردەی هەولێریـان تێدا بوو، ئەوەندە کۆن بوون، بڕوا ناکرێـت چـۆن پارێـزراون و هەڵگیراون. کۆنـن و زیندەوەر و مێروولـە و مۆرانەش ئـارەزووی قرتاندنی نەکـردون. نایانەوێ کاتی خۆیانی بـۆ تەرخان بکەن. نایانەوێ ماندوو بن، بگەنە ناو لاپەڕەکان، بچنە ناو دێرەکانی نووسـین و مۆرە شـینە تەڵخە سڕبووەکان. ئەوانیش دەزانن ئەوەندە وشکن. دەزانن ئەوەندە کۆنن. تام و ڕەنگ و شـیلە و فەریکیان تێدا نەماوە، بەکەڵک قرتاندنیش نەماون!

ئـەو کیـژە، لـەو جیهانـە، لـەو ڕۆژگارە زۆر جەنجـاڵ و پەمبـە و شـیرین و دوور و نزیکـەدا. ئـەوەی هەڵیبژاردووە، ئارەزوو و ویسـتی سـۆفی و دەروێشـێکی کۆنی

مزگەوتــی شــێخەڵایە. ئــەدی ناڵێن لەبــەر حورمەتی شــێخەڵا، جــاران ژنانیش لەو مزگەوتە زیکریان کردوە. ئەوانیش کەزیان کردوتەوە، تەهلیلەیان کردوە. نووســراوە و بڕواش کراوە، کە دەڵێن لە مەجلیسی دەروێشانەی شێخ، ژنانیش بەشدار دەبوون. ئەویش بۆتەوە دەروێشــێکی کۆنی شــێخەڵا. باوکیشــی هەر لــەوێ کەچە دوکانێکی بــۆ رەزق و ژیــان ئاوا کردبــووەوە. دوایی کەچــە دوکانەکە، دەباتە نــاو یەکێک لە دوکانەکانی شــارەوانی، ئەوانەی لەتەنیشــت و بن دیوار و نزیک لە کێل و مردن و ئێسکوپروســکی ناو گۆڕستانەکە دروستی کردبوون.

***

ئاشــتی پشتی بەرز دەکاتەوە، دەســتی بۆ پیاڵە چایە ساردەکەی بەردەمی دەبات، قوومێک لە چایەکە دەدات و ســەیری چاوەکانی دەکات و ناڵێت:
دایکــە، قوربانــی لچکی کەواکەت دەبم، قوربانــی فۆتە و گوارە بە کاریتەکەت دەبم، ئــەوەی دیــاری باوکم بووەوە و تۆش بڕیارت داوە؛ بیپارێزیت، هەرگیز لە نەبوونی و گرانییەکانی ســەردەمە رەشەکانا نەیفرۆشیت! بە دەنگ و راستگۆیانە، بەڵام کەمێک بەگومان و ترساویش دەڵێت:
- دایکە، دایە «ئاشــتی بە نەرمی و ســۆزرەوە بانگی دایکی دەکات».
- ها ئاشــتی قوربان، چایەکەت دیسان ساردبۆتەوە. ئینشاڵا تەواو بوویت و دەتەوێ نانێــک بخۆیــت! «دایکــی لە مەتبەخەکەوە ســەری لێ هەڵکێشــاوە، رووی لەســەر مەنجــەڵ و مەقلییەکــە نییە، کەمێک لە ســوورکردنەوە و برژاندنی خواردنەکە دوور دەکەوێتەوە».
- ئــا دایــە تــەواو بووم، بــەڵام نامەوێ نان بخــۆم زۆر تێرم «کەمێــک دەنگی بەرز دەکاتــەوە. وا دەزانێــت وەک جــاران، دایکــی لــە ژوورێکــی ترە، ئەویــش نەک لە ژوورێکــی تــری ماڵەکەیانــە، لە جیهانێکی تریشــە، جیهانێکی کۆن و بەســەرچوو و لەبیرکراویش».
- «بەسەرســامییەوە» بە چ تێری، چیت خواردوە.
- وەڵــڵاە تێــرم، زۆریش تێرم، بەس تــۆ وەرە. خۆ ژیان تەنیا خواردن و خواردنەوە نییە، وەرە قوربانە.
«دایکی وەک ئەوەی ســەرمای بێت، چەفیەکەی ســەری توند بەســتاوە. کەوایەکی

شــین و کراســێکی تەنکــی مــۆری لەبــەرە. عەردی کراســەکەی بەری، بــە چەندان چوارگۆشــەی رەنگاورەنگ داپۆشــراوە» لێی دێتە پێش و لەسەر سەری دەوەستێت و دەڵێت:

- ئەوە هاتم چیت دەوێ؟

ئەویش رووشــیرین و زۆریش کامەران، ســەیری چاوەکانی دەکات و پێی دەڵێت:

- دایە دانیشــە، وەرە تەنیشتم، دانیشە زۆر نزیک بە، دانیشە.

- بــۆ دانیشــم چیت لە من دەمەوێ؟ دەتــەوێ وەک تۆ، بەدیار ئەو کۆنە کاغەزانەوە خەو بمباتەوە! نەخۆش بکەوم، تەنگەنەفەس و هەناسەســوار بم!

- دایە ئەوانە کۆنە کاغەز نین، ئەوانە دۆکومێنت و دەستنووســی گەورە و پیرۆزن! گرنگن، زۆریش گرنگن.

- کیــژم بۆ تۆ گرنگن! لەکن من تەنیا قورئان پیرۆزە!

- دایکە، لەکن منیش قورئان پیرۆزە، بەڵام نا دایە بۆ هەموو هەولێر و کوردستانیش ئەوانــە گرنگ و پیرۆزن، بۆ تۆش هەر پیرۆزن!

- وەڵڵاهـ کیژم هەر لەکن تۆ و دکتۆر نەوزاد گرنگە! ئەگەرنا کەس قیمەتی نازانێت، بەس ئێوە بۆی شــێت و شەیدا بووینە.

دایە واز لەو قسە و ترسانە بێنە. من ئەوە دەخوێنمەوە، ئەو دەقە، ئەو دۆکومێنتە دەخوێنمەوە تۆ دانیشە، گوێ بگرە، بێدەنگ و بیری لێ بکەرەوە، هەناسەت راگرە، ســەیری لاپەڕەکــە بکە، گوێ لە دەنگــم بگرە، من دەخوێنمەوە و ســەیرت دەکەم. دەخوێنمەوە و هەســتت لێ رادەگرم! سەرسام و بێهۆش ئەوە دەخوێنمەوە.

- بیســمیلا دیارە شێت بوویت، کیژم قسەی بێ سەروبەر دەکەیت.

- دایە گیان، گوێ بگرە، کە سەرم هەڵبڕی سەیری ناو چاوەکانم بکە، منیش سەیری ناو چاوەکانت دەکەم، کە بەقەد قەڵاتی هەولێرێ خۆشــمدەوێن!

- دیســان بیسمیلا، کیژم ئەوە ...

- ســەد جار بیسمیلا، گوێ بگرە.

**٢٩ی زی ئەلحیجە ١١٢٦**

**ئەرکی دزداری لە قەڵاتی هەولێر ســەر بە ئاڵەیەتی شارەزوور**

یوسف ڕۆژانە بە سێ ئاقچە لە قەڵاتی ناوبراو ئەرکی دزداری کردوە، کۆتایی بە ئەرکەکەی هاتووە، لە شوێن ئەو عومەر دەست بە ئەرکەکەی دەکات، هەروەها پارێزگاری شارەزوور یوسف پاشا داوای کردوە، عومەر لەو کارە دەست بەکار بێت، بۆیە لەگەڵ ئەوەی داواکراوە حەسەن ئەم کارەی پێ بسپێردرێت، بەڵام وا باشترە عومەر وەلەدەش بە سێ ئاقچە لەم کارە دەست بەکاربێت.

***

کیژەکە لە خوێندنەوەی دەقەکە دەبێتەوە، تەواو دەبێت، سەرکەش و کەمێکیش نیگەران و قسە ناکات، هیچ لە دایکی ناپرسێت. خوێندنەوەی دەقەکەی بۆ مەبەست و ئامانجێک بوو، بۆیە دووبارە دەقەکە بۆ دایکی دەخوێنێتەوە. دەقەکە زۆر درێژ نەبوو، ئاڵۆز و بە پێچ و پەناش نەبوو. بە کوردییەکی ڕەوانیش بوو. ئەو دەقە تورکییەکەی تازە کردبووە کوردی! چەند سەعاتێک دەبوو، دووریش نییە چەند ڕۆژیش سەرقاڵی وەرگێڕانەکەی بووە، بە ساخکردنەوەی ناوەکان ماندووش بووە!
کیژەکە، دووبارە دەقەکە بۆ دایکی دەخوێنێتەوە. وشەکان، ڕستەکان، دڵۆپ دڵۆپ؛ وەک بارانێکی نەرم و شیرین، بەر پەیکەر و بەر دەرگا و قەدی دارێک بکەوێت، ترپە و بارینەکە ئەوەندە نەرم بێت، توانای کاردانەوە و داشۆرینیشی نەبێت.
دایکیشی وەک بتێکی سپی لەودەمانە سپی دەردەکەوت، ئەگەر مرۆڤ شادمان بێت، لە ڕەوش و کەس و نیگایەکی شیرین نزیک و هاوشان بێت، سپی دەبینرێت ناو نافوورەیەکی سەر شەقامێکی سەرەکی پایتەختێکی بەختەوەر. ناوەندی مەیدانێکی مەلەوانی لەناو گۆمێکی بازنەیی. ئاوەکەی گەمە بە ژمارەیەک مراوی بکات، ئاوەکەی شەپۆلە وردەکەی وەک مێژوو وەستانی نەبێت، دایکی وا دەردەکەوت. دایکی وەک مۆمی سەر مێزێکی گەورەی داری گرانبەها، هەرگیز بیری لێ نەکرابێتەوە، مۆمەکە بۆ سوتاندن و گەرمکردنەوە و ڕووناکی بە تروسکایی ئاگرێک دابگیرسێت، وا دەردەکەوت. دایکی وەک چرایەک، جاروبار گەش و ڕووناکییەکی نەرم بنووێنێت، وا دەبینرێت و لەتەنیشتی دانیشتوە. دایکی لەبەر دڵسۆزی و خۆشەویستی کیژەکەی وەک بەرد دانیشتوە، هەردوو پێیەکانی لەبن کراسە درێژەکەی شاردوتەوە. دەست و مەچەک و قۆڵی لەناو کراس و کەواکەی داپۆشیوە، وەک ئەوەی نوێژ بکات

دانیشــتوە. ئەو لــە منداڵییەوە هەموو نوێژەکانی کردوە، یــەک ڕەکعەتیش قەرزاری خــودا نییــە، بۆیــە ئەو ڕامانــەی بۆ نوێژکردن نەبــوو، بۆ ئەوەی بــوو، مێژووەکەی کیژەکەی سەرگەردان کردوە، بناسێت.

ژنەکــە دەنگــی نەدەهــات، نەدەســووتا، نەدەجووڵا، گــوێ لە قســەکانی کچەکەی دەگرێــت. ئەویــش، کە دەزانێت ســەرنجی دایکی، کەســەکەی بەرامبەری ــلەبیری نامینێــت، ئــەوەی بەرامبــەری دانیشــتووە دایکیەتــی، چونکە هەرگیــز دایکی وەک قوتابییەک ڕووبەڕوو بەرامبەری دانەنیشــتووە. ئەو دەقە کۆنە بۆ؛ شارێک بە هەموو بنەماڵــە و عەشــیرەت و ناوەکانــەوە دەخوێنێتەوە، ماوەماوە لەگــەڵ خوێندنەوەی دەقەکــە ســەیری دەموچاوی، بەتایبەتــی ناو چاوەکانی دایکــی دەکات. بە جۆرێک هەرگیــز وا ســەیری چاوەکانــی دایکــی نەکردبێــت. وا ســەیری دەکات، نــەک ئەو، هیــچ کیژێک بەو جۆرە، بەو نیگایە ســەیری دەموچــاوی دایکی نەکردبێت. نیگاکەی ئاشــتی، دوور و زۆر جیاواز لە نیگا و ئەرکی چاو و ســەیرکردنی ئاسایی بینین بوو. سەیری دەکرد و پرسیاری نەبوو، داوای هیچی نەدەکرد، ڕازێکی نەبوو، شەرم بکات و نەیەوێ بیدرکێنێت، شــەرم بکات و نەتوانێت ئاشــکرای بکات. بەڵام هەردوو چاوە بــە خومارەکانی تیشــکێکی تایبەتییان بۆ کەســەکەی بەرامبەری، بــەڵام ئاوێتە بە خەیاڵ دەنارد.

- کیژم بۆ وا سەیری ناو چاوەکانم دەکەیت! «دایکەکە سەرسام، بەڵام تووڕە نەبوو پێی دەڵێت».

«هــەر ســەیری دەکات و وەڵامــی دایکی ناداتەوە. ئــەوە یەکەمجارە ئەو یەکســەر وەڵامی ڕاز و پرســیارێکی دایکی نەداتەوە. زوو پێش دەنگەکە، پێش پرســیارەکە، ئەو وەڵام و وەســتان و هاتن و دەرچوون و گەڕانەوەی بۆ دایکی بەپەلە و یەکســەر و پیرۆزیش بووە».

چاوەکانــی کیژەکــە، دەقەکــەی بــە دڵســۆزی و ورد دەخوێندەوە. دەبوایە ســەبر و لەســەرخۆ بیخوێنێتــەوە، چونکــە بــۆ ژنێکــی دەخوێنــدەوە، هەرگیــز شــتی بۆ نەخوێندیتــەوە. ئــەوەی بەرامبەری قوتابی بەشــی مێژوو نەبــوو، ئەوەی بەرامبەری کیژێــک یــان کوڕێکی ناو کۆلێژەکەی نەبوو، بۆ ئەوەشــی نەبوو تــا تێبینی و وردە

سـەرنج بخاتە سەر راپۆرتی دەرچوونی دوا ساڵی خوێندنەکەی.
رامانەکە سـۆز و پرسـیاری زۆری لەگەڵدا بوو. دەیویست بەو نیگایە، وەک ئێکس و توێژینەوەی کیمیایی، شـتێ، هێمایەک لە ئاکار و دەموچاوی دایکی بدۆزێتەوە! ئەو تەنیـا دۆکومێنت و دەقێکی کۆنی عوسـمانی نەدەخوێنـدەوە، دەقێکی دەخوێندەوە چەندان سـاڵ بوو بە زمانی تورکی نووسـرابوو. هەرگیزیش بڕوا نەدەکرا، ئەو دەقە بکرێتە کوردی و لەناو شـاری هەولێر، وەک چۆن ناو و رووداوەکە لە هەولێر بووە، کیژێک چەند رۆژ سەرقاڵی لێکدانەوە و توێژینەوەی بووە، بخوێندرێتەوە. پرۆسەکە، خوێندنەوەیـەک بوو، تایبەت، بۆ مەبەسـتێکی رۆحی، خوێندنـەوەی مێژوونووس و دۆکومێنتناسـێک نەبـوو، خوێندنەوەیەکی زۆر تایبەتی بـوو. کیژەکە دەیخوێندەوە، بـە قوڵـی دەچێتە ناخـی دەقەکـە. ئەوەنـدە دۆکومێنتەکەی خۆشـدەوێت، لەگەڵ خوێندنەوەکە رەنگی دەگۆڕێت. سـۆمای چاوەکانی دەگۆڕێت. دەسـت و پەنجەکانی دەلەرزین. هەستی بە ئاسوودەیەک دەکرد ـدایکی ئەو ئامآژانەی لێوە دەبینی، بەڵام نەیدەزانی پەسـنی بکاتـ هەرگیز وا ئاسـوودە نەبێت. ئەوەندەی لە بواری وانەبێژی دەرسـی خوێندوە، دەرسـی گوتووتەوە، لەبەردەم مامۆسـتایانی زانکۆ وەستاوە، لە سـیمینارەکان بەشـدار بووە، ئەوەندە بەسـۆز نەبـووە، ئەوەندە مەبەسـتی نەبوو، هەسـتێکی تایبەتی هەبووە هەر باس ناکرێت.

❊❊❊

کیژەکـە دەقەکە دەخوێنێتەوە، کە دەگاتە سـەر ناوی «عومەر»، ئەوەی شانسـی بەهێـزی هەبـووە و بـووە بـە دزداری قەڵاتی هەولێر. ئەگەرچی یوسـف پاشـا لە شـارەزوورەوە داوایکردوە، لەجیاتی «یوسـف» کە ئەرکەکەی تەواو بووە، کەسێک بەناوی «حەسەن» دابنێن، بەڵام حەسەن شانسی پۆستەکەی نابێت و دانامەزرێت. لەگـەڵ ناوهێنانـی هەردوو ناوەکە، عومەر و حەسـەن، زووتریش لەگـەڵ ناوهێنانی کۆنە دزدارەکەی قەڵات. ئاشـتی سـەیری ناو چاوەکانی دایکی دەکات. چاو دەبڕێتە ناو چاوە خەواڵووەکانی، سـەیری روومەتی دەکات. دەیەوێ بزانێت دەسـتی دایکی لەرزەیەک دەکات. پەرۆشـە، دەیـەوێ تێبگات رووی دایکـی، روومەتە ماندووەکەی دەگۆڕێت. زمانی، گوێیەکانی قاچێکی بە هەستێکی نامۆ دەتریوێنێت. بەو ناوهێنانە

لـە ئاکاری دایکی ئەوە دەخوێنێتەوە. ئەو ژنە، دایکی کە لە بەرامبەری دانیشـتوە، گـوێ لـە فەرمـان و بڕیارەکە دەگرێـت، چەند نـاوی خەڵکی قەڵاتـی هەولێری بۆ دەخوێنێتەوە، هیچ کام لەو سێ کەسە، یوسف و عومەر و حەسەن باپیرەی گەورەی ئەو نەبوون.
ئەوانـە پێش ٢١٤ سـاڵ فەرمانیان بۆ دەرچـووە. یەکێکیان باپیـرەی گەورەی ئەو نەبووە. بەناوهێنانی ئەوانە، چاوەکانی بروسکەیەکی سۆزی نەکرد. دەستی نەلەرزی، پەنجەکانـی لەمێـژە خەنەی لێ نەناوە خشـەیەکی لێوە نەهات، نەرم نەرم نەجووڵا، نەتەقینەوە، گەرم دانەهاتن. سـۆزی بەیەک لە ناوەکان کەمێک نەجووڵا. دوور نییە یەکێـک لەوانە بابە گـەورەی بنەماڵەکەیان بووبێت! ئەو گومـان لەوە دەکات، بۆیە ناوەکانـی بۆ دەخوێنێتەوە و بۆی دووبارە دەکاتەوە.
دەقەکـە دەخوێنێتــەوە و دایکی باش گوێی لێ دەگرێت، کە تەواو دەبێت سـەرێکی سەرسـامی بۆ بادەدات، بەڵام پێی ناڵێت کیژەکەم بە خوا زۆر تەواو نیت! باشـە بۆ منـت بەدیـار خۆتەوە داناوە، بڕۆ ئەوانە بۆ دکتۆر نەوزاد بخوێنەوە، ئەو کەیفی بەو کارەی تۆ دێت. ئەو چاوەڕوانت دەکات!
کیژەکـە سـەری بەرز دەکاتــەوە، دووبارە و زۆر بە وردی سـەیری چاوەکانی دایکی دەکاتەوە و دەپرسێت:
- دایە گیان بە قوربانت دەبم، بەناوهێنانی ئەو ناوانە، هیچ هەسـتێکت نەجووڵا؟
- کیژم هەسـتی چی، ناوی چی! کەی من هەسـتم جووڵاوە. باسی چ دەکەیت!
- ناوەکانـی خوێندمــەوە، ناوەکانت لەبیر ماوە!؟ «کیژەکە دوو بسـتی تر لە کەوا و هەناسە و دڵی دایکی دەچێتە پێشەوە. رانی دەگاتە سەر کەواکەی. دەستی لەسەر دەسـتی دادەنێت. چاوی لە هەردوو چاوە ماندووەکانی دایکی بڕیوە».
- ئا کیژم! «دایکەکە دەیەوێ هەڵبسـتێتەوە و بگاتەوە ئاگر و مەنجەڵ و گۆشـت و ئاو و روونەکەی، بە دەست و کردەوە و هەڵسوکەوتە نامۆکەی کیژەکەی شیوەکەی نەسوتێت، یان بێ تام دەرنەچێت».
- کوا بزانم چ بوون؟ «کیژەکە سـەرکەش و کەیفسـازە، روون و دووبارە لە دایکی دەپرسێتەوە».

- سێ ناوی پیاوانەت هێنا، ناوی یوسف و عومەر و حەسەنت هێنا. کیژم من گوێ لە هەموو قسەکانی تۆ دەگرم، چاوەڕوانی قسەکانت دەکەم، دەمەوێ قسەیەک بکەیت دڵم ئاسوودە بکات، دەمەوێ قسەی دڵی من بکەیت! چۆن قسەکانی تۆ بە جوانی وەرناگرم، هەموو قسەکانی تۆ دەچێتە ناو دڵ و هەناسەم. «کەمێک ڕەنگی دەگۆڕێت و چاوەکانی تەڕ دەبن، یان دەبنە پارچەیەک شووشە، بە ئاوەکە شەوق دەدەنەوە، بەڵام نایەوێ بگرێت».

- جارێ واز لەو قسانە بێنە، باسی ناوەکان دەکەم، هیچ بەو ناوانە هەستت نەجووڵا!؟

- کیژم دیارە تێکچوویت، ئەو قسانە لەکن هەموو کەس مەکە، دوایی بە شێت ناوت دەبەن. من ناوی پیاوان، پیاوی بێگانە چۆن هەستم دەجووڵێنێت، چۆن هەی شێتە! باوکت نەبێت! تەنیا بۆ ئەو بووە!

- دایکە من شێتی ئەو کۆنە کاغەز و دۆکومێنتانەم، دەزانم تۆ ناوی پیاوی بێگانە هەستت ناجووڵێنێت، بۆیە دەپرسم هەستت بەناوەکان جووڵا!؟

- نا کیژم، هیچ نەجووڵا و هەرگیزیش هەستم بەناوی هیچ پیاوێک ناجووڵێت، بەڵام با بزانم تۆ تا کەی وا شەیدای ئەو کۆنە کاغەز و قسانە دەبیت!؟ کەی بەسە، خەمێک لە خۆت بخۆ، «دایکەکە هەست دەکات، بوارەکە سازە قسە و ڕازەکانی دیسان بدرکێنێت» با دڵم ئیسراحەت بکات، تۆم ماوە، تۆش بەڕێبکەم، کەلەکەم دەکەوێتە عەردی و ئیسراحەت دەکەم.

- ئەو مەراق و داوایەی تۆ زۆر دەخایەنێت، زۆرم ماوە، دەزانی زۆرتر لە یەک ملیۆن دۆکومێنت هەیە، ڕەنگە من ئیشم پێیان هەبێت!

***

یەک ملیۆن دۆکومێنتی کۆنی عوسمانی و بە ڕێنووسی کۆن، بەقەد هەرەمێکی ناو قاهیرە و جیزە گرانتر و گەورەترە! هەرەمێک، بە دەسەڵات و جەبەرووتی فەرعونەکان تەواو بووە، بڵند بووە، بووە بە شاناز، بەڵام هەرەمێک لە کۆنە دۆکومێنت؛ چۆن و کەی! بە دەست و چاو و شەو و ڕۆژی یەک فێرخواز و پسپۆڕێک تەواو دەبێت! دەخوێندرێتەوە، کۆدەکان دەکرێنەوە، ناوەکان دەناسرێنەوە! تەمەن

و دڵێکــی پۆلاینــی دەوێت! کەس ناوێرێــت بە دایکی کچەکە بڵێــت، کیژەکەت دڵی پۆڵایە، چونکە دەترســێت، نائومێد دەبێت، دوو یان چەندان دڵۆپە فرمێســکی گەرم و زیوین بۆ بەختی و چارەنووســی کیژەکەی دەڕێژێت.

***

کە هەست دەکات دایکی بە خوێندنەوەی بەڵگەنامەکە، هیچ ئاکاری ناگۆڕێت و دڵنیا دەبێت، ئەوانە کەســیان بابە گەورەی دایکی نین. ئەو کەســانی دزدار، باڵادەســت بووینە، ئەگەر پێش دوو ســەد و دە ســاڵ باپیرەی دزداری قەڵاتی هەولێر بووبێت. ئەوەندە ســاڵە موچەخۆر بووبێت، بێگومان لە خوارەوە موڵکی دەبوو، لە گوندێک، لــە دەرەوەی شــار باخچەیــەک، کانییــەک، جۆگە ئاوێکــی بەناو دەبــوو. موڵکێکی بەنــاو دەبــوو، دیارییەکــی لە والیــەوە وەردەگــرت، بەوەیان دەزانێت کەســیان لەو ناوانە باپیرەی گەورەی ئەو نین. کە لەناو هەولێر و دەرەوەی شــاری هیچ موڵک و سامانێکیان نەبووە.

دڵنیــا دەبێــت و دەزانێت کە دەقەکە دەخوێنێتــەوە، هیچ گۆڕانێک لە ئاکاری دایکی نابینێــت! ئیتــر ژنەکە لەتەنیشــتی هەڵدەســتێت، دەچێتەوە ناندینەکــەی پەنجەرە گەورەکــەی دەیڕوانییــە باخچــە بچووکەکەیان، تــازە گوڵە نازنازەکــەی نێوان ریزە کەرپووچەکەی لاتیوو راگیرابوو، لەگەڵ کاشــی گەراجەکە، وردە گوڵیان دەرکردبوو، رەنگی نەرمیان راگرتبوو، بە شــنەی بایەکیش سووکە سەمایەکیشیان دەکرد، ئینجا ســەماکە بۆ رازی کیژەکە بوو، یان بۆ هەناســەی گەرمی دایکی بوو. گوڵەکان نەرم و ورد وەک مێشــهەنگوێن، وەک پەپولــە دەردەکەوتــن، بۆیە ئەوانە زوو زوو و نەرم بە قاچە باریک و باڵە رەنگینەکانیان لەســەریان دەنیشــن. قسە و رازی خزمایەتی و ناســین و مژین و ماچەکانیان دەکرد و باڵدار دەڕۆیشتن.

***

کیژەکە بەنیاز بوو ئەو دۆکومێنتەش بۆ دایکی بخوێنێتەوە و بپرســێت ناوەکانی ناو دەقەکە هەســتی ناجووڵێنێت، بەڵام نایخوێنێتەوە، بەڵام خۆی نەرم و لەسەرخۆ دوا وردبینی بۆ دەکات و دەینووســێتەوە و دواجاریش لەبەر خۆی دەیخوێنێتەوە؛

لەنێوان ئالتون کۆپری و سەنجەقی هەولێر رووبەرێکی دوور هەیە لە بەیەکتر ناگەن،

ئەوانەی لەو ڕێگایە هاتوچۆ دەکەن تووشی زەحمەتی دەبن، بۆ ئەو مەبەستە تاتاری والی بەغدا سولێمان پاشا، بەناوی سادق بە پارەی خۆی بیرێکی لەو ڕێگایە لێ داوە، بۆ ئەوەی ئەوانەی لەو ڕێگایە هاتوچۆ دەکەن لەو بیرە ئاو بخۆنەوە، بەو ڕێگایە خێر و سەدەقەی بۆ دەنووسرێت، لە ئەنجام بە مەبەستی پارێزگاریکردن و ئاگاداربوون لەو بیرە ئاوییە، داواکراوە لە دانیشتوانی هەولێر محمد و یوسف و حەسەن لەسەر ئەو بیرە دابمەزرێن، هەر خۆیان بێ ئەوەی بەرائەتی شەریفەیان هەبێت ئاگاداری ئەم بیرەن. بۆ ئەو مەبەستە داوا دەکرێت فەرمانی شەریفەیان پێ بدرێت.

**٢٩ جەمادی کۆتایی ١١٦٣**

❊❊❊

سادق، ئەو پیاوەی ماوەیەک لە یەکێک لە ویلایەتەکان سەرباز بووە. دەیانگوت زۆر گەڕاوە، ماوەیەکیش لەناو بەلەمەکان سەولّی لێداوە، بەناو دەریاش زۆر وڵاتی کردوە. لە ڕێگای گەڕانەوەی، دیاریش نییە چۆن لەناو سوپا و لەگەڵ پەلاماردان و شەپۆلی دەریا و باری گرانی سەرشان دەربازی بووە و گەڕاوەتەوە. ئەو هاتۆتەوە، بەڵام ماوەیەک لە بەغدا دەمینێتەوە، زمانی زانیوە، کەمێک خوێندەواری پەیداکردوە، وڵاتی زۆری دیوە! ناو و لێهاتووەکەی دەگاتە والی بەغدا. لەوێ سولێمان پاشا وەک پیاوێکی دڵسۆز و بەوەج لەلای خۆی دەیهێڵێتەوە، ئەو داوا دەکات بگەڕێتەوە، بچێتەوە گوند و هەوارەکەی، بەڵام دڵیشی لە بەغدا هەڵناقەنێت!

لەو هاتوچۆنەدا، دەبێتە تەرتەر! نامەی پڕ لە نهێنی، داوای بلەز، راسپاردەی ترسناک، گلەیی زۆر، هەڕەشەی توند، داوای پارە و موچە، داوای کوشتن و گرتن و زانیارییەکان دەبات و دێنێتەوە. بڕوای پێ دەکەن نامە تایبەتییەکانی تێدا دەیانەوێ بزانن لەناو وڵاتی ئێران چ ڕوودەدات. ئەوانەی پرسیارن و دەیانەوێ بیکەن، بڵێن باجەکان بۆ کەم دەنێرن. ئەوانەی فەرمانن، داوا دەکەن یەکێک بگوازنەوە و بیگۆڕن و سزای بدەن. تەتەر و دەستپاکی ئەوانە بووە.

❊❊❊

کیژەکە لاپتۆپەکەی دەکوژێنێتەوە، کاغەز و کتێب و قەڵەم و هاوێنەی گەورەکردن

و فەرهەنگە عوسمانییە تورکییەکە دەپێچێتەوە، دەچێتە ژوورەکەی خۆی دەگۆڕێت، چونکــە دەزانێت کاتی ئــەوە هاتووە، براکەی بگەڕێتــەوە و بیباتە دەوامی ئێوارانی زانکۆ. لە ژوورەکەی خۆی، لە نهۆمی ســەرەوەش دەنگی دەهات و دەیگوت:

- دایــە کە ئەو هاتەوە بڵێ وا هاتم، ئامادەم!

- باشــە بە قوربان، زۆری نەماوە بێتەوە.

دایکــی دەڕوات و دەگاتــەوە ســەر تەبــاخ و مەنجــەڵ و قاپ و ســەوزە و برنجە لە ئاوکراوەکەی ناو مەنجەڵە تیڤالە ســوورەکەی. دەســت دەداتەوە کەوچک و کەوگیرە دارەکەی. بەڵام داواکەی کیژەکەی، ناوی سێ پیاوەکە، ماوەیەکی باش لە مێشک و خەیاڵی دەمینێتەوە، تۆڕی بیری بەرنادەن.

ژنەکــە برنجەکە دەکوڵێنێت و بیر لــەو ناوانە دەکاتەوە. برنجەکە تەواو دەبێت، ئەو نازانیــت و ناتوانێــت کەس لەوانە بناســێت و بزانێت ئەوانــە بابە گەورەی کێن! کام لــە بنەماڵەکانــی ناو قــەڵات، ماڵە کۆنــەکان، ئەوانەی خانوویان لەســەر بەدەنەکە بــووە، لەنزیــک حەمام و مزگەوتەکە بووە! لەگەڵ بیرکردنەوە، بە کەفە ســپییەکەی ســەر مەنجەڵەکە خوێی بەبیردێتەوە! دوو ســەرە کەوچک خوێ لە شــێوەکە دەکات و دایدەپۆشێتەوە، بەڵام سەری بابەتەکە، ناسینی ناوی سێ کەسەکە، ئەوانەی زوو لــە قەڵاتــی هەولێر بەرپرس بوون، داناخات. لەناوەوە هەر دەکوڵێت و برنجەکەشــی ئاوی کەم دەکات و ئاوی تری تێدەکاتەوە! ئاوە گەرمەکە لەســەر برنجەکە دەکات، یان لە بابەتەکە!؟

***

ئاشــتی لە ژوورەکەی خۆی و بەدیار دۆکومێنتەکانەوە بیر لەوە دەکاتەوە، باشــە بۆ دایکم من بە شــێت دەزانێت! بۆچی رامان و رازەکەم ســەیر و دوورە لە راستی؟ من باسی قەڵاتی هەولێر و دانیشتوانی پێش ٢١٤ ساڵ دەکەم. سێ ناوم بۆی ژماردوە. ســێ ناوم بەبیر هێناوەتەوە. ناوەکان دروســتن، لە بەڵگەنامەکە نووســراوە، لەبەر ئەوەی دامەزراندن و پارە و موچەیان هەبووە، بۆیە هیچ گومان لە راستی ناوەکاندا نییــە. ئێ خۆ ئەودەمانە، ســەرژمێری قەڵاتیــش ئەوەندە زۆر نەبووە، تا ناوەکان بۆ دایکم زۆر نامۆ و ســەیر بێت.

بەپێی تۆماری ناو سـالنامەی عوسـمانی ویلایەتی موسڵ، پێش ١٢٥ ساڵ، دروست لە ساڵی ١٨٩٤ی زایینی ژمارەی دانیشتوانی هەولێر ٧٥٩٠ کەس بووە، بۆیە ئاساییە پێش ٢١٤ سـاڵ سـەرژمێری هەولێر نزیکەی چوار پێنج هەزار کەس بووبێت. لەوانە هەندێکیان لە خوارەوە و زۆریان لە گوندەکان، کە ژمارەیان سـێ سـەد گوند و دوو ناحیە بووە، ژیاون. بۆیە دوور نییە، ئەو سێ ناوە، ئەوانەی لە بەڵگەنامەکە ناویان هاتووە، عومەر و شـەریف و حەسەنەکە. یەکێکیان دوور نییە باپیرە گەورەی دایکم بێت. چونکە دایکم و خاڵەکانم و باپیریشـم، باوکی دایکم گوتوویەتی:

ئێمە چەند پشـتمان لەو قەڵاتە بڕاوەتەوە. هەموومان لە قەڵات لەدایکبووین، گەورە بـوون و مردووەکانمان لەوێ مردوون، بەڵام لە خوارەوە نێژراون.

هەمـوو مردووەکانی ئەو قەڵاتـە لە خوارەوە، لە گۆڕسـتانە زۆرەکانی چواردەورەی قـەڵات نێـژراون. گۆڕسـتانی ئیمـام موحمەد و چراخ و شـێخ ئۆمـەر و ئەوانی تر. شـارەکە جاران گۆڕسـتان رووبەرێکی گەورەی لێ داگیر کردبوو. لە کۆنەوە، سەدان سـاڵە، ژیانی تێدا بووەوە، بۆیەش مردنی زۆر بووەوە، چەند هەناسـەی ژیانی تێدا هەڵکێشـراوە، ئەوەندەش رۆح تێدا هەڵکێشراوە!

ئاشـتی لە دایکی دڵنیا دەبێت، ناوەکان کەسـی ئەو نەبووینە، بۆیە دووبارە دەقەکە پاکنـووس دەکاتـەوە، دەیکاتە لاپەڕەیەکـی وەرگێڕدراوی دۆکومێنتـەکان، تا ببنە بەشـێک لە کتێبەکەی هەولێر لە بەڵگەنامەکانی عوسـمانیدا نێوان ساڵانی ١٦٦٧ تا ١٩٢٠ی زایینی.

***

ئاشتی بەوەی دایکی ناوەکانی ناو دۆکومێنتەکان ناناسێت، دڵگران نابێت و ساردیش نابێتـەوە، چونکە بەڵگەنامەکان بڕواپێکراون، زانا و مێژوونووسـانی هەموو جیهان، فێرخـوازان وەک سـەرچاوەیەکی گرنگ کاری لەناو دەکەن. ئەویش وەک شـارەزا و پسـپۆڕێکی ئـەو بوارە، لەسـەر داوای زانکۆی جیهان لە هەولێر ئـەو کارە دەکات. دۆکومێنتەکانی تایبەتن بە کوردسـتان دەدۆزێتەوە. ژمارەیان دەنووسـێتەوە، جوان سـەیریان دەکات و دڵنیا دەبێت، لەوەی بەڵگەنامەکان تایبەتن بە کوردستان. بەناو و رووداو و مێژووەکانیـان دیـار و روونە، بۆیە لەسـەر کارەکانی بەردەوام دەبێت و

سارد نابێتەوە. بۆ سارد ببێتەوە؟ هەموو میللەتان بەشی خۆیان لەو ئەرشیفە بردوە، ئەویش وا دەزگایەکی زانستی پشتیوانی دەکات و دڵسۆزانە خەمی بۆ دەخوات.

***

دایکە قەڵاتییەکەم، بەو نامەیەش، کە دوایی بیر دەکەمەوە بۆی بخوێنمەوە، دڵنیام هەستی ناجووڵێت. باپیرە گەورەی ئەو ناوی وەلی، یان کوڕەکەی ناوی موحەمەدیش نەبووە.
کیژەکە ئەگەر دەقەکەشی وەک جاری پێشی بۆ بخوێنێتەوە، دایکی بە ناوەکان ناوروژێت و کەسیان ناناسێتەوە. ئەو لەوەش تەواو دەبێت و نامەکە تەواو دەکات، بەڵام دوورە و لەماڵەوە نییە، تا سەیری دایکی بکات، ورد و جوانیش دیقەت بداتە ئاکار و رەنگ و جووڵەی پەنجەکانی! بزانێت بەو دوو ناوەش ناوروژێت و نایانناسێت!

**٩ موحەرەم ١٠٧٨**

بۆ جەنابی سوڵتانی میهربانم سەلامەت بێت لە داواکاری بەندەتان هاتووە، لە ئەیالەتی شارەزوور دزداری قەڵاتی هەولێر وەلی باوکی منە، بەم دواییە لە خزمەتەکەیدا کاری باشی ئەنجام نەداوە، بۆیە کاری ئەو دزدارییە بدرێتە بەندەتان، تکا دەکەم وەکو سەدەقە و ئیحسان مەرام دەکەم، داواکاریم داوە، ئەو فەرمانەی ماوەتەوە بۆ جەنابی سوڵتانمە.
بەندە محەمەد

دایکی کیژەکە ئەوانە ناناسێت، هیچ لەوانە باپیرە گەورەی ئەو نەبوون! سێ کەسەکەی پۆستەکە وەردەگرن و دەگۆڕنەوە. یان ئەو کوڕ و باوکەی لەسەر پۆستەکە شەڕیانە. کوڕ باوکی شەرمەزار دەکات، باوکی بە ناپەسەند ناو دەبات، تا ئەو ببێتە دزداری قەڵاتەکە! ئەوانەش باپیرە گەورەی ئەو نەبوون.
ئەوە پۆستی دزداری قەڵاتی هەولێرە، کە دایکی سێ ناوەکەی نەناسی ئەوانەی

پۆســتەکە وەردەگرن و دەگۆڕنەوە. دایکی نازانێت و هەســت بەوە ناکات کەســیان باپیــرە گــەورەی ئــەو بێت، ئەگەرچی باوکی زۆر شــانازی بە قەڵاتــی خۆی کردوە، زۆریش بە کیژەکەی دەڵیت، «ئەو کیژەی دەبێتە دایکی ئاشــتی»:

کیــژم، هەمــوو کــوڕان و پیاوانی ئەو شــارە داوات بکەن، ئەگــەر قەڵاتی نەبن، من نەتدام! چۆن کیژی خۆم دەدەمە کوڕێک لەســەر قەڵات لەدایک نەبووبێت، باوکیشی لە قەڵات لەدایک نەبووبێت، کیژە قەڵاتی، شایســتەی کوڕە قەڵاتییەکانە!

تا کیژەکە پارچەڵە بووە، بە نازەوە باوکی مەرجی بۆ دانەوە، دایکیشــی بەو داوا و ئاواتانەوە هەڵیپەڕاندوە! گەورەی کردوە، جلی ناســک وەک باڵی مێشی بۆ کردوە و بووکی ســادەی بۆ داناوە. گوتوویەتی کیژە قەڵاتی بۆ کوڕە قەڵاتی!

***

پیاوەکــەی کیژەکــەی بــۆ دڵ و چاو و هەناســەی قەڵاتییەکە دانابــوو، دوایی لەناو یەکێــک لە زیندانەکانی باشــووری عێراق «جاران دەســەڵاتدارانی حکومەتی عێراقی و زووتریش پاشــایەتی، تا زۆرتر ئازاری سیاســییە کوردەکان بدەن، لە شــارەکانی باشــوور زیندانیــان دەکــردن. تــا بیابــان و گەرمــا و دووری، زۆرتر لە سیســتەمی زینــدان و زۆردارییەکانــی ئازار و ئەشــکەنجەیان بدەن». پێش شۆڕشــی چواردەی گەلاوێــژی ١٩٥٨ی زاینــی پیــاوە قەڵاتییەکە و پیاوێکماڵی لەنــاو کۆنە خانووێکی گەڕەکی ســەعدوناوەی ناو هەولێر و ســەر کەندەکە بووە، لەو زیندانە دەکەونە یەک قاوش. ئەوان لەســەر یەک حزب و لەناو یەک شــانە، لەبەر دەرچوون و چالاکییەکی هاوبەش بەیەک ڕۆژ دەگیرێن. گیرانیان ئاســان بوو، دەگیرێن چونکە شوورەیی بوو، ئەندامێکیــان بگیرێــت، ئەوی تریان بڕوات و دەربازی بێت. یەکێک دەگیرا، ئەوی تر چالاکییەکــەی تــەواو دەکرد، بۆیە ئەویش دەگیرێت. ئەگەر نەگیرێت بۆ کوێ بڕوات، بە چی بڕوات!؟ شــار بچووکە، هاتوچۆ کەمە، ڕێبوار و ئۆتۆمبێل و ســوار و کەروبار و عارەبانچی لە دوورەوە دیار بوون!

یــان دوور نییــە ئەوانــە بەیەکــەوە گیرابن، پیاوێکــی قەڵاتی و کوڕێــک هەرگیز بە هــەردوو دەرگاکەی بەســەر قەڵاتیش نەکەوتبــوو. هەردووکیان بۆیــە و فلچەیان بۆ کوڕێک هەڵگرتووە پارچە دیوارێکی لووسی ناو بازاڕ بنووسێت. ئەوان خوێندەواریان

نەبووە، یەکێکیان هاوکار بووە، ئەوی تریان چاودێری سەرە کۆڵانەکەی کردوە!
ئەوان ماوەیەکی کەم، لەناو یەک زیندان و یەک قاوش و لەسەر یەک دۆز دەگیرێن.
ئەوان جیاوازی تەمەنیان زۆر بووە، بەڵام هزر و رەوشت و هەڵسوکەوت و زەوقی خواردن و گەمە و ئارەزووەکانی ژیان و ویستی رۆژانەیان نزیک بووە. ئەوانە زۆر یەکتریان خۆشدەویست، بە چاوی برا گەورە و مام و برازا هەڵسوکەوت دەکەن. پیاوە قەڵاتییەکە و کوڕەکەش هەرگیز بەسەر قەڵات نەکەوتووە، کەسی لەو قەڵاتە نەبوو! نەیدەزانی قەڵات سێ گەڕەکە. کۆڵانەکانی بۆنی گوڵاویان لێ دێت. خانووەکانی دوو نهۆمن، فێنکن. دیوارەکانی کەرپوچی سوورکراوە و قسڵ و گەچ و بەردی زۆری تێدایە. ئاغاکانیش، ئەوانەی پشتاوپشت لەسەر ئەو قەڵاتە ژیاون، مەڕمەڕ و جام و شووشەی رەنگاورەنگ و داری گرانبەهایان لە خانووەکانیان، لە دیوار و بەرهەیوان و حەوشە و ستارە و پایەکانی پێپلیقەکەی بەرەو دوو ژووری گەورەی بە هەیوان هەڵدەکشا، بەکارهێناوە.
لەو قەڵاتە سێبەر و بەرهەیوان و حەوشەکانی بوار بە رەشەرەیحان دەدەن، بۆن پیرۆز بکەن. شەوانەش روو و نیگا بە مانگ و ئەستێرەکان دەدەن، تا جوان و شیرین سەمای هەور بەئاسمانەوە ببینن. هەوریش بە سەماوە لە ئاسمان دەژیت و هەناسە دەدات! ئاسمانیش بە جوانی، ئەو سەمایە بەرین و شین و خاوێنەی شاخەکان لەسەر شان دەکەن. یان ئەوان هەورەکە حەیران و بەناز رادەگرن. قەڵات دڵ و چاو و هەناسە هەیە، وەک باڵندە و کۆتر و رەوە ریشوڵە، پەرۆشە لە بەرزایی بژیت و بخەوێت!
خەڵکی قەڵات باڵندەن، باڵندەی ماڵی و قەڵاتەکەش هێڵانەیەکی گەورەی نەرمە. دەزانن یان هەندێک لەوانە دەزانن، ئەو قەڵاتە بەر لەوانیش، زۆریش زوو هێڵانە و هەوار بووە. بەڵام ئەوەندە بەرز نەبووە، هەوار بە هەوار بەرز بووە!
ئەو دووانە، لە زیندانا هەموو کەرەستە و خواردن و جلوبەرگ و کارەکانیان بەشکردبوو. لەسەری خۆیان لەناو بوخچە بەستراو هەڵدەواسن، لەبن سەری خۆیان دادەنێن.
پیاوە بەتەمەنەکە دوایی دەبێتە باپیری کیژەکە و کوڕەکەش دەبێتە باوکی.

ئەودەمانەی ئەو بڕیارە دەدەن، ئەو زەماوەندە دەکرێت و هاوسەرگیرییەکە لەبەردەم قازییەکەی تەربوشێکی سووری خاوێنی لەسەر بووە دەکرێت و دەنووسرێت، مەرجی قەڵات و نیشـتەجێی بەرزایی و ئاسـمان و ئەستێرە نامینێت! کابرا لەودەمی کوڕەکە دەستی ماچ دەکات و دەبێتە زاوای، بزەیەک دەکات و سەربەرز بە هاوسەرگیرییەکە، دوو دانـە ئـاوی قەتیسـی شـیرین و زۆریش وردی شـادمانی، دەیـەوێ پەیدا بن و بـاش ببینرێـن، بـەڵام ئـەو زوو و لەنـاکاو پەرتـە بە دڵۆپـە نەرمەکـە دەکات. لە پەنجەرەکەیانـەوە سـەیرێکی گـەڕەک و خانووەکانی خـوارەوەی قەڵاتیش دەکات. لـەو نیگایـە تیرۆژییە بلەزەدا، دووکەڵی کابانی ناو ماڵ و حەوشـە و سـەربانەکان، جووڵـەی خەڵک و بازاڕەکەی بەیانییان گەرم و ئاوەدانەکە جوان دەبینێت.
لەو سـاتەوە بیر لەوە دەکاتەوە؛ خەڵکەکە وا یەک یەک لە خوارەوە خانوو دروسـت دەکـەن، خانووە کۆنەکانیان نـۆژەن ناکەنەوە و قەڵات چۆڵ دەکەن. خێزان لەدوای خێـزان بار دەکەن، دواکەسـیش کچەکەیەتی دەسـت بە خەنـە و بە بووکی دەچێتە خوارەوە.

***

لـە لاپەڕە ٢٥ی بەرگـی دووەمی هەولێر لە بەڵگەنامەکانی عوسـمانی دا هاتووە کە گەڕەکەکانی قەڵاتەکە وێران بووە و پێویستی بە نۆژەنکردنەوە هەیە، جبەخانەکانی باش نییە؛
لە هیچ بەڵگەیەکی تری عوسـمانییەکان، چ لە والی، یان لە سـوڵتانەوە نەهاتووە، ئەوانـە پارەیـان بـۆ نۆژەنکردنەوەی قەڵاتەکـە، کۆڵانەکانی تەرخانکـردوە، یان نا! نەنووسـراوە، بـاس نەکـراوە، بۆیەش دوور نییە لـە بەڵگەکانی تر، لـە زۆر نامەی تـردا باس لـەوە کراوە، ئەوانە، خەڵکی بەرپرس لەو قەڵاتـە و قەڵاتی کەرکووکیش خیانەتیان لە عوسـمانییەکان کردوە، دۆسـتایەتیان لەگەڵ نادر شای ئێرانی کردوە، یارمەتییانداوە، ئەسـپ و زەخیرەیان بۆ ناردوە!

***

باوکە، پاش تەواوکردنی ماسـتەرەکەم بەڕاسـتی دەکەومە ناو مێـژوو. توێژینەوەی مێژوویێکی وشکی نووسراو بە زمانێک، دەتوانم بڵێم مردوو، کەم بیستراو و لەبیرکراوە.

مێژوویێک بە دەستەخەتێک نووسراوە خوێندنەوەی ئاسان نییە. من شەو هەیە، کاتی تـــەواوی رۆژێکـــی دەوامەکە، بە رامـــان و بیرکردنەوەی زۆرەوە خەریکی وشـــەیەک، دەقێکی دەبم! راستە من کچم، لە سەردەمێکی دوور و جیاواز لە سەردەمەکە دەژیم. باوکە بەداخەوە تۆ نامبینیت، ئێســـتا پانتۆڵی جینزم لەبەرە. بە ئۆتۆمبێل هاتوچۆ دەکەم، دوا ئامێری پێشـــکەوتنی گەیاندن و خوێندنەوە و کۆپیکردنم لە دەوام و لە ماڵەوەش هەیە. زۆر مۆدێرن دەژیم، من و خوشـــک و برا و دایکیشـــم. ژیان گۆڕاوە، شـــار گەورە بووە، جلوبەرگ و خواردن و زمان و ئاکاریش زۆر گۆڕاوە، بەڵام تەنیا مـــن، لـــەو زانکۆیە، لەو دەزگایە گەورەیـــە مۆدێرنە ئارەزوومەندانە، بـــڕوا بکە لەبەر پـــارە و موچـــەم نییـــە، زۆرتر لەبـــەر خۆشەویســـتی و بەڵێنەکەی تـــۆ، دەگەڕێمەوە سەردەمێکی دووری زۆریش کۆن.
لەو ســـەردەمەدا من دەبمە هاوڕێ و هاودەســـتی خۆشنووسێکی عوسمانی. پیاوێکی چوارشانەی سمێڵ سوور، بڕوا ناکرێت چۆن ئەو پەنجە گەورانە دەتوانێت نووسینەکان بـــە حوبـــر و قامیش وا نەخشـــین بکات. مەندیـــل و کەواکەی بەریشـــی رەنگارەنگە، کـــەوا و ســـەڵتەکەی بـــەری لـــە جلەکانی مـــن زۆرتر رەنـــگ و نەخشـــی تێدایە. ئەو ریشـــێکی ماشـــوبرنجی جوانـــی بەرداوەتـــەوە. ئەو لە ژوورێـــک کار دەکات نیوەی بۆ خەوتن بەکاردەهێنێت. بەپێچەوانە من، لە ماڵەوە و لە ئۆفیســـەکەم ژووری تایبەتیم هەیـــە، لە پەنجەرەکانییەوە ئاســـۆی بەرینی رەنگینیش دەبینم، بۆ پشـــوودان، یەک نیـــگای دەرەوە بکـــەم، ئاســـوودە دەبم. ئـــەو لە وڵات و نەتەوە و دایـــک و باوکێکی دوورەوە هێنراوەتـــە ئەو کۆشـــک و ســـەرایە، رفێنراوە تا بۆیان بنووســـێت. هاتووە تا هونەرەکەی، رەنگ و فڵچە و قامیشـــەکانی بۆ نووســـین بەکاربهێنێت. حوبری لە هەندەرانەوە بۆ دێت، بازرگانێکی جوو لە ڤینیســـیاوە بۆی دەهێنێت.
منیش، خۆم ئارەزوومەندانە و بەدڵسۆزییەوە ئیش و نووسینەکانی ئەو دەخوێنمەوە و دەیاننووســـمەوە. ئیـــش دەکـــەم وەک ئـــەوەی لەگـــەڵ ئـــەو، لـــەو ژوورە خەریکی خوێندنـــەوەی مێـــژوو بم. بەر لەوەی فیلم و دۆکومێنتەکان بســـڕێنەوە، لەیاد بکرێن، ئیشـــیان لەناو دەکەم! باوکە لەبەر چاوی تۆ، لەبەر رۆشـــنایی داواکانی تۆ بەردەوام دەبم لە توێژینەوە لە مێژوو!

***

دایکە، ئەو دۆکومێنتانەی ئیشیان لەناو دەکەم بەر لە سەد و نۆهەد ساڵ، نووسراون و جوانیش هەڵگیراون. لەو دەقانە بۆمان روون دەبێتەوە، ئێمە ئەوە دەزانین، بەڵام لێرە زۆرتر بۆمان دەردەکەوێت، مێژوو تەنیا سەربردەی کۆشک و سوپا و سوڵتانەکان نییە.

لەودەمانە، لەو هەولێرە، والی ئەودەمانەی بەغدا ناوی موحەمەد نەجیب بووە، پەیامێکی ناردوە، کە بێوەژنێکی داماو، بەناوی شەمسە خاتوون، لەناو ماڵەکەی خۆی، خەریکی خەم و نازی منداڵەکانی بووە. دیارە ماڵیشی لە ماڵی براکەی دوور بووە، بەڵام لەسەر ئەوەی ناکۆکی و قسە و بۆچوونی جیاوازیان لەسەر خاوەندارێتی کۆنە خانووەکەیان، میراتەکەی باوکیان هەبووە، بۆیە لەگەڵ براکەی ئاخاوتن و دەمەقاڵێیان بووە. تا رۆژێکیان مەحمودی برای، گۆچانێکی پێ بووە، دیارە شوان یان گاوان بووە، یان تەمەن ماندووی کردوە، گۆچانی پێ بووە، دەچێتە سەر خوشکەکەی دەرگای لێ دەگرێت؛

ژنەکە، بەر لەوەی دەرگاکە بکاتەوە، هەر لەناو حەوشەکە سەری دادەپۆشێت، بە دیتنی براکەی دەگەشێتەوە، بەگەرمی بەخێرهاتنی دەکات! بە دیتنی گۆپاڵەکەی دەستی، بیر لە ترس و شەڕیش ناکاتەوە، بەڵام دڵی لەوە دەترسێت، براکەی لە کاری رۆژانەی ئازاری بەرکەوتبێت و قاچێکی بشەلێت، یان لەناو بازاڕدا کێشەیەکی هەبووبێت. ژنە داماوەکە نازانێت گۆپاڵەکەی بۆ ترساندنی ئەو هێناوە. ژنەکە فەرمووی چوونە ژوورەوە و ئاوی سارد و ماستاو و مانەوەی لێ دەکات. بەڵام ئەو توورەیە، سەرکەشە، بواری لێدوان و وەڵامدانەوەی نادات، یەکسەر رووبەڕوو و ئاکار ناشیرین پێی دەڵێت:

هاتووم موڵکەکەمان بەناوی خۆم دەکەم. وەرە لەکن قازی و پیاوانی تەکیە، لەکن دوو خزم و ناسیار بڵێ حەقم بەسەر ئەو خانووە نەماوە، نە خۆم و نە منداڵەکانم! موڵکەکە، خانووەکە، بە حەوشە و سەربان و دیوار و ئاوەکەی موڵکی برامە!

ژنەکە دووبارە فەرمووی چوونە ژوورەوەی لێ دەکات، بە رفتارێکی خوشکانە، بە روویەکی بەستەزمانانە، بێوەژنێکی داماو، هەر ئەوەی لێ دەوەشێتەوە. بەڵام ئەو

تووڕە و شـێتانە هەڕەشـەی لـێ دەکات و دەنگی بەرزتـر دەکات. ئەویش بەنەرمی دەڵێت:

ئەدی ئەمنیش کیژی ئەو پیاوە نەبووم، باوکی منیش نەبووە، خوشـکی تۆ نییم!

گۆپاڵـە ئەسـتوورەکە دوو سـێ جار بەتوندی لـە ئەرزەکە، لـە دیوارەکە دەدات و دەقیژێنێـت و لێی زۆرتر دەچێتە پێش؛

یەک قسـە دەکەم، وەرە دەسـت لەسەر ئەو موڵکە هەڵگرە، ئەگەرنا دەتکوژم!

پاش مشـتومڕ و دەنگ هەڵبڕین و هەڕەشـەی زۆر، کابرا لەبەر دەرگای ماڵەکەی بە هەموو هێز و تاقەتی، گۆپاڵە ئەسـتوورەکە لە سـەرە نەرم و زامدار و پەریشانەکەی خوشـکی دەدات، یەکسـەر ژنەکە لەبەر دەرگاکە پەلاواژ دەبێتەوە، دوو سێ قسە و ئاخ و هاوار کەفێکی سـپی لە دەم دەردەچێت و دەمرێت!

گۆپاڵـە بـە خوێنەکە، تووڕەیـی پیاوەکە، هاوار و دەنگە دەنگەکە، دوو هاوسـێ و ڕێبوارێکی سـەرە کۆڵانەکە و ژنێکی سـەر سێر و نان، دەزانن پیاوەکەی بە ڕەنگ و خوێن بە ژنەکە دەچێت، ژنەکەی بە گۆپاڵەکەی دەسـتی کوشت!

❊❊❊

دایکـە، دایـە گیان خەم لە ئێـش و ماندووبوونی من مەخۆ، تۆ وا هەسـت دەکەیت ماندووم، پەریشـانم، بێهودەم، وا نییە، بزانە چۆن بەردەوام خەریکی نووسـینەوەی ژیانی کەسـانی بەلەنگاز و لێقەوماوانیشـم، بەڵگەکان دەنووسمەوە و بڵاودەکەمەوە.

لـەو دەمانـە گۆپاڵەکە، پیاوەکە لەسـەر خوشـکەکە، دادگا سـزای براکەی دەدات، پاڕانەوە و سـوێند خواردن و تۆبەکردن دادی نادات، سـزای دەدەن، نووسـراوە، لە دۆکومێنتەکەدا نووسـراوە، پیاوەکە بە سـزای گرتن و دوورخستنەوە و سەوڵلێدانی ناو دەریا سزا دەدەن.

دایکە ببوورە باسی گۆپاڵ و کوشتن دەکەم، ئەو دەقەم لەبن دەست دەرچوو، تەواو بوو، وا خەریکم دەقێکی تر ئیشـی لەسەر دەکەم؛

❊❊❊

**١٠ ڕەجەب ١٣١٠**

**بۆ بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی ویلایەتی موسـڵ**

لــە مەکتەبی روشــدیەی هەولێر بــەو دواییە قوتابی کەمی کردوە گەیشــتووتە پازدە قوتابــی، ســەبارەت بە رەتکردنەوەی مامۆســتای پلە یەک، کە لەلایەن مامۆســتای پلە دوو نووســراوە هاتووە، ئەوەش پێویســتە بوترێت، لەژێر کارگێری مامۆســتای پلە دوو مەکتەبی روشــدیە بە شــێوەیەکی گونجاو شــایانی ئەوە نییە و سەنەدی لێ وەرناگیرێت، بۆیە رەتکردنەوەی مامۆســتای پلە یەک لە مەکتەبی ناوبراو باش نییە، بەپێــی وتەی جیاوازیکردن لەنێوانیان تەندروســتە و پێویســتە لێکۆڵینەوە لەســەر هۆکاری کەمبوونەوەی قوتابی بکرێت.

***

دایکــە لــەو ماوەیەی لەو دەقانە ئیشــم کردوە، یان بڵێم لەوەتــی لە زانکۆی جیهان دەقە تورکییەکان دەکەمە کوردی، دوور دەڕۆم. بابەتی کۆنم ورووژاندووە. شــوێنی زۆرم بەناوی کۆن بەسەرکردۆتەوە! نامە و داوای باب عالی تا داوای کەسێکی سادەم کەوتووتــە بەرچــاو! بە تەواوبوونی پرۆژەکە، ببوورە دایکە تووڕە مەبە و مەترســێ، بــڕوا ناکــەم وا زوو پرۆژەکە تــەواو بێت. دڵنیام تەواو نابێت. دەقە عوســمانییەکان ئەرشــیفە، بە هەموو مانا و پرنســیپ و دۆخەکە دەبێ زۆرتریش هەبێت، زۆری ماوە. منیش حەز دەکەم تەواو نەبن.

***

پەمــۆ، بــەردەوام خەریکی دۆکومێنتەکانم. رۆژانە دوو دەوام دەکەم. لە یەک رۆژدا، بەیــەک رۆژ بــە دوو زمان دەخوێنم و دەنووســم. لە کارکردنم، بــە دوو ئەبجەدیەت و نووســین، ئیــش دەکــەم. لــە وەرگێڕانا، کۆن دەبمــەوە و هــاوکات زۆریش نوێم! مانــدووم، بــە خوێندنــەوە و دۆزینەوە و ناســینەوەی وشــەیەک، رســتەیەک، ئیمزا و مۆرێــک پشــوویەکی درێژیش دەدەم. بەرگێک لەو ئەرشــیفە تــەواو دەکەم و چاپ دەبێت، یەکێکی ترم لە پێشە! ئەویش تەواو دەبێت، یەکێکی تر و ئیتر نازانم بەرگی کتێبەکان دەگاتە چەند بەرگ و بەش و شــار و ناوچەش.

لەســەر کورســییەک و بەرامبەر لاپتۆپێکی کۆنی خۆم. تۆش دەزانی کە بە موچەی مامۆستایەتی کڕاوە. لە هەولێرەوە لەناو کتێبخانەکەی زانکۆی جیهان دەچمە هەموو شارەکان. دووبارە دەق و بروسکە و فەرمان و فەتوا و بڕیار و سزا و هەواڵی دانان

و گواستنەوە و راوڕووت و یاخیبوونی عەشیرەتەکان، زۆر هەواڵ و ناو و شوێنی تر دەنووسمەوە.

لەسەر کورسییەکەم ــئەلحەق کورســییەکی نەرم و گەورە و شانازە- دەمەوێ دەقی بەڵگــەکان، بگێڕمــەوە ئــەو قــەزا و شــار و ویلایەتانــەی؛ بۆیان نووســراوە، بۆیان نێردراوە. یان بۆیان نووســراوە، بەڵام لەبەر ســەدان هۆکار نەگەیشتوون. دوور نییە پەیامەکان دەرچوون و جێبەجێ نەکراون. نووســراون و درۆ بوون. هەڕەشــە بوون، بەڵام نەرم و لەسەرخۆش بوون!

دۆکومێنتەکانی هەولێرم بە دوو بەرگ تەواو کرد. سەربردەی قائیمقامەکەی چەندان نیشــان و پاداشــت وەردەگرێــت، بــەڵام لەبــەر ئەوەی هاوشــانی هاوڵاتیــان بووە، شــەوێکیان پیاوێکــی داڵدە داوە، لەگــەڵ چەکدارەکانی دژەییەکان هەڕەشــەیان لە دەوڵەت کردوە، لێی تووڕە دەبن. چەندان تومەتی بۆ هەڵدەبەســتن، بەپەلە دووری دەخەنەوە. بڕیارەکە زوو دەردەچێت و دەگات، هەرگیز فەرمانی ســوڵتان و ویلایەت بەو خێراییە جێبەجێ نەکرابێت!

پەمــۆ، شــیرینتر لە ناوی خۆم. جوانتر لە چاو و ســادەتر لە دڵــم. جاروبار لەکوێ بەیەکەوە، تەنیا هەر بەیەکەوە قاوە دەخوێنەوە. کافتریای لە ســەر شــەقامە بەرینە زۆر قەڕەباڵغەکــە، بەڵام ناوەوەی ئارام و هێمنە، کە دوو پارچە گۆشــتی مریشــکی نۆگێت و پەتاتەی فینگەر و ساردەمەنییەک دەخۆینەوە. لەوێ نیوەڕۆیەکی درەنگ، زۆریــش درەنــگ، بەڵام بــۆ دەوامی ئێوارانم دوو ســەعاتم مابوو، لەبــەردەم دەفتەر و قەڵەمێــک «ببــوورە زمانمان فێر بــووە، ئەگەرنا راســتییەکەی لەبەر لاپتۆپێک» ســەربردەی پەریشانییم بۆ دۆکومێنتەکانی ناو ئەرشــیفی عوسمانی لەناو ئەستنبۆل گێڕایەوە. من قســەم دەکرد، ئەو دوو پیتی دەنووســی. من پێناســەیەکی وردی ناو شــارەکەم دەکرد. ئەو هیچ نەدەنووســی، بۆیە گوتی: خۆم دەچم و ســەردانی ئەو شوێنانە دەکەمەوە.

***

دکتــۆر نــەوزاد، تۆ لە نەشــتەرگەری دڵــەوە هاتوویتە ناو ئەرشــیف و بەڵگەنامەی زۆر کــۆن! دەتــەوێ وەک دەمارە وردەکانی لەشــی مرۆڤ، دەمارە ســەرەکییەکانی

نــاو دڵ و دەرەوەی دڵیــش، لەنــاو ئــەو ئەرشــیفەی کــە ژمارەیان دەیــان هەزارە، بەقــەد ژمارەی دەمــارە وردیلە باریکەکانە، ئیش لەناو کۆنــە دۆکومێنتەکان بکەین. مــن بیانخوێنمەوە، دڵــی بەڵگەکان بپشــکنم، دەمارە وردەکانی نووســینە کۆنەکان بناسمەوە! بزانم کامیان بەندە بە مێشک و هەناسەمان «هەولێر»، هەموویان بکەمە کوردی، ئیتر ببێتە کتێب و چاپ ببێت. ئەوانەم بۆ کردیت و تەواوم کرد و جوان و ناوازەش چاپ بوون، بەخۆڕایی و بێ بەرامبەر و شــادمانیش، بوون بە دیاری ناوازە و بۆنداریــش بــۆ دەزگا کەلتوور و فەرهەنگی و زانســتییەکانی هەموو کوردســتان و دەرەوەش، رەوانە دەکرێن. پاش بڵاوبوونەوەی دوو بەرگەکە، سەربردەی نووسین و ئیشــکردن و بابەتەکانی دوو بەرگەکە، دەبێت بە رۆمانێک و بڵاودەبێتەوە.

## ژیانم:

**شێرزاد هەینی**

**لە دایکبووی:** ١٩٥٥ هەولێر

**دەستپێک:** سەرەتای حەفتاکان

**ئاستی خوێندن:** خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە هەولێر تەواوکردووە.

**دەرچووی:** ئامۆژگای تەکنەلۆژیای (رووپێوی)، بەغداد.

**کارنامە:** خانەنشین

* هەنووکە لە وڵاتی سوید دەژی.

## بەرهەم و چاپکراوەکانم:

- لەیادی سەد ساڵەی شارەوانیدا، بە یارمەتی ئەمینداریێتی رۆشنبیری و لاوان لە چاپدراوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی عەلا، هەولێر، ١٩٨٥، قەبارە: (٢٤×١٧)سم، نرخ: (١٥٠٠)فلس.

- هەر لەشارەوانیدا، ١٩٩٤ (١٢)ژمارەی رۆژنامەی هەولێری دەرکردووە.

١. کەلاوە، ریپۆرتاژ، بۆ ئۆردوگاکانی دەڤەری هەولێر، چاپی یەکەم، ١٩٩١.

٢. دیوەخانی فلێن، رۆژانەو رێپۆرتاژ، چاپی یەکەم، ١٩٩٩.

٣. هەولێر.... تا دبلن، رێپۆرتاژ، چاپی یەکەمن، بڵاوکراوەکانی رۆژنامەی «ئاڵای ئازادی»، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٦، ٨٨ لاپەرە، چاپی دووەم، بڵاوکراوەکانی گۆڤاری هاڤیبوون/٢، زانکۆی ئازادی بەرلین، ٢٠٠٠.

٤. بەغداد.... بۆ هەولێر، رێپۆرتاژ، چاپی یەکەم، سوید و سلێمانی، ٢٠٠٠.

٥. مەملەکەتی فارگۆنەکان، ریپۆرتاژ و رۆژانە، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ٩٠ لاپەرە، چاپی دووەم، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکرنەوەی بەدرخان، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٦، ٢٥٤ لاپەرە، (٢٠×١٤)سم، نرخ: (٣٠٠٠)دینار.

٦. کاکە ئەبو ئیسماعیل، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠١.

٧. گابریل گارسیا مارکیز، بەسەرهاتی دەریاوانێکی خنکاو، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠١.

٨. ده ڕۆژەکەی هەولێرم، وتار و ڕیپۆرتاژ، هەولێر، ئوسـتراليا، ٢٠٠١.

٩. سـيڤييەکان ١، بڵاوكراوەكانی وەزارەتی ڕۆشـنبيری و لاوان، کۆمەڵە ديدارێکە، چاپی يەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشـنبيری، هەولێر، ٢٠٠٢ ـ ٢٠٠٩.

١٠. سـارد يان گەرم، چاپكراوەكانی دەزگای هەواڵ بۆ ڕۆژنامەوانی و ڕاگەياندن، چاپی يەکەم، ٢٠٠٥، ١٠٥ لاپەرە، قەبارە: (٢٢×١٠,٥)سم.

١١. نێلسـۆن ماندێلا، گەشـتە دوورەکەم لە پێناوی ئازاديدا، وەرگێران، بڵاوكراوەكانی دەزگای توێژينـەوە و بڵاوكردنـەوەی موكريانی، چاپی يەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ٢٨٦ لاپەرە.

١٢. مەملەکەتی کەلاوەکان، وتار و پێناسـەی بيناسـازی کوردييە، کتێبی گيرفان، بڵاوكراوەكانی وەزارەتی ڕۆشـنبيری، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشـنبيری، چاپی يەکەم، هەولێر، ٢٠٠٥، ٢٤ لاپەرە.

١٣. کۆريا: پێناسە و شارەزابوونـی وڵات و ميللەتی کۆريايە، وەرگێران، بڵاوكراوەكانـی دەزگای وەرگێران، چاپـی يـەکـەم، هـەولێر، ٢٠٠٧.

١٤. سـتيفان بروشـفيلد، پول ئا. ليڤين، هۆلۆکۆست: ئاگاداری نەوەکانتانی پێ بکەنەوە، وەرگێران لە عەرەبييەوە، بڵاوكراوەكانی سـەنتەری لێکۆڵينەوەی فيکری و ئەدەبی نما، چاپی يەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧.

١٥. دوو برێنسيسـی نازداری بێناز، ديانا و ماسـاکۆ، وەرگێران و ئامادەکردن، بڵاوكراوەكانی دەزگای چـاپ و بڵاوكردنـەوەی ئاراس، چاپی يەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ١٧٦ لاپەرە.

١٦. مارتن لۆسـەر: بەشـێکە لە کتێبی ناتوندوتيژی، وەرگێران و ئامادەکردن، بڵاوكراوەكانی سـەنتەری مەسەلە، چاپی يەکەم، هەولێر، ٢٠٠٨.

١٧. بيار بيون، بەرەو کۆشـکی ئاليزی، شـيراک و سارکۆزی و ڕوايال، وەرگێران لە عەرەبييەوە، بڵاوكراوەكانی وەزارەتی ڕۆشـنبيری_ بەڕێوەبەرايەتی خانەی وەرگێران، چاپی يەکەم، چاپخانەی ڕوون، سـلێمانی، ٢٠٠٨، ٢٤٣ لاپەرە.

١٨. ٩٥٥ دەقە لەگەڵ شـێرکۆ بێکەس، ديمانە، بڵاوكراوەكانی سـەنتەری لێکۆڵينەوەی فيکری و ئەدەبی نما، چاپی يەکەم، چاپخانەی تيشـک، هەولێر، ٢٠٠٨، ٣٣٣ لاپەرە، چاپی دووەم، بڵاوكراوەكانی جەمال عيرفان، سـلێمانی، ٢٠١٥.

١٩. دۆلار لە ئەمريكا، دوو بابەت لەسـەر پارە و سـەرمايە و بانک لە ئەمريكای نوێدا،

ئامادەکــردن و وەرگێران، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی ئــاراس، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٨، ٢٢٣ لاپەرە.
٢٠. کریســتۆفا دلوار و کریســتۆف دۆبوا، سێکس و پۆلەتیک: دیوێکە لە ژیانی دبلۆماتی فەرەنســای نوێ، وەرگێرانی لە عەرەبییەوە، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشــی سەردەم، چاپی یەکەم، ســلێمانی، ٢٠٠٨، ٢٢٤ لاپەرە.
٢١. مەجبور گێرانەوەی دوێنێی نزیکە!، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشــنبیری - بەرێوەبەرێتیی رۆژنامەنووســی و چاپ بڵاوکردنەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆمان، ســلێمانی، ٢٠٠٨، ١٢٨ لاپەرە، قەبارە: (٥ ,٢٠×٥ ,١٤)سم.
٢٢. تەها حوســێن، نابینایەکی بینا، ئامادەکردن، دۆســیەیەک لە گۆڤاری نما، هەولێر، ٢٠٠٨.
٢٣. ســارا پالین، ژنێکی دەرچوو لە نەریتەکان/ ژیانی هاوولاتییەکی ئەمریکاییە، وەرگێرانی لــە عەرەبییــەوە، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ٩٥ لاپەرە، قەبارە: (١٩×٥ ,١٢)ســم.
٢٤. کامیلیانە ئەنتفایفر دو فرانســوا نیکۆلۆ و منی لنی، من رۆژنامەنووســم، جاسووس نیم، وەرگێران لە عەرەبییەوە، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشــنبیری - بەرێوەبەرایەتی خانەی وەرگێران، چاپی یەکەم، چاپخانەی شــڤان، ســێمانی، ٢٠٠٩، ٢٧١ لاپەرە، قەبارە: (٢٠×١٤) سم، نرخ: (٣٠٠٠)دینار.
٢٥. ترێنــە خێراکــەی رۆژهەلات، وەرگێران، بڵاوکراوەکانی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانــی، چاپخانەی خانی (دهۆک)، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٩، ١٣٦ لاپەرە.
٢٦. کاکە ئەبو خەلیل، ســەربردە و ریپۆرتاژ و روداو، لە بڵاوکراوەکانی پاشــکۆی رەخنەی چاودێر، چاپی یەکەم، ســلێمانی، ٢٠٠٩، ٢١٦ لاپەرە، قەبارە: (٢٢×٥ ,١٤)ســم، نرخ: (٢٥٠٠) دینار.
٢٧. خوان ئایریاس، دانپێدانانەکانی حاجی پاولۆ: دیمانەیەکە لەگەڵ نووســەر و فەیلەســوفی بەرازیلــی پاولۆ کۆیلۆ، وەرگێــران لە عەرەبییەوە، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر، چاپی یەکــەم، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٩، ٢٧١ لاپەرە.
٢٨. ســەلام ئەلئیمام، مۆســاد، وەرگێران لە عەرەبییەوە، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٩، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٠، چاپی ســێیەم، بڵاوکراوەکانی کتێبخانــەی ئاوێــر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٣، ٢٨٨ لاپەرە، نرخ: (٥٠٠٠) دینار.

٢٩. ســەلام ئەلئیمام، حیکایەتەکانی غەدر و خوێن: بەشـێک لە گێڕانەوەی تیرۆرە گەورەکانی جیهان، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشــنبیری ـ بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ســلێمانی، ٢٠٠٩، ٢٨٦ لاپەرە.
٣٠. غەسان شــەربل، نهێنییەکانی سندووقە رەشەکە، ئامادەکردن، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشــنبیری و لاوان/بەڕێوەبەرایەتی گشــتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشــنبیری، هەولێر، ٢٠٠٩، ٩٤ لاپەرە.
٣١. دەســەڵات و نەخۆشــی، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری ـ خانەی وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ســلێمانی، ٢٠١٠.
٣٢. میخائیل دارمۆن و ئێیف دیریە، برادەرە جوانەکە ... رەشــیدە داتی، وەرگێڕانی لە عەرەبییــەوە، بڵاوکراوەکانــی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ١٣٦ لاپەرە.
٣٣. کارۆلین جیســوب، دەربازبوون، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنــەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ١٢٠ لاپەرە.
٣٤. سیاســەتی دڵ، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنــەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠.
٣٥. گەشــتێک بەرەو ئەورووپای نوێ، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەکانی دەزگای چــاپ و بڵاوکردنــەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠.
٣٦. ئەمال عەوێزە، مافیا: دەوڵەتی ســامان و خوێن، ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە، بڵاوکراوەکانــی دەزگای چــاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ١٥٥ لاپەرە، ، بایی: (٤٠٠٠) دینار، قەبارە: (١٩ × ١٢)ســم.
٣٧. جیهان لە دیدی کۆشــنێر، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە، بڵاوکراوەکانی ســەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، چاپـــی یــەکــەم، هەولێر، ٢٠١٠.
٣٨. ســیڤییەکان ٢، کۆمەڵێک راز و دیمانە، وەرگێڕان، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشــنبیری و لاوان، چاپی یەکەم، ٢٠١١.
٣٩. مهناس کراماشــاد، غاندی، چیرۆکی ئەزموونەکانم لەگەڵ حەقیقەتدا، وەرگێڕانی لە عەرەبییــەوە، بڵاوکراوەکانــی کتێبخانەی ئاوێر، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١. سێ جار چاپ بووە.
٤٠. بیۆگرافیای ئامووس ئۆز، چیرۆکێک لە خۆشەویســتی و تاریکی، رۆمان، وەرگێڕانی لە

عەرەبییــەوە، بڵاوکراوەکانــی کتێبخانەی ئاوێر، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١، ٨٠٠ لاپەرە.
٤١. کازیوە ژنەکەی ناو فێسـبوک، نۆڤلێت، بڵاوکراوەکانی سـەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، چاپـــی یـەکـەم، چاپخانــەی شــەهاب، هەولێر ٢٠١١.
٤٢. هینینگ مانکیل، سـەگەکان لە ڕێگا، ڕۆمان، وەرگێرانی لە عەرەبییەوە، بڵاوکراوەکانی کتێبخانــەی ئاوێــر، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١، ٣٠٤ لاپەرە، قەبارە: (١٧×٢٤)سم.
٤٣. ئەسـتێرە سـەرگەردانەکە، ڕۆمان، وەرگێرانی لە عەرەبییەوە، بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێــر، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١.
٤٤. عەلی بەدر، تووتنەوانەکە: بەسـەرهاتی جوولەکەیەکی عێراقییە، ڕۆمان، وەرگێرانی لە عەرەبییــەوە، بڵاوکراوەکانــی کتێبخانەی ئاوێر، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١، ٤١٥ لاپەرە، نرخ: (٦٠٠٠) دینار.
٤٥. عەلی بەدر، بابا سـارتەر، ڕۆمان، وەرگێرانی لە عەرەبییەوە، بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێــر، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٢، نرخ: (٦٠٠٠)دینار.
٤٦. بودوان بۆلایر و مارک ڕۆش، دەسـەڵاتی دوو ژن، وەرگێرانی لە عەرەبییەوە، بڵاوکراوەکانی دەزگای چــاپ و بڵاوکردنــەوەی بەدرخان، چاپی یەکەم، چاپخانەی هێڤی، هەولێر، ٢٠١٢، ١٧٢ لاپەرە، قەبارە: (١٦,٥×٢٣,٥)سم.
٤٧. غـاردان بــەدوای گورگەکاندا، ڕۆمان، وەرگێرانی لە عەرەبییەوە، بڵاوکراوەکانی ناوەندی ئاوێــر بــۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢، نرخ: (٦٠٠٠) دینار.
٤٨. چراکانی ئۆرشـەلیم، ڕۆمان، بڵاوکراوەکانی ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٣.
٤٩. شۆرشـەکانی جیهان، ئامادەکردن، بڵاوکراوەکانی ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بلاوکردنەوە، چاپــی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٣.
٥٠. هەولێر: ئیبن مسـتەوفی، ڕۆمان، بەرگی یەکەم، بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی گشـتی: یەکێتی نووسـەرانی کورد، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٢.
٥١. هەولێر: سـێتاقان، ڕۆمان، بەرگی دووەم، بڵاوکراوەکانی خانەی ئەربل و چاپخانەی شــەهاب، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣.

